# پەیوەندییە دەرەکییەکانی ئێران
## لە سەردەمی نادرشا ئەفشاری
## ١٧٣٦-١٧٤٧ ز

مستەفا محەمەد کەریم



## پێشکەشە بە :

دایك و باوكی ئـازیزم كـە هەمیشـە قـەرزاری رێنوێنیـەكانی ئەوانم.

هاوسەری خۆشەویست و ماندوونەناسم كەهەمیشـە خۆشـی و ناخۆشیەكانی ژیانی لەگەڵ دابەش كردووم

جگـەر گۆشـەكانم لـە كـاك رەوەنـد تـاكو تاقانـەی ماڵەكـەم (دەریا خان)

# پەیوەندییە دەرەکییەکانی ئێران لە سەردەمی نادرشا ئەفشاری ١٧٣٦ – ١٧٤٧ز

## لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە

مستەفا محەمەد کەریم

MUKIRYANI
ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION

هەولێر - ٢٠١٤




**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

● **پەیوەندییە دەرەکییەکانی ئێران لە سەردەمی نادرشا ئەفشاری (١٧٣٦ ـ ١٧٤٧ز)**

**لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە**

● مستەفا محەمەد کەریم

● نەخشەسازی ناوەوە: رێدار جەعفەر

● بەرگ: رێمان

● نرخ: (٤٠٠٠) دینار

● چاپی یەکەم : ٢٠١٤

● تیراژ: ٧٥٠ دانە

● چاپخانە: موکریانی (هەولێر)

● لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (١٣٣) ساڵی (٢٠١٤)ی پێ دراوە

زنجیرەی کتێب (٨٠٧)

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێرست

# سوپاس و پێزانین

- سوپاس و ستایش بۆ یەزدانی مەزن کەتوانای پێ بەخشیم کە ئەم توێژینەوە بەئەنجام بگەیەنم.
- بۆ بەرێز (پ.د. خەلیل عەلی مـوراد) کـە ئـەرکی سەرپەرشـتی لێکۆلینەوەکـەی گرتەئەستۆ و بەتێبینی و ڕێنماییە بەسوودەکانی توێژینەوەکەی سوودمەند کرد.
- سـوپاس و پێـزانینم بـۆ مامۆسـتای بـەرێزم (د. حەسـەن جـاف) کەلـەماوەی لێکۆلینەوەکەمدا سوودی زۆرم بینی لەکتێبخانە تایبەتیەکـەی بەتایبـەت چـەندین سەرچاوەی دەگمەنی تێدا بوو زۆرمەحاڵ بوو دەسکەوتنی ،بەلاّم ئامادەی دەربڕی ئەو سەرچاوانەم پێ بدات، تارادەیەك ئەو کیشەیەم لەکۆڵ بکاتەوە.
- بۆ سەرۆکایەتی بەشی مێژوو/ زانکـۆی سـەلاحەدین هـەموو ئـەو مامۆسـتایانەی بەهەواڵ پرسین بەسەریان کردمەوە.
- (م. فوئاد ڕەوند) جگە لەرێنماییە بەسوودەکانی دەرگای کتێبخانەکەی والاّ کـرد بۆم کەچەندین سەرچاوەی بەسوود و دەگمەن بـەزمانی فارسـی لـەو کتێبخانەیـە سـوودی لێ وەرگیراوە،کـەوەك گەنجینەیەکـە بـۆ ئەوانـەی لێکۆلینـەوە لەسـەر مێژووی ئێران دەکەن.
- فەرمانبەرانی کتێبخانەکانی (گشتی هەولێر،گشتی کـەرکوك ،ناوەنـدی زانکـۆی سەلاحەددین،ناوەندی زانکـۆی سـلێمانی، ناوەنـدی زانکـۆی موسـڵ، هـەروەها کتێبخانەی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەددین و کتێبخانـەی بەشـی مێـژوو ،هەروەها ناوەندی ڕۆشنبیری کلدانی بەتابیەت بەرێز (م. ئەفرام).

# پێشەکی

ئێران بە یەکێك لە دەوڵەتە تەوەرەییەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دێتە ئەژماردن، رۆڵی مەزنی هەبووە لە پێکهێنان و نەخشکردنی رواڵەتەکانی مێژووی نوێ و هاوچەرخی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەمەش هەر لە سەردەمی دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوی لە سەرەتای سەدەی شازدەی زاین هەتا سەردەمی کۆماری ئیسلامی ئێران، هەر بۆیە بەشێك لە تێگەیشتن لە مێژووی ئەم ناوچەیە لە رێگەی تۆژینەوەی بابەتییانە لە مێژووی نوێ و هاوچەرخی ئێران وەدی دێت، بە تایبەتیش پێوەندییەکانی ئێران و سیاسەتە دەرەکییەکانی بە درێژایی ئەم پێنج سەدەیە. هەمان خوێندنەوە و تێگەیشتن لە مێژووی نوێ و هاوچەرخی کورددا دەچەسپێت، کە بەشێوەیەکی راستەوخۆ لەژێر کاریگەریی سیاسەتەکانی ئێراندا بووە، کوردستانیش ناوچەیەك بووە لە ناوچەکانی چالاکی و کاریگەرییە سیاسی و سەربازییەکانی ئێران لە قۆناخگەلی گرینگی مێژووی نوێ و هاوچەرخ. هەر لەم سۆنگەشەوەیەش گرینگی ئەم تۆژینەوەیە سەرچاوەی گرتووە و تاوتوێی قۆناخێکی گرینگ و جێی مشتومڕ لە مێژووی نوێی ئێران دەکات، کە ئەویش ماوەی فەرمانڕەوایی نادر شای ئەفشارییە ١٧٣٦-١٧٤٧.

لە راستیدا تا ئەندازەیەکی زۆر لێتۆژ سەرکەوتوو بووە لە لە گرتنەبەری رێی گونجاو لە پسپۆرییەکەی خۆی لە مێژووی نوێی ئێراندا، ئەمەش بە سوودوەرگرتن لە فارسیزانییە باشەکەی، کە ئەوەش مەرجێکی سەرەکییە بۆ کەسێك کە بیەوێت پسپۆری لە مێژووی ئێراندا وەربگرێت. هەروەها لێتۆژ سەرکەوتوو بووە لە هەڵبژاردنی بابەتی ئەم تۆژینەوەیە، چونکە کەسایەتیی نادر شا و سەربوردەی ژیانی هەر لە شوانکارەیی و مەڕدارییەوە تا دەگاتە پادشایەتی بەسەر ئێراندا جێی بایەخپێدانە. بە هەمان شێوە وڵاتگیری و هەڵمەتە سەربازییەکانی لە هیندستان و ئەفغانستان و وڵاتی ئەودیو ڕووبار و عێراقی عوسمانی لە نێوان ساڵانی ١٧٣٦-١٧٤٣ وایان کرد ببێتە دوایەمین وڵاتگیر و فاتیحی گەورەی ئاسیایی، ئەمە سەرەڕای ئەوەی یەکەم شای ئێرانیانە، کە کۆشاوە بۆ دامەزراندنی هێزێکی دەریایی بەشکۆ لە کەنداودا و هەوڵدان بۆ قۆستنەوە و بەکارهێنانی ئەم هێزە بۆ وەدیهێنانی ئامانجی فرەوانخوازی سیاسی و سەپاندنی هەژموونی ئێران بەسەر کەنداودا، بۆیە سەیر نییە لەژێر رۆشنایی هەموو ئەمانەی باسکرا هەندێك کەس نازناوی (ناپلیۆنی فارسی) لێ بنێن، لەگەڵ ئەوەی کە کوژرانی نادر شا ساڵی ١٧٤٧ز دا نزیکەی چارەکە سەدەیەك پێش لەدایکبوونی ناپلیۆن پۆناپەرت دەکەوێت لە ساڵی ١٧٦٩.

بێگومان تەماحگیرییەکانی نادر شا سنووری نەبوو، کەسێکی لێزان و شارەزای سەربازی و خاوەن وزە و توانایەکی زۆر بوو، بەڵام لە هەمان کاتدا فەرمانڕەوایەکی ستەمکار و دڵڕەق بوو، پیاوی دەوڵەت نەبوو، کە بایەخ بە بونیادنانی داودەزگەکانی دەوڵەت و خۆشگوزەرانی نەتەوەکەی بدات، دەوڵەتێکی لاواز و لێك هەڵوەشاوەی لە سەفەوییەکانەوە بۆ مابۆوە، کاتێکیش ساڵی ١٧٤٧ کوژرا بارودۆخی وڵاتەکەی باشتر نەبوو لە سەروبەندیی کۆتاییەکانی دەوڵەتی سەفەویدا، راستە ئەو سەرکەوتوو بوو لە دامەزراندنی هێزێکی سەربازی زەبەلاح و ئێرانی کردە هێزێکی گرینگ لە ناوچەکەدا، بەڵام ئەمە لەبەر رۆشنایی بارودۆخی سەردەمی دەسەڵاتەکەیدا شتێکی ئەوتۆ نەبوو، لەبری ئەوەی ئەو هێز و شکۆیە بقۆزێتەوە بۆ بەرگرییکردن لە وڵاتەکەی کەچی کردیە ئامرازێك بۆ فرەوانخوازی و دوژمنکاری. بەردەوامبوونی ئەم هێزە زۆروزەوەندە سەربازییە و پرۆژە فرەوانخوازییەکانی پێویستی بە سامان و خەرجی زیاتر بوو، بارگرانی ئەمانەشی هەمووی خستبووە ئەستۆی ئێرانییەکان، کە هەر بە هۆی سەرکێشییەکانی نادر شاوە هەژار و لاوازتر ببوون، هەروەها توانا سەربازییەکانی ئێران بە ئاراستەیەکی هەڵەدا بردبوو، بۆیە جێی سەرسووڕمان نییە، کە سەردەمەکەی جووڵانەوە و **راپەڕینی** پتری بەخۆوە ببینێ، کە بە هێزی سەربازی و سیاسەتیی راگواستن هەوڵی سەرکوتکردنیانی دەدا، بێگومان کوردیش لەمەدا پشکی گەورەی بەرکەوتبوو.

ئەم تۆژینەوەی لە بەردەستماندایە وێنەیەکی ڕوونمان لەبارەی سەردەمی نادر شا و فتوحات و هەڵمەتە سەربازییەکانی پیشان دەدات، کە زۆرینەی ساڵانی دەسەڵاتدارییەکەی دەگرێتەخۆ. لێتۆژ تەقەلایەکی زۆری داوە لە بەدواداچوون بۆ وردەکارییەکانی بابەتەکەی، ئەویش بە پشت بەستن بە ژمارەیەکی زۆر سەرچاوە و ژێدەری فارسی، کوردی، عارەبی، ئینگلیزی و تورکی، بەرهەمی ئەم هەوڵ و تەقەلایەیەش ئەم تۆژینەوە زانستییە پوختەیە لەبەر ڕۆشنایی ئەو هەڵسەنگاندنەدا دەتوانین بڵێین تۆژینەوەیەکی گرینگە بۆ کتێبخانەی کوردی لە بواری مێژووی نوێی ئێراندا. هیوادرام لێتۆژ بەردەوام بێت لە تۆژینەوەکانی لە مێژووی نوێ و هاوچەرخی ئێراندا.. هیوای سەرکەوتن و پێشکەوتنی زیاتری بۆ دەخوازم..

**پ.د.خەلیل عەلی موراد**

**هەولێر ـ ئەیلوولی ٢٠١٣**

## پێشەکی و شیکردنەوەی سەرچاوەکان

سەردەمی فەرمانڕەوایی نادرشا بەیەکێك لەکاریگەرترین ماوە لەمێژووی ئێران دادەنرێت، بەهۆی ئەو کاریگەرییە قووڵ و گرینگە مەعنەوییەی کە لە هزری تاکی ئێرانیاندا بەجێی هێشتووە، بەتایبەتی دەرکەوتنی کەسایەتییەکی سەربازی وەك نادرشا لەسەر شانۆی سیاسیی وڵاتێکی پان و بەرین وەك گەورەترین ڕووداوی مێژوویی و سیاسیی ئەم وڵاتە هەژمار دەکرێت، بەپێی بیروبۆچوونی زۆرینەی هەرە زۆری گەورە لێتۆژانی ئێرانی و بیانی بەدیارکەوتنی ئەم کەسایەتییە و ڕۆڵی لەسەر ڕووداوە سیاسییەکانی ئێراندا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گۆڕانکارییانەی کە بەرۆکی ناوچەکەی گرتبوو، وەك لاوازبوونی زلهێزەکانی ناوچەکە (دەوڵەتی عوسمانی و ڕووسیای تەزاری)و دەرکەوتنی چەندین هێزی بچووك لە ناوچەکەدا، ئەمەش کاردانەوەی زۆری هەبووە لەسەر بارودۆخی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی لەئێراندا.

لەو هەلومەرجەدا ئێران پێویستیی بەکەسایەتییەك هەبوو، کە ئێران لەو پەرتەوازییە ڕزگار بکات، بۆ ئەم مەبەستە نادر شا دەبێتە کارەکتەری سەرەکیی بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە، چونکە بەدەرکەوتنی نادر شا دەبێتە سەرەتایەك بۆ دەستپێکی مێژووییەکی نویێ لە ئێران و کاریگەرییەکانی ئەو کەسایەتییە لە ڕووداوەکانی گۆڕەپانی سیاسی ئەو وڵاتەدا، کە دەبنە بەڵگە بۆ دیارخستنی جیێ پەنجەی نادر شا لە ڕووداو و پێشهاتەکان، کە لە داهاتوودا ئێران ڕووبەڕووی دەبێتەوە، بەواتایەکی دیکە ئێران لە وڵاتێکی پەرتەوازە و داگیرکراودا دەکاتە وڵاتێکی یەکگرتوو،لە بۆتەی یەك **سەرکردایەتیی**دا کۆی دەکاتەوە کە خودی نادرشا لەسەرووی هاوکێشەکەدا دەبێت.

هەڵبژاردنی ئەم بابەتە، لەلایەك دەگەڕێتەوە بۆ گرینگی ئەو ماوە مێژووییە، کە پڕە لە ڕووداوی جۆراو جۆر، کە پێویستە زۆر بە وردی بخرێتە بەرباس و لێکۆڵینەوەی بابەتییانە، لەلایەکی دیکەوە کەمی لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی لە زانکۆکانی کوردستان بەتایبەتی و زانکۆکانی عێراق بەگشتی، ئەگەر لێکۆڵینەوەش کرا بێت، تەنیا لایەنێکی بچووکی مێژووی ئەو ماوەیە وەرگیراوە، یاخود بەتێڕوانینێکی بێ لایەنی نەنووسراوە، بەهۆی خراپبوونی پێوەندیی سیاسی نێوان عێراق و ئێران لە ماوەی شەڕی هەشت ساڵەی نێوانیان، کەمتر گرینگی دراوە بەمێژووی ئێران، سەرەڕای ئەوەش ئارەزووەکانی لێتۆژ لەبارەی لێکۆڵینەوەی مێژووی ئێران هاندرێکی دیکە بوو بۆ هەڵبژاردنی ئەم بابەتە.

سەبارەت بە ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە کە بریتییە لە (پێوەندییە دەرەکییەکانی ئێران لە سەردەمی نادر شا ئەفشاری ١٧٣٦ — ١٧٤٧ هەرچەندە لەو ماوە مێژووییەدا ناوی ئێران بەوڵاتی فارس هاتووە، بەڵام لێتۆژ بۆ ئاسانکاریی بەکارهێنان وشەی ئێرانی داناوە، لەلایەکی دیکەوە لێتۆژ بۆ خۆ دوورگرتن لەلاگیری بەتایبەت لەسەر کێشەی ناوی کەنداو (کەنداوی فارسی یاخۆ کەنداوی عارەبی)، کە ئەم ناوە بەهۆی کێشەی سیاسیی لەنێوان ئێران و میرنشینە عارەبییەکان تاکو ئێستە مشتومڕی لەسەرە، بۆیە لێتۆژ هەوڵیداوە تەنیا وشەی کەنداو بەکار بهێنێت.

جێگەی ئاماژە پێکردنە بۆ لێکۆڵینەوەیەکی لەم جۆرەش لێتۆژ دووچاری چەندین کۆسپ و تەگەرەی زانستی دەبێتەوە، لەوانە بەدەستهێنانی سەرچاوەی تایبەت بەماوەی تۆژینەوەکە، بەتایبەت سەرچاوەکان بەزمانی فارسی، کە لە کتێبخانەکان زۆر بەکەمی دەست دەکەون، سەرەڕای ئەوەش ڕۆتینی کتێبخانەکانی عێراق، کە زۆرێك لە سەرچاوەکان بەهۆی کۆن بوونیان تووشی لەناوچوون بوونەتەوە، لەگەڵ بوونی دیاردەی لەنێو بردنی چەند لاپەڕەیەکی سەرچاوەیەك لەلایەن خوێنەر یاخود لێتۆژ دەبێتە هۆکارێك کە لێتۆژی دیکە بێبەش بێت لە زانیارییەکانی ئەو سەرچاوەیە، لەلایەکی دیکەوە سەرچاوەی گەشتیارە بیانییەکان تایبەت بەو ماوە مێژووییەی تۆژینەوەکە، کە بەزمانی جیاواز نووسراوەتەوە، بوونەتە ئاستەنگ بۆ لێتۆژ، چونکە ناکرێت لێتۆژ لە هەموو زمانەکان شارەزا بێت، لەگەڵ ئەوەش زۆر لە سەرچاوەکان بەکەمی وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی کوردی و عارەبی، بۆیە بەشێوەیەکی گشتیی هەوڵدراوە سوود لە وەرگێڕدراوە فارسییەکان وەربگیرێت بۆ پڕکردنەوەی

ئەو کۆسپ و تەگەرانە، بێگومان دەستەبەرکردنی ئەو سەرچاوانەش لە ڕێگەی هەوڵ و ماندووبونێکی زۆر بەدەست هاتووە.

لێکۆڵینەوەکە لە دەروازەیەك و چوار بەش و بەرئەنجام و پاشکۆ پێك هاتووە، سەبارەت بەدەروازەی تۆژینەوەکە تیشك خراوەتە سەر لاوازی و هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی سەفەوی و داگیرکردنی ئێران لەلایەن ئەفغانەکانەوە، کە تێیدا جەخت لەسەر هۆکارەکانی لاوازی و هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی سەفەوی کراوە، وەك پیادەکردنی سیاسەتیی ئاینزایی و کاردانەوەکانی لەسەر باردۆخی ناوەخۆ و دەرەکیی دەوڵەتی سەفەوی، لەگەڵ جەختکردنەوە لەسەر بەڕێوەبردنی دەوڵەت لەلایەن چەند (شا)یەکی لاواز، لەدوای مردنی شاعەباسی گەورە ١٥٨٧ -١٦٢٩ کە رۆڵی سەرەکییان گێڕاوە لە لاوازکردن و رووخاندنی دەوڵەتی سەفەوی بەهۆی دوورکەوتنەوەیان لەبەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت و کەوتنە دووی خۆشگوزارییەکانی ژیان، کە بەرئەنجامەکەی چەندین **راپەڕین** و یاخیبوون لە دەڤەر و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سەفەوییەکانی لێکەوتەوە، لەو بارودۆخەدا **راپەڕینە**کانی قەندەهار و هەرات تەشەنە دەکات و پرسی داگیرکاری ئەفغانەکان بۆ ئێران ١٧٢٢-١٧٢٩ دەست پێدەکات.

بەشی یەکەم تیشك دەخاتە سەر دەرکەوتنی نادرخان و بەرزبوونەوەی بۆ دەسەڵات، کە لە دوو تەوەر پێك دێت، تەوەری یەکەم دەرکەوتنی نادرخان لە شانۆی ڕووداوەکانی ئێران ١٧٢٧ – ١٧٢٩ بەتیشك خستنە سەر ژیاننامە و رەچەڵەکی نادر قوولی خان، دواتر رۆڵی لەململانێی نادر قوولی لەگەڵ مەلیك مەحمود سیستانی فەرمانڕەوای خۆراسان و هەنگاونانی بۆ زاڵبوونی بەسەر ڕکابەرەکانی لەو ماوەیەدا، پاشان چڕکردنەوەی هەوڵەکانی بۆ لەنێوبردنی هەموو **راپەڕین** و یاخبوونەکانی خۆراسان و هێرشکردنە سەر هەرات، پاشان هەنگاوی کۆتایی هێنان بەداگیرکاری ئەفغانەکان لە ئێران دەست پێدەکات، کە لە چەند زنجیرە شەڕێك نادرخان دەتوانێ کۆتایی بەفەرمانڕەوای ئەفغانەکان بهێنێت. تەوەری دووەم خستنە ڕووێکە لەبارەی هەنگاوەکانی تەهماسب قوولی بەرەو دەسەڵات ١٧٣٠ – ١٧٣٦، کە تێیدا باس لە بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ عوسمانییەکان و دوورخستنەوەی تەهماسب میرزا لە دەسەڵات ١٧٣٠ – ١٧٣٢ دەکات، سەرەتا تیشك خراوەتە سەر هەنگاوەکانی نادرخان لە دەرکردنی سوپای عوسمانی (جەنگی ئازادی) و سەرکوتکردنی **راپەڕین**ی ئەبدالییەکان لە

هەرات، هەروەها ناچارکردنی تەهماسب میرزا لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی، دوای شکستخواردنی لە جەنگی کردخان بەبەستنی پەیماننامەیەك، کە تێیدا ئێران دەسبەرداری زۆرینەی ناوچەکانی بوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی، بەستنی ئەو پەیماننامەیەش بووە هۆکارێك بۆ دوورخستنەوەی تەهماسب میرزا لە دەسەڵات و دانانی عەباس میرزا وەك (شا)ی نوێی ئێران لەلایەن تەهماسب قوولی، لەهەمانکاتدا ئەو ڕێککەوتننامەیە بەهانەیەکی باش بوو بۆ تەهماسب قوولی هێرش بکاتە سەر عێراق، کە بریتی بوو لەدوو لەشکرکێشی لە ماوەی ساڵانی ١٧٣٢-١٧٣٣، هەرچەندە لە هەڵمەتی یەکەم نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، بەڵام دوای سێ مانگ هەڵمەتی دووەمی دەست پێکرد توانی بەسەر توبال عوسمان پاشا سەربکەوێت و بەغدا گەمارۆ بدات، بەڵام بەهۆی هەڵگەڕانەوەی محەمەدخان بلوج پرۆژەکەی سەری نەگرت و لە ڕێگەی ڕێککەوتننامەیەك لەگەڵ ئەحمەد پاشا کۆتایی بەلەشکرکێشییەکەی هێناو گەڕایەوە ئێران. لەکۆتایی ئەم تەوەردا جەخت کراوەتەوە لەسەر دوا پەرەسەندنەکانی ساڵانی ١٧٣٣-١٧٣٦، سەرەتا سەرکوتکردنی هەڵگەڕانەوەکەی خان بلوج لەشیراز و لەیەك نێزیکبوونەوەی نادرخان لە ڕووسیای تەزاری و بەستنی هەردوو پەیماننامەی دەربەند و گەنجە، هەروەها دووبارە سەرهەڵدانەوەی جەنگ لەنێوان ئێران و عوسمانی و دەستگرتنی تەهماسب قوولی بەسەر تەفلیس و گەنجە و یەریڤان ناچارکردنی سوڵتانی عوسمانی بەڕازیبوون بەڕێککەوتننامەی بەغدا، پاشان گەڕانەوەی تەهماسب قوولی بۆ موغان و ئەنجامدانی کردەی تاجگوزاری بۆ نادرشا و دەستنیشانکردنی وەك شا ١٧٣٦-١٧٤٧ز.

لە بەشی دووەم لێتۆژ هەوڵ دەدات سیاسەتە فرەوانخوازییەکانی نادر شا بەرانبەر بە هیندستان و ئاسیای ناوەڕاست بخاتە ڕوو، کەپێك دێت لەسێ تەوەر: تەوەری یەکەم تیشك دەخاتە سەر گرینگترین ئەو هۆکارانەی بوونە پاڵنەر بۆ هێرشکردنە سەر هیندستان لەلایەن نادرشاوە، لەگەڵ دەرخستنی هەنگاوەکانی داگیرکردنی قەندەهار لەلایەن سوپای ئێران وەك هەنگاوێکی بەرایی بۆ داگیرکردنی دەلهی پایتەختی ئیمپراتۆری هیندی مەغۆلی.تەوەری دووەمیش دەرخستنێکە لەبارەی ڕەوت و پەرەسەندنەکانی ساڵی ١٧٣٩ و داگیرکردنی دەلهی، سەرەتا تیشك خراوەتە سەر هەڵمەتە فرەوانخوازییەکانی نادرشا لەقەندەهارەوە تاکو دەشتی کەرنال، کە تێیدا داگیرکردنی ناوچەکانی هیندی لە غزنە و ڕێرەوی خەیبەر و کابول و جەلال ئاباد و

پیشاوەر و لاهوور تا نێزیکبوونەوەی لە دەشتاییەکانی کەرنال خراوەتە بەر باسکردن و لێکۆڵینەوە، دواتر ڕوودانی جەنگی کەرنال **٢٤ی** شوباتی **١٧٣٩** کە بەجەنگی یەکلاکەرەوە بۆ نادرشا دادەنرێت، چونکە دوای ئەم جەنگە ئیمپراتۆرییەتی هیندستان ملکەچبوونی خۆی ڕاگەیاند و دەرگەی دەلهی لەبەردەم سوپای ئێران والا کرا.

لە تەوەری سێیەمدا جەخت کراوەتە سەر سەرهەڵدانی **ڕاپەڕین** دژ بەسوپای ئێران لەلایەن هیندییەکان و کاردانەوەی نادرشا لەر ڕاپەڕینەکە و بەرئەنجامەکانی کە ژمارەیەکی زۆری خەڵکی سڤیل بوونە قوربانی، بۆیە هیندییەکان ئەم ڕووداوە ناوزەد دەکەن بەڕەشەکوژی دەلهی، هەروەها تیشك خراوەتە سەر دوا هەنگاوەکانی نادرشا لە دەلهی و بەستنی پەیماننامەی شالیمار **٦ی** ئایاری **١٧٣٩** و ناچارکردنی ئیمپراتۆری هیندی بەدەسبەرداربوونی لەسەر چەند ناوچەیەکی گرینگی هیندستان بۆ ئێران، لەگەڵ جەختکردنەوە لەسەر دوا پەرەسەندنەکانی سوپای ئێران لە کاتی گەڕانەوەیان بەرەو کابول، لەك ۆتایی تەوەرکەشدا گرینگی دراوە بەهەڵمەتە فرەوانخوازییەکانی نادرشا بەئاراستەی سند و داگیرکردنی لارکانای پایتەخت و ناچارکردنیان بەملکەچبوون بۆ دەسەڵاتی ئێران. لە تەوەری چوارەم و کۆتایی بەشەکەشدا تیشك خراوەتە سەر هەڵمەتە فرەوانخوازییەکانی نادرشا لە ناوچەکانی ئاسیای ناوەڕاست کە دەست پێدەکات بەداگیرکردنی بوخارا و کۆتایی دێت بەداگیرکردنی خوارزم، لەگەڵ دیاریکردنی گرینگترین هۆکار بۆ ئەنجامدانی لەشکرکێشییەکانی بۆ سەر ئەو ناوچانە.

بەشی سێیەم پێوەندیی ئێران و عوسمانی لە سەردەمی فەرمانڕەوایی نادر شاە **١٧٣٦-١٧٤٧** دابەش دەبێتە سەر سێ تەوەر، سەبارەت بەتەوەری یەکەم تیشك دەخاتە سەر ڕێککەوتننامەی ئاشتی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی **١٧٣٦**، تێیدا باس لە هۆکارەکانی بەستنی ئەو ڕێککەوتننامەیە و داواکارییە ئاینییەکەی نادرشا و کاردانەوەی دەسەڵاتی عوسمانی بەرانبەر بەداواکارییەکان، پاشان خستنە ڕووی ئەنجامی کۆبوونەوەکان و گەیشتن بەڕێککەوتننامەی ئاشتی لە١٧ی تشرینی یەکەم **١٧٣٦**، بەڵام بەبێ ئەوەی ئەو دوو خاڵەی پێوەندیی بەپرسی ئاینزاییەوە هەبوو بکەوێتە ناو بازنەی گفتوگۆکان، بەمەش بەشێوەیەکی فەرمی جەنگ لەنێوان هەردوو دەوڵەت کۆتایی پێهات.

تەوەری دووەم دەرخستنێکە لەبارەی هەڵمەتی سێیەمی نادرشا بۆ سەر عێراق **١٧٤٣**، تێیدا جەخت کراوەتە سەر هۆکارەکانی لەشکرکێشییەکە و ڕەوت و

پەرەسەندنەکانی، بەتایبەت هەنگاوەکانی داگیرکردنی کەرکووك و هەولێرو ڕێکەوتنەکەی نادرشا لەگەڵ والی بەغدا ئەحمەد پاشا (هەرچەندە هەندێك لە مێژوونووسان پێیان وایە ڕێکەوتن نەبووە، بگرە فێڵێکی سیاسیی والی بەغدا بوو) بەمەبەستی دوورخستنەوەی بەغدا لە هەڵمەتەکانی نادرشا، هەروەها پرسی هەوڵەکانی نادرشا بۆ داگیرکردنی موسڵ و بەرگرییکردنی خەڵکەکەی لە شارەکە خراوەتە بەرباس و لێکۆڵینەوە، پاشان هەوڵەکانی ئێران بۆ داگیرکردنی شاری بەسرە و هەڵگەڕانەوەکانی محەمەد تەقی خان و چەندین یاخیبوونی دیکە بوونە هۆکار بۆ وازهێنان لە لەشکرکێشییەکەی و ئەنجامدانی ئاشتەوایی لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا.

لە تەوەری سێیەمدا جەختکراوەتە سەر قووڵبوونەوەی کێشە ئاینزاییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەت و ڕێککەوتننامەی کرند ١٧٤٣-١٧٤٦، سەرەتا باس لە هەوڵەکانی نادرشا کراوە بۆ بەستنی کۆنگرەی نەجەف بەمەبەستی نێزیککردنەوەی ئاینزاکان و نەهێشتنی دووبەرەکی و جیاکاریی لەناو جیهانی ئیسلامی، هەروەها کاردانەوەی دەوڵەتی عوسمانی لەبارەی ئەو کۆنگرەیە و بەرئەنجامەکانی، لەگەڵ دەرخستنی مەبەستەکانی نادرشا لەبەستنی ئەو کۆنگرەیە، لە کۆتایی ئەم تەوەرشدا جەختکراوەتە سەر گەڕانەوەی نادرشا بۆ ئێران و سەرکوتکردنی هەڵگەڕانەوەکەی محەمەد تەقی خان و بەرەنگاربوونەوەی یاخیبوونەوەکان لە داغستان بەتایبەت ئەوانەی بانگەشەی گەڕانەوەی دەسەڵاتی سەفەوییان دەکرد، لەو هەلومەرجەدا دەوڵەتی عوسمانی یارمەتی و پشتگیری ئەو کەسایەتییانەی دەکرد، بۆیە جارێکی دیکە جەنگ لەنێوانیان لە ناوچەی قارس ڕوویدا، لە کۆتایدا لە ئەیلوولی ١٧٤٦ز هەردوولا گەیشتنە چارەسەرێکی گونجاو بۆ کێشەکان و ڕێکەوتن لەنێوانیان ئەنجام درا، کە ناسراوە بەڕێککەوتننامەی کرند.

بەشی چوارەم برێتییە لە سیاسەتی نادرشا بەرانبەر بەناوچەی کەنداو، کە دابەشکراوەتە سەر سێ تەوەر، لە تەوەری یەکەم تیشك خراوەتە سەر هۆکارەکانی دامەزراندنی هێزی دەریایی و گرینگی پێدانی لەلایەن نادرشا، هەروەها دەرخستنی گرینگترین ئامادەکارییان بۆ چێکردنی ئەو هێزە، پاشان دیارکردنی هەوڵە بەراییەکانی هێزی دەریایی ئێران لە کەنداودا، بەتایبەت هەوڵدان بۆ داگیرکردنی بەسرە (١٧٣٥ز) و داگیرکردنی بەحرێن ١٧٣٦، لە تەوەری دووەمدا تیشك خراوەتە سەر چالاکی و هەڵمەتەکانی یەکەم و دووەمی سوپای ئێران بۆ عومان لە ماوەی سالانی ١٧٣٧-

١٧٣٩ لە سەرەتادا باس لە هۆکارەکانی چاوتێبڕینی نادرشا لە عومان کراوە، دواتر کورتەیەك لەبارەی کێشە و ململانێی هێزە عومانییەکان لەسەر دەسەڵات و ڕۆڵی سەیف کوڕی سوڵتان ١٧٢٨-١٧٤٣ لە ڕاکێشانی سوپای ئێران بۆ ناو عومان، هەروەها ڕەوت و پەرەسەندنەکانی لەشکرکێشیی سوپای ئێران بۆ عومان بەدوو قۆناخ خراوەتە بەر لێکۆڵینەوە، هەرچەندە لە هەردوو هەڵمەتەکەدا سوپای ئێران نەیتوانی مەرامە سیاسییەکانی نادرشا جێ بەجێ بکات، بەڵام توانرا سوپای ئێران لە جلفار جێگیر بکرێت و لە هەڵمەتی داهاتوودا سوودی لێ وەربگرێت.

هەرچی تەوەری سێیەمە دەرخستنێکە لەبارەی چالاکی و لەشکرکێشیی سێیەمی سوپای ئێران بۆ عومان ١٧٤٢-١٧٤٣ کە تێیدا باس لە بارودۆخی هێزی دەریایی ئێران دەکات، لە ماوەی ساڵانی ١٧٤٠-١٧٤١ بەتایبەت ئەو ماوەیەش برێتییە لە پاشەکشەکردنی شکۆی هێزی دەریایی ئێران لە کەنداودا و دووبارە هەڵکشانی دەسەڵاتی عارەبەکانە، بەڵام دووبەرەکی و ململانێی ناوەخۆیی جارێکی دیکە دەرفەت بۆ ئێران دەڕەخسێنێت شکۆی خۆی بەسەر کەنداودا بسەپێنێت، لەگەڵ ڕۆڵی هەر یەکە لە کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی و کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی هۆڵەندی لەو ماوەیەدا، هەروەها دیارکردنی هەنگاوەکانی لەشکرکێشیی سوپای ئێران بۆ سەر عومان پاش ئەوەی ئامادەکارییەکان بۆ ئەنجامدانی لەشکرکێشیی ڕێکخرا، هەرچەندە سوپای ئێران توانی زۆرینەی ناوچەکانی عومان بەمەسقەتیشەوە بگرێت، بەڵام بەرگرییەکانی سەحار بوونە ڕێگر لەبەردەم محەمەد تەقی خان بۆ جێبەجێکردنی پڕۆژە فرەوانخوازییەکەی ئێران، لەکۆتاییی تەوەرکەشدا جەخت کراوەتە سەر بەستنی پەیماننامەی ئاشتی ساڵی ١٧٤٣ لەنێوان محەمەد تەقی خان و فەرمانڕەوای سەحار و بەرئەنجامەکانی کە کۆتایی هێنا بەدەسەڵاتی ئێران لە عوماندا.

لێتۆژ پشتی بەستووە بەژمارەیەکی زۆری سەرچاوەی جۆراوجۆر بە چەندین زمانی جیاواز لە سەرووی هەمووشییانەوە:

### ١- بەڵگەنامە (بڵاوكراوەكان)

یەكێك لەگرینگترین بەڵگەنامە بڵاوكراوەكان برێتییە لە پەڕتووكی بەڵگەنامەیی (عەبدولحوسێن نوائی) لەژێر ناونیشانی (اسناد و مكاتبات سیاسی ایران) كە جەخت دەكاتە سەر ئەو فەرمان و نامە فەرمییانەی كە لە سەردەمی شا حوسێنی سەفەوی دەرچووە.

سەبارەت بەپەڕتووكی بەڵگەنامەیی Diplomacy in the Near and Middle East كە لەلایەن Hurewitz J.C. نووسراوە برێتییە لەدوو بەش، كە گرینگترین ئەو پەیماننامانە لەخۆدەگرێت لەنێوان وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و وڵاتانی دیكە لە ماوەی نێوان سەدەكانی ١٦ -٢٠ دا، لێتۆژ سوودی وەرگرتووە لە زۆرینەی زانیارییەكانی بەشی یەكەم كە پێوەستە بەو پەیماننامانەی كە بەستراون لەنێوان ساڵانی ١٥٣٥-١٩١٤.

لەلایەكی دیكەوە سەرچاوە بەڵگەنامەیەكەی سەرهەنگی دووەم محەمەد كەشمیری لەژێر ناونیشانی (چند سند تاریخی) كە لە گۆڤاری (بررسیهای تاریخی) ژمارە ٧٨ ی ساڵی ١٣٥٧هـ.ش لە تاران بڵاوكراوەتەوە، كە نێزیكەی ١٨ فەرمان و نامەی فەرمی لە سەردەمی شا سەفی ١٦١١-١٦٤٢ تاكو شاهرخ میرزا ١٧٣٤-١٧٩٦لەخۆ دەگرێت، بەڵام تەنیا سوود لەو بەڵگەنامانە وەرگیراوە، كە پێوەندیی بەچوارچێوەی لێكۆڵینەوەكە هەیە، ئەویش برێتییە لە فەرمان و نامەكانی نادرشا پێوەست بە گورجستان، هەروەها ئەم بەڵگەنامانە لە بنەڕەتدا لەلایەن كۆمیسیۆنی باڵای بەڵگەنامەكان و مێژووی قەفقاز كۆكراوەتەوە، پاشان لەلایەن A.D.Berge لە ساڵی ١٩٦٦ لە تفلیس چاپ كراوە.

هەروەها لێتۆژ پشتی بەستووە بەبەڵگەنامەیەكی مێژوویی لەژێر ناونیشانی (**فەتح**لی خان قاجار از شاە **سلطان** حسین تا نادرشاە) كە لەلایەن مهری ئیدریسی ئەریمی لە (فصلنامەی گنجینەی اسناد) بە ژمارەی ١٥ی ساڵی ١٣٧٢هـ.ش لە تاران بڵاوكراوەتەوە، كە زیاتر جەخت دەكاتە سەر ژیانی فەتح عەلی خان قاجار و بارودۆخی ئێران لە سەردەمی داگیركاری ئەفغانەكان، لەگەڵ دیاریكردنی بارودۆخی خۆراسان لە سەردەمی مەحمود سیستانی و دەركەوتنی نادرخان و ململانێیەكانی لەگەڵ مەحمود سیستانی، ئەوەی گرینگە بۆ لێكۆڵینەوەو سوودی لێ وەرگیراوە برێتییە لە بەڵگەنامەیەك كە ئاماژە بەفەرمانێكی تەهماسب میرزا دەكات، كە بەڕوونی

ناپاکییەکەی فەتح عەلی خان قاجار دەخاتە ڕوو، لەدەست تێکەڵکردنی لەگەڵ مەحمود سیستانی دژ بەتەهماسب میرزا.

## ٢-پەڕتووك

### أ- پەڕتووکە فارسی و وەرگێڕدراوە فارسییەکان

هەردوو سەرچاوەکەی میرزا مەهدی خان ئەسترئابادی ١٧٦١ یاخود ١٧٦٦ کۆچی دوایی کردووە، کە برێتین لە (جهانگشای نادری) و (درە نادرە تاریخ عصر نادر شاه) بەگرینگترین دوو سەرچاوەی سەرەکیی فارسی هەژمار دەکرێن، لەکۆی گشتیی لێکۆڵینەوەکە سوودی لێ وەرگیراوە، چونکە خودان ئەم دوو سەرچاوەیە نووسەری دیوانی نادرشا بووە، واتە بەتێڕوانینی ئێرانیان نووسراوە بەهۆی نێزیکبوونی لە دەسەڵات، هەروەها زۆر بە وردی ژیان و تەواوی ڕووداوەکانی تایبەت بەنادرشا دەخاتە ڕوو هەر لە سەرەتای ژیانی و جەنگی ئازادی لەگەڵ (ئەفغانەکان و دەوڵەتی عوسمانی و ڕووسیای تەزاری) هەروەها ئاماژەی تەواو دەداتە ئەو ڕووداوانەی کە خودی نادرشا بەشداری تێدا کردوون، بەڵام هیچ کەم وکورتییەکی ئەم کەسایەتییە باس ناکات، تەنیا ئەوە نەبێت لە دوای کوژرانی نادرشا لەکۆتایی بەشی (جهانگشا) باس لەیاخیبوون و **ڕاپەڕینە**کانی ناو ئێران دەکات، لێ بەشێوەیەکی زۆر کورت.

لەلایەکی دیکەوە لێتۆژ پشتی بەستووە بە (عالم ارای نادری) کە لەلایەن محەمەد **کاوم** مروی وەزیر مرو نووسراوە، گرینگی ئەو سەرچاوەیەش لەوەدایە کە نووسەر هاودەمی نادرشا بووە، زۆر بە وردی پرژاوەتە سەر دیاریکردنی ڕووداوەکان، هەروەها نووسینەکان بەزمانێکی سادە نووسراون، کە هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەمڕۆدا نییە، بەوەش جیا دەکرێتەوە لە میرزا مەهدی خان کە لە دەرخستنی ڕووداوەکان بێ لایەنی پێوە دیارە.

هەروەها پشت بەستراوە بە چەندین سەرچاوەی دیکە لەوانە (زندگی پرماجرای نادر شا) محەمەد حوسێن میمندی نژاد، کەپانتایەکی فرەوانی لێکۆڵینەوەکەی داگیر کردووە، ئەم سەرچاوە قەبارە گەورەیە نێزیکەی ١٠٠٠ لاپەڕە دەبێت، زۆر بەپوختی چۆتە ناواخنی ڕووداوەکان، لەگەڵ پشت بەستنی بەسەرچاوەکانی هاوچەرخی ڕووداوەکان، بەڵام باسکردنی بابەتەکان بەشێوەیەکی دووردرێژ، وایکردووە لە شیکردنەوەی ڕووداوەکان دووربکەوێتەوە.

سەبارەت بەسەرچاوەکەی نورەڵا لارودی لەژێر ناونیشانی (زندگانی نادرشا پسری شمشیر)، کە سەرچاوەیەکی قەبارە گەورەیە، لە ١٠ بەش پێك دێت لە باسکردنی ڕووداوەکان پتر پشتی بەستووە بە (جهانگشای نادری)، هەروەها (عقاب کلات)، کە لەلایەن بهرام ئەفراسیابی نووسراوە، لەگەڵ دەرخستنی زانیارییەکان شیکردنەوە و شرۆڤەی بۆ ڕووداوە مێژووییەکان کردووە، هەرچی سەرچاوەکەی ڕەزا شەعبانی ـ یە لەژێر ناویشانی (تاریخ اجتماعی ایران) لە دوو بەش پێك دێت، بەڵام پتر گرینگی دراوە بەبەشی یەکەم، چونکە پێوەندیی بەناوەرۆکی لێکۆڵینەوەکەوە هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا دانەری ئەو سەرچاوەیە کەسێکی ئەکادیمییە زۆر لە بابەتەکانی کە لێکۆڵینەوەی لەبارەوە دەکات لەسەر ماوەی فەرمانڕەوای ئەفشارییە، جگە لەمەش زۆر باباتییانە دەچێتە ناوەرۆکی ڕووداوە مێژووییەکان، هەر بۆیەش بەشێوەیەکی گشتیی لێتۆژ گرینگی بەم سەرچاوانەی سەرەوە داوە و ڕووبەرێکی فرەوانی لێکۆڵینەوەکەیان گرتۆتەوە.

لەلایەکی دیکەوە وەرگێڕدراوە فارسییەکان لەلایەن لێتۆژ گرینگی زۆریان پێ دراوە، بەتایبەت هەردوو سەرچاوەکەی لورانس لۆکهارت (**انقراض** سلسله صفویه) و (نادرشاه) هەرچەندە سەرچاوەی یەکەم کەمتر بەکارهاتووە، بەڵام سەرچاوەی دووەم لە زۆرینەی بەشەکانی لێکۆڵینەوەکە ئاماژەی پێکراوە، ئەم سەرچاوەیە لە بنچینەدا برێتییە لە تێزێکی دکتۆرا، کە خاوەنەکەی وەریگرتووە، هەروەها لە سەرچاوەکەیدا پشتی بەستووە بەژمارەیەکی زۆر لەسەرچاوەی فارسی و بیانی و عارەبی لەگەڵ بەڵگەنامەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی، زیاتر زانیارییەکانی گردبوونەتەوە لەبارەی هەڵمەتەکانی نادرشا بۆ قەندەهار و هیند ستان و ناوچەکانی ئاسیای ناوەڕاست، کەمتر دەپرژێتە سەر هەڵمەتەکانی نادرشا بۆ سەر عێراق.

لێتۆژ پشتی بەستووە بەسەرچاوەکەی سەرجان ملکم لەژێر ناونیشانی (تاریخ ایران)، کە لە دوو بەش پێك دێت، بەڵام پتر گرینگی دراوە بەبەشی دووەم، کە پێوەستە بەبابەتی لێکۆڵینەوەکە، دانەر زانیارییەکانی خۆی لە میرزا مەهدی ئەستڕئابادی و هانوی و فریزەر و چەندین سەرچاوەی پێش خۆی وەرگرتووە، ناوبراو لە ساڵی ١٧٩٩ لەسەر ڕاسپاردەی دەسەڵاتدارانی بەریتانیا بەیاوەری شاندێك دەگاتە ئێران بەمەبەستی دامەزراندنی پێوەندیی دووقۆڵی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئێران. هەروەها لێتۆژ گرینگی داوە بەسەرچاوەی (دولت نادر شاه افشار) م.ر. ارنوا - ك.ز.اشرافیان، کە

بەتێڕوانینێکی ڕووسی نووسراوە، باس لە بابەتی وردی ماوەی فەرمانڕەوای نادرشا دەکات، کە لەزۆرینەی سەرچاوە فارسییەکان ئاماژەی پێ نەکراوە، هەروەها سەرچاوەکەی ریاز ئەلئیسلام لەژێر ناونیشانی (تاريخ **روابط** ايران و هند) زۆر بابەتییانە چۆتە ناواخنی ڕووداوەکان و راستییە مێژووییەکانی شرۆڤە کردووە، بێ ئەوەی لایەنگری پێوە دیاربێت، بۆ ئەم مەبەستە لە هەڵمەتەکانی نادرشا بۆ هیندستان بەشێوەیەکی فرەوان لێتۆژ پشتی پێ بەستووە، جگە لەو سەرچاوانەی کە ئاماژەیان پێدراوە بەدەیان سەرچاوەی فارسی و وەرگێڕدراوەکان بەگوێرەی شوێن و کاتی خۆی بەکار هاتوون و لێکۆڵینەوەکەیان دەوڵەمەند کردووە.

## ب- کتێبە عارەبی و وەرگێڕدراوە عارەبییەکان

لێکۆڵینەوەکە پشتی بەستووە بەکۆمەڵێك سەرچاوەی گرینگ، کە هەر یەکەیان بایەخی تایبەتی خۆی هەیە بۆ دەوڵەمەندکردنی تۆژینەوەکە، لە سەرووی هەموویانەوە سەرچاوەکەی (شێخ رەسول کەرکووکلی) لەژێر ناونیشانی (**دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد الزوراء**)، کە لە بنچینەدا تورکییە، بەڵام لەلایەن (**موسا کازم** نەورس)ــەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عارەبی، کە تێیدا تیشك دەخاتە سەر ڕووداوەکانی عێراق لەنێوان ساڵانی ١٧١٩-١٨٢١، کە تێیدا هەڵمەتەکانی نادرشا بۆ سەر عێراق باس دەکات و لەگەڵ دیاریکردنی ئەو نامانەی کە لەلایەن نادرشا و دەوڵەتی عوسمانی ئاڵوگۆڕکراوە، بەڵام ئەوەی ئاشکرایە نووسینەکانی تێڕوانینی دەوڵەتی عوسمانی بەسەردا زاڵە، چونکە لەلایەن داود پاشای والی بەغدا ١٨١٦-١٨٣١ فەرمانی پێکراوە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە.

لەلایەکی دیکەوە سەرچاوەکەی یاسین بن خەیروڵا ئەلخەتیب ئەلعومەری ١١٥٧-١١٥٨ك-١٧٤٤ز- ١٢٣٢ك-١٨١٧ز) بەناونیشانی (**منيية الادباء في تاريخ الموصل الحدباء**)، لە سەرچاوە گرینگ و پڕ بایەخەکانە لەبەر بوونی زانیاریی زۆر لەسەر عێراق لە سەدەی هەژدەیەمدا بەتایبەتی شاری موسڵ، چونکە خەڵکی شارەکەیە، هەروەها بەوردی باسی رەوت و پەرەسەندنەکانی لەشکرکێشیی سێیەمی نادرشا ١٧٤٣بۆ سەر شاری موسڵ کردووە، کە لە کەسانی هاودەمی ڕووداوەکەی وەرگرتووە، لەگەڵ ئەوەشدا سەرچاوەکە بەتێڕوانینی عوسمانی نووسراوە دژ بەئێران و نادرشا. سەبارەت

بەسەرچاوەکەی محەمەد بەهجە ئەلئەسەری (**ذرائع العصبيات العنصرية في اثار الحروب وحملات نادرشاه على العراق في رواية شاهد عيان**) لەبنچینەدا ئەم سەرچاوەیە بەشی دووەمی سەرچاوەی (**حديقة الزوراء في سيرة الوزراء**) دانەرەکەی (عبدالرحمن بن عبدالله السويدى البغدادى ١٧٢٢ -١٧٨٦ز)، گرینگییەکەی بۆ لێکۆڵینەوەکە دەگەڕێتەوە سەر دەرخستنی ئەو زانیارییە وردانەی کە لە کاتی هەڵمەتەکەی نادرشا بۆ سەر بەغدا و بەرئەنجامی گەمارۆدانەکە لەسەر شاری بەغدا، چونکە نووسەر خۆی هاودەمی ڕووداوەکە بووە، جگە لەمەش سەرچاوەی **عبدالله بن الحسين السويدي العباسي (١١٠٤ك/١٦٩١ز- ١١٧٤ك/١٧٦٠ز)، (مؤتمر النجف)** کەلەلایەن **محب الدين الخطيب** شرۆڤەی بۆ کراوە، گرینگی تایبەتی هەیە، چونکە نووسەر خۆی سەرۆکی کۆنگرە بووە و وردەکارییەکانی کۆنگرەکەی خستۆتە ڕوو.

هەروەها لێتۆژ گرینگی داوە بەسەرچاوە سەرەکییەکەی نورالدين عبدالله بن حميد السالمی (١٢٨٣، ١٢٨٤ك-١٣٣٢ك)، (**تحفة الاعيان بسيرة اهل عمان**) بەتایبەت بەشی دووەم، کە بەتێڕوانینی عومانی نووسراوە لەبارەی لەشکرکێشییەکەی سوپای ئێران بۆ سەر عومان، جگە لەمەش چەندین سەرچاوەی ناسەرەکیی لەکۆی گشتیی لێکۆڵینەوەکە سوودیان لێ وەرگیراوە لەوانە عباس العزاوى (تاريخ العراق بين احتلالين) بەشی پێنجەمی کە نووسەر لەسەرچاوەکەیدا سوودی وەرگرتووە لە سەرچاوە سەرەکییەکانی عوسمانی و فارسی و عارەبی، هەروەها سەرچاوەکەی عبدالامير محمد امين (**القوى البحرية في الخليج العربى في القرن الثامن عشر**) گرینگی تایبەتی هەیە لەبارەی هێزی دەریایی ئێران و هەڵمەتەکانی بۆ سەر عومان، سەرەڕای ئەوەش نووسەر سوودی لە سەرچاوە ڕەسەنەکانی عومانی و سەرچاوە بیانییەکان و بەڵگەنامەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی وەرگرتووە.

هەر یەکە لەسەرچاوەکانی **علاء** نورس، **العراق في العهد العثمانى دراسة في العلاقات السياسية** ١٧٠٠ -١٨٠٠ و على شاكر على، **تاريخ العراق فى العهد العثمانى ١٦٣٨ – ١٧٥٠** لە لێکۆڵینەوەکەدا گرینگی تایبەتییان پێدراوە بەهۆی دیاریکردنی پێوەندییەکانی دەوڵەتی عوسمانی و ئێران لەسەردەمی نادرشادا، کە بەشێوەیەکی بابەتییانە شرۆڤەیان کردووە، بەتایبەت هەڵمەتەکانی نادرشا بۆ سەر عێراق، لەلایەکی دیکەوە لێتۆژ پشتی بەستووە بەسەرچاوەکەی (د.حسن جاف) لەژێر

ناونیشانی (الوجیز فی تاریخ ایران) بەتایبەت بەشی سێیەمی، کە پێوەندیی بەبابەتی لێکۆڵینەوەکە هەیە، گرینگ لەو سەرچاوەیە بەکارهێنانی ژمارەیەکی زۆر سەرچاوەی فارسییە، جگە لەمەش شرۆڤەی بابەتەکەی کردووە لە ڕێگەی سەرچاوە دژ بەیەکەکان و دەرهێنانی ئەنجامێکی یەکلاکەرەوە بۆ ڕووداوە مێژووییەکان.

سەبارەت بەوەرگێڕدراوە عارەبییەکان، سەرچاوەکەی **ب.ج. سلوت، عرب الخليج في ضوء مصادر شركة الهند الشرقية الهولندية ١٦٠٢ - ١٧٨٤،** کە باس لە لەشکرکێشییەکەی سوپای ئێران دەکات بۆ سەر عومان، بەڵام لە ڕوانگەی بەڵگەنامەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی هۆڵەندی، هەروەها سەرچاوەکەی ستیفن هیمسلی لونکریك، **اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث،** لە سەرچاوە گرینگەکان هەژماردەکرێت، چونکە لەنووسینەکەی بێ لایەنی پێوە دیارە، کە لە ڕووداوە مێژووییەکانی ٤٠٠ ساڵی عێراقی کۆڵیوەتەوە، ئەوەی پێوەندیی بەبابەتی لێکۆڵینەوەکە هەیە تیشك دەخاتە سەر بارودۆخی ئێران لە سەردەمی داگیرکاری ئەفغانەکان و دەرکەوتنی نادرخان و ئەنجامدانی جەنگی ئازادی دژ بەدەوڵەتی عوسمانی، هەروەها هەڵمەتەکانی بۆ سەر عێراق و دیاریکردنی پێوەندییەکانی هەردوو لا لە سەردەمی نادرشا دا.

## ج- کتێبە بیانییەکان.

سەبارەت بەسەرچاوە ڕۆژئاواییەکان، لێتۆژ پشتی بەستووە بەسەرچاوەکەی Krusinski **1675-1756** لەژێر ناونیشانی The History of the Late Revolutions of Persia**،** هەردوو بەشی یەکەم و دووەم، خاوەنی سەرچاوەکە بەرەگەز پۆڵەندییە و لەنێوان ساڵانی ١٧٠٧-١٧٢٥ لە ئێران کاری موژدەدەری ئاینی مەسیحی کردووە، لەکاتی داگیرکاری ئەفغانەکان لەئەسفەهان بووە، بەچاوی خۆی ناخۆشییەکانی ڕۆژانی گەمارۆدانی ئەسفەهانی لەلایەن ئەفغانەکان بینیوە، هەروەها هاودەمی نادرشا بووە، زۆرینەی ڕووداوەکانی باس کردووە، تەنانەت هەڵمەتی دووەمی نادرشا بۆ عێراق، بەڵام ساڵانی دوای ئەم ڕووداوە باس ناکات.

سەرچاوەی The Revolutions of Persia کە لەلایەن Jonas Hanway 1712 -1786 نووسراوە گرینگی و بایەخی تایبەتی هەیە، بۆیە لێتۆژ نابێت ڕەچاوی ئەم سەرچاوەیە

نەکات، ناوبراو لە ساڵی ١٧٤٣ لەلایەن کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی ڕەوانەی ئێران کرا، بەمەبەستی چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی، کە کۆمپانیاکە لە ئێران تووشی دەبۆوە، گرینگی سەرچاوەکە لەوەدایە کە ریزبەندی ساڵی کردووە بۆ ڕووداوەکان، ئەمەش ئاسانکارییەکە بۆ لێتۆژ، هەروەها لە کاتی نووسینی سەرچاوەکەی هەوڵێداوە سەرەتای ژیانی نادرشا بخاتە ڕوو، هەروەها گرینگییەکی زۆر دەدات بەهەڵمەتەکەی نادرشا بۆ هیندستان، بەپشت بەستنی بەبەڵگەنامەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی، بۆیە لێتۆژ لەپانتایەکی فرەوانی لێکۆڵینەوەکە ئاماژەی بەو سەرچاوەیە کردووە.

هەروەها سەرچاوەکەی Samuel Barrett Miles ناسراو بە Colonel S. B. Miles بەناونیشانی The CONTRIES AND TRIBES OF THE PERSIAN GULF، چەندین زانیاری دەگمەنی تێدایە دەرباری عومان، بەڵام لەرووی ڕێکخستنی ڕووداوەکان ووردبینی کەمی تێدا بەدی دەکرێت، ناوبراو لەساڵی ١٨٣٨ز لەدایك بووە، لەساڵی ١٨٥٧ز چۆتە ناو ڕیزی سوپای بەریتانیا لەهیند، دواتر لەساڵی ١٨٧٤ز وەك بریکاری سیاسی و کونسوڵی بەریتانیا لەمەسقەت دەست بەکاربووە، لەساڵی ١٨٧٩ز دەبێتە کونسوڵی گشتی لەبەغدا، لە ٢١ی ئابی ساڵی ١٩١٤ز کۆچی دوایی کردووە.

سەبارەت بەسەرچاوەی A HISTORY OF PERSIA کە لەلایەن P. SYKES **1867-1945** نووسراوە، گرینگی تایبەتی خۆی هەیە، چونکە تیشك دەخاتە سەر زۆر لە ڕووداوەکان، کە ئێران ڕووبەڕووی بۆتەوە لەسەردەمی نوێ، ئەوەی پێوەندیی بەلێکۆڵینەوەکە هەیە تەنیا سوود لە بەشی دووەمی ئەو سەرچاوەیە وەرگیراوە.

## د . کتێبە کوردی و وەرگێڕدراوە کوردییەکان:

سەبارەت بەسەرچاوە کوردییەکان جەخت کراوەتەوە لەسەر سەرچاوەکەی حوسێن حوزنی موکریانی (کورد و نادرشا لە خاکی ئێران)دا نووسەر پشتی بەستووە بەسەرچاوەکانی میرزا مەهدی خان ئەستەرئابادی، هەروەها زۆر بەسادەیی ڕووداوە مێژووییەکانی ئەو سەردەمەی خستۆتە ڕوو.

هەرچی سەرچاوە وەرگێڕدراوەکەی کەلیمولڵا تەوەحودی (کۆچی مێژووی کورد بۆ خۆراسان) بەشی یەکەمی، کە تێدا لەبارەی سەرەتاکانی ئەفشار و دەرکەوتنی نادرخان و ململانێیەکانی لەگەڵ مەحمود سیتانی دەخاتە ڕوو، هەروەها نیشاندانی ڕۆڵی کوردان لە

بەرزبوونەوەی نادرخان و رۆڵیان لە جەنگەکانی دژ بەدەوڵەتی عوسمانی و یارمەتی و کۆمەکییەکانیان لەکاتی لەشکرکێشییەکەی نادرشا بۆ قەندەهار و هیندستان و ناوچەکانی ئاسیای ناوەڕاست، لەبەر گرینگی سەرچاوەکە و زانیارییە وردەکانی لێتۆژ لە زۆر شوێنی لێکۆڵینەوەکە پشتی پێ بەستووە.

بەشێوەیەکی گشتیی سەرەڕای ئەو سەرچاوانەی کە باس کران، لێکۆڵینەوەکە پشتی بەستووە بەچەندین سەرچاوەی دیکە کە بەزمانە جیاوازەکانی (فارسی، عارەبی، ئینگلیزی، کوردی و تورکی) نووسراون، بەڵام بەپێویست نەزانرا لێرەدا بخرێنە روو، بۆیە دەکرێت بگەڕێنەوە سەری لە لیستی سەرچاوەکان لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەدا.

لێکۆڵینەوەیەکی لەم جۆرەش هەرچەندە هەوڵێکی زانستییە و هەوڵی زۆری بۆ دراوە، بەڵام بێ کەم وکورتی نابێت، هیوادارم بە چاوێکی زانستییانە وەربگیرێت و تێبینییەکان ببنە هۆی دەوڵەمەندکردنی زانستییانەی لێکۆڵینەوەکە.

**نووسەر**

**هەولێر ٢٠١٣/١/١**

# دەروازە

## لاوازی و هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی سەفەوی و داگیرکردنی ئێران لەلایەن ئەفغانەکان

## ١٦٢٩ — ١٧٢٦

سەردەمی سەفەوی بەیەکێك لە گرینگترین و کاریگەرترین ماوە لە مێژووی ئێران دادەنرێت، کە کاریگەریی قووڵ و گرینگی لە فەرهەنگی ئێراندا بەجێ هێشتووە، بەتایبەتی دەرکەوتنی دەوڵەتێکی شیعەگەرایی لەسەر شانۆی سیاسیی وڵاتێکی پان و بەرین و وەك گەورەترین ڕووداوی مێژوویی و سیاسیی ئەم وڵاتە و بەشێکی گرینگی مێژووی ڕۆژهەڵات، کەتێیدا سەفەوییەکان لەسەر دەستی ئیسماعیل کوڕی حەیدەر ١٥٠١ – ١٥٢٤ کە ناسراوە بەشا ئیسماعیل توانیان دەوڵەتی سەفەوی لە ئێرانی ئاڵۆز و پەشۆکاوی ئەو کاتەدا دابمەزرێنن،کە بەسێ قۆناخی جیاواز تێپەڕیوە،سەرەتا بونیادنانی دەوڵەت لەسەر دەستی شا ئیسماعیل و جێگیرکردنی پایەکانی، دواتر گەیشتنی بەبەرزترین ئاستی دەسەڵات و هێز لەناوچەکەدا، بەتایبەت لە سەردەمی شا عەباسی گەورە ١٥٨٧ – ١٦٢٩، پاشان وردە وردە لاوازی و لێکترازان بەرۆکی دەوڵەتەکەی گرتەوە بەتایبەت لەدوای مردنی شا عەباس و هاتنی چەند شاهێکی لاواز کە مۆمی داگیرساوی ئەو دەوڵەتەیان بەرەو خامۆشی برد.

شیاوی باسکردنە ئیسماعیل کوڕی حەیدەر لە ساڵی ١٥٠١ پاش دانیشتنی لەسەر تەختی شاهانە لە تەورێز هەڵسا بەجێگیرکردنی پایەکانی دەسەڵاتی کە برێتی بوون لەچوار پایەی پتەو، لەوانە (سەید)اتی کە شا ئیسماعیل بەگوێرەی شەجەرەیەك کە یەکێك لە باپیرانی سازی کردبوو خۆی بەنەوەی ئیمام عەلی کوڕی ئەبوتالیب (ر.خ) دادەنا، هەروەها (تەریقەت)، کە تێیدا شا ئیسماعیل خۆی بە ڕێبەری تەواوی تەریقەتی سەفەوی دادەنا، لە ڕاستیشدا نەوەی شێخ سەفیەدینی ئەردەبیلی دامەزرێنەری ئەم تەریقەتە بوون[1].

لەلایەکی دیکەوە (تەشەیوع)، کە بەیەکێك لەپایە گرینگەکانی بناخەی بونیادنانی دەوڵەتی سەفەوی دادەنرێت، لەو بارەیەوە شا ئیسماعیل لەیەکەم ڕۆژی ڕاگەیاندنی شاهانەی خۆیەوە ئاینزایی شیعەی کردە ئاینزایی فەرمی دەوڵەتەکەی، هەروەها بەتوندی جەختی دەکردە سەر ناوهێنانی دوازدە ئیمامەکە لە وتاری هەینیدا و نەفرەتی سێ خەلیفەکەی راشدین (ئەبوبەکری سەدیق، عومەری کوڕی خەتاب و عوسمانی کوڕی عەفان) بکرێت،بۆ ئەم مەبەستە شا ئیسماعیل بانگەشەی ئەوەی دەکرد، کە ئەو ڕاسپاردراوە بۆ ئەم کارە و

---

(١) نەوشیروان مستەفا ئەمین، کورد و عەجەم، چاپی سێیەم، چاپخانەی روون، سلێمانی، ٢٠٠٧ز، ، ل١٦.

خودا و ئیمامەکان لەگەڵیدان و لە هیچ کەسێکیش ناترسێت، ئەگەر هاتوو لەناو خەڵکدا وشەی نارەزایی هەبێت، ئەوە ئامادەیە شمشێرەکەی لە کالان هەڵبکێشێت و نەیەڵێت یەکێکیان بە زیندوویی بمێنێتەوە[٢]، هەروەها هەوڵدانی بەردەوامی شا ئیسماعیل بۆ ئەوەی سرووشتی (ئێرانیبوون) بسەپێنێت، بەشێوەیەك سەرزەمینی دێرینی ئێران لە دەوڵەتێکی یەکگرتوودا یەك بخات و فەرهەنگی ئێرانیانی زیندوو بکاتەوە[٣].

دەکرێت بڵێین گەورەترین کێشە کە بەدرێژایی تەمەنی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی سەفەوی باڵی بەسەر بارودۆخی سیاسی ئێران کێشابوو، بریتی بوو لە هەوڵدانی بەردەوامی (شا)یەکان بۆ ئەوەی سرووشتی ئێرانیبوون، بکەنە سرووشتێکی نەتەوایەتی، ئەمەش بەرئەنجامێکی خراپی لەسەر بارودۆخی سیاسی دەوڵەتی ئێران چێکردووە، چونکە ئەم بابەتە زۆر کاریگەریی نەرێنی هەبووە لەسەر هزر و رەفتاری تاکی ئێرانیان، سەرەڕای ئەوەش لەسەر خودی (شا)یەکانیش بەگران وەستاوە، بەهۆی بوونی چەندین نەتەوەی جیاواز لەناو وڵاتێکی پان وبەرینی وەك ئێران.

لەلایەکی دیکەوە بۆجێبەجێکردنی ئەو ئامانجە دوو سیاسەت پیادە کراوە، لەوانە زەبروزەنگی هێز بۆ سەرکوتکردنی نارەزاییەکان[٤]، هەروەها بەکارهێنانی ئاین بەتایبەتی سەپاندنی ئاینزایی شیعەگەرایی دوازدە ئیمامی[٥] بەسەر تەواوی خەڵکی ئێران وەك ئاینی فەرمی وڵات، کە لەلایەن شا ئیسماعیلی یەکەم ١٥٠١ – ١٥٢٤ زۆر بەتوندی جەختی

---

(٢) حسن کریم جاف، الوجیز فی تأریخ ایران، **الجزء الثالث، الطبعة الثانیة، مطبعة مؤسسة ئاراس، أربیل، ٢٠٠٨م،** ص١٨.

(٣) نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦ .

(٤) مستەفا محەمەد، تەریقەتی سەفەوی و هەنگاونان بەرەو بنیادنانی دەوڵەت، گۆڤاری مێژوو، ژمارە (٢١)، ساڵی شەشەم، چاپخانەی رۆژهەڵات، هەولێر، زستانی ٢٠١٢ز، ل ل ٣٠٠-٣٠١.

(٥) پێیانوایە تەنها دوازدە ئیمامی پارێزراو( معصوم) مەرجی ئەوەیان تێدایە، کە ببنە پێشەوای موسڵمانان، ئەوانیش عەلی کوڕی ئەبوتالیب، حەسەنی کوڕی عەلی، حوسێن کوڕی عەلی، عەلی زەینەلعابدین کوڕی حوسێن، محەمەد باقر کوڕی عەلی، جەعفەر سادق کوڕی محەمەد، موسا کازم کوڕی جەعفەر، عەلی رەزا کوڕی موسا، محەمەد جەواد کوڕی عەلی، عەلی هادی کوڕی محەمەد، حەسەن عەسکەری کوڕی عەلی، محەمەد مەهدی کوڕی حەسەن( ر. خ). بۆ زیاتر زانیاریی بڕوانە: عبدالقادر صالح، العقائد و الادیان، دار المعرفه، بیروت، ٢٠٠٦م، ص١٠.

لەسەر کراوەتەوە[٦]، بێگومان ئەم سیاسەتە ئێرانی تووشی بارودۆخێکی نالەبار کرد، چ لە رووی ناوەخۆوە، کە هەردەم ئاژاوە و ناسەقامگیری باڵی بەسەردا کێشابوو، لەلایەکی دیکەوە هەموو کاتێك ئێران ئامانج بووە بۆ هەڕەشەکانی وڵاتانی دراوسێ بەتایبەت ئوزبەکەکان[٧] لە رۆژهەڵات و دەوڵەتی عوسمانی لە رۆژئاوادا.

## أ – لاوازی و هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی سەفەوی ١٦٢٩–١٧٢٠ز

دیارە ئەم تاج و تەختە (دەوڵەتی سەفەوی) بەرهەمی هەوڵ و ماندووبوونی ژمارەیەك لە کەسایەتییە دەروێش و سۆفیەکانی تەریقەتی سەفەوی بووە، کە لە سەردەمی شێخ سەفیەدینی ئەردەبیلی ١٢٥٢ – ١٣٣٤ز سەردەستە و دامەزرێنەری رێبازی دەروێشی سەفەوی هەر لە سەرەتای سەدەی چواردەەمەوە دەستی بەبڵاوکردنەوەی رێبازە تایبەتییەکەی خۆی کردووە[٨].

بەگوێرەی خاوەن پەرتووکی (عالم ارای عباسی) رەگورِیشە و بنەچەی سەفەوییەکان لە رێگەی رێکخستنی شەجەرەیەك دەیانگەڕێنێتەوە بۆ سەر ئیمام عەلی (ر. خ) لەگەڵ

(٦) علی شریعتی، تشیع علوی و تشیع صفوی، نشر ازادی، تهران، ١٣٦٣هـ.ش، ص٥٨.

(٧) ئۆزبەکەکان رەگەزیان دەگەڕێتەوە بۆ ئۆزبەك خانی نۆیەمین فەرمانڕەوایی بنەماڵەی جوحی، ناسراو بە شێخ سەید ئەتای تورکستانی ٧١١هـ -٧٣٩هـ، نیشتمانی کۆنیان بەرزاییەکانی تورانە، لە سەرەتادا برێتیبوون لە کۆمەڵێك هۆزی کۆچەر لە ناوچەکانی باکوری رۆژهەڵاتی فارس، دواتر محەمەد خان دوای ئەوەی توانی بەشێکی زۆر لە هۆزە کۆچەرییە ئوزبەکەکان لەژێر فەرمانڕەوایی خۆی لە ساڵی ١٥٠٠ز یەکبخات و خۆی بکاتە پادشای سەمەرقەند، کە ئێستە شارێکی ئوزبەکستانە، هەروەها دەسەڵاتی بەسەر ناوچەیەکی پان و بەرینی لێوارەکانی رووباری جیحۆن تا دەگەیشتە سنووری ئێران لەسەر هێڵی تەریبی سمنان لە خۆراسان و لە رۆژئاواش تاکو بەدەخشان لە خواروش تا دەگاتە ناوچەکانی کاخیندار، بەمەش دەرگەکانی رۆژهەڵاتی ئێران لەژێر دەسەڵاتی خانی ئوزبەك دابوو. بۆ زانیاریی زیاتر بگەڕێوە بۆ: و. بارتلد، تاریخ الترك فی اسیا **الوسطی**، ترجمە: احمد السعید سلیمان، الهیئە المصریە العامە للکتاب، القاهرە، ١٩٩٦م، ص ص١٩٧ -١٩٨ "محەمەد سوهێل تەقوش، مێژووی دەوڵەتی سەفەوی، وەرگێڕانی: شاخەوان محەمەد، چاپی یەکەم، چاپخانەی رۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٠ز، ل ٧٥ .

(٨) لارنس لاکهارت، **انقراض** سلسله صفویه، ترجمه: اسماعیل دولتشاهی، چاپ دوم، انتشارات علمی و فرهنگی، تهران، ١٣٨٠هـ.ش، ص١٥.

ئەوەشدا زۆر لە مێژوونووسان کۆکن، لەو باوەڕەدان کە شێخ سەفییەدین سونە ئاینزا بووە و لەسەر ئاینزای شافیعی، هیچ کاتێك لەسەر ئاینزای شیعە نەبووە[٩]، دواتر یەکێك لە نەوەکانی بەناوی خواجە عەلی ١٣٩٢ – ١٤٢٨ز دێتە سەر ئاینزای شیعەگەری دوازدە ئیمامی[١٠]، هەرچەندە لە سەرەتادا تەریقەتی سەفەوی مۆرکێکی ئاینی هەبووە، دوور بوو لە سیاسەت، بەڵام لە سەردەمی شێخ جونەید ١٤٤٧ – ١٤٥٠ موریدەکانی خۆی ڕێکخست لە شێوەی یەکەی سەربازی[١١]، هەروەها هەوڵیدا پەرە بەئاینزایی شیعەگەرایی بدات، دواتر ئەو تەریقەتە سۆفیگەریەی کە مۆرکێکی ئاینی پێوە دیاربوو گۆڕانکاریی بەسەردا هێنا و بوو بەهێزێکی ناوەخۆیی بەهێز کە بتوانێت هەر کارێك ئەنجام بدات لەکاتی گونجاندنی بارودۆخدا[١٢].

شێخ حەیدەر ١٤٦٠-١٤٨٨ز بەردەوام دەبێت لەسەر ڕێچکەی شێخ جونەیدی باوکی بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستە، بۆیە هەڵسا بەچەکدارکردنی هەوادار و لایەنگرانی، ماڵەکەی ببووە ئەنباری چەك، بۆیە مێژوونوسێکی ئێرانی بەسەر سوورمانەوە دەنووسێت (لەئەردەبیل لەجێی قەڵەم ڕینگەی شمشێرەکان دەبیستران)[١٣].بەشێوەیەك میر یەعقوب کوڕی ئۆزۆن حەسەن سوڵتانی (ئاق قۆینلو)[١٤] مەترسی و دڵەڕاوکێی

---

(٩) امیر محمود خواندامیر، تاریخ شاه اسماعیل و شاه **طهماسب** صفوی، تصحیح و تحشیه: محمد علی جراحی، چاپ اول، نشر گسترده، تهران، ١٣٧٥ هـ.ش، ص ١٠ "

Peter Jackson and Lauraence Lockhart ( eds.), The Cambridge History of Iran, Volume.6, The Timurid and Safavid Periods( U.K – Cambridge University, Press-1986), P. 125.

(١٠) عەلی حەرب، پەرەسەندنی مێژووی جووڵانەوەی سەفەویی لە ئێران، وەرگێڕانی: بەرزانی مەلا تەها، چاپی یەکەم، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠١٢ز، ل٢٠٩.

(١١) عبدالحسين زرين كوب، روزگاران تاريخ ايران از اغاز **تا سقوط سلطنت** پهلوی، چاپ پنجم، انتشارات سخن، تهران، ١٣٨٣ هـ.ش، ص ص٦٥٨-٦٥٩.

(١٢) **نويسنده نامعلوم**، عالم ارای **شاه** اسماعيل، با **مقدمه و تصحيح و تعليق: اصغر منتظر** صاحب، چاپ دوم، انتشارات علمی فرهنگی، تهران، ١٣٨٤ هـ.ش، ص٢٤.

(١٣) والتر هينتس، تشكيل دولت ملی ايران، ترجمه: كيكاووس جهانداری، چاپ سوم ، انتشاراتی خوارزمی، تهران، ١٣٦٢ هـ.ش، ص ٩٠.

(١٤) ناوێکی لێکدراوە لە سێ بەش پێکهاتووە، ( ئاق) بەواتای سپی دێت، ( قۆین، قۆیون) بەواتای مەڕ دێت، هەمووی بەسەر یەکەوە واتای مەڕی سپی دەگەیەنێ، لەگەڵ داگیرکردنی ئەنادۆڵ لەلایەن مەغۆلەکان،

زۆری لەسەر بووە بەرامبەر بەفرەوان بوونی دەسەڵاتی شێخ حەیدەر لە ناوچەکەدا، بۆیە کەوتە یارمەتی دانی شێروانشا فەرمانڕەوایی (شێروان) و لە ئاکامدا لە سنووری تەبەرستان لە دامێنی چیاکانی ئەلبورز، لە تەمووزی ساڵی١٤٨٨ز،پ اش شەڕێکی خوێناوی شێخ حەیدەر کوژرا [١٥].

سوڵتان یەعقوب پاش ئەم ڕووداوە فەرمانیدا هەر سێ منداڵەکەی شێخ حەیدەر (عەلی، ئیسماعیل، ئیبراهیم) و مارتای دایکیان ببرێتە لای مەنسوور بەگی فەرمانڕەوای شیراز لە هەرێمی فارس تا لە ئەستەخر زیندانی بکرێن[١٦]، لەو هەلومەرجەدا موریدەکانی سەفەوی، هەڵسان بەدانانی عەلی لە جێگەی باوکی وەك ڕێبەر و سوڵتانیان[١٧].

دوای مردنی سوڵتان یەعقوب لە ساڵی ١٤٩٠ز، دووبەرەکی و ململانێ باڵی کێشا بەسەر بنەماڵەی ئاق قوینلو لە ئاکامدا (بایسەنقەر) توانی دەست بەسەر دەسەڵاتدا بگرێت لە ساڵ١٤٩٠ز، بەڵام ڕووبەڕووبوونەوەی بەرامبەر ئامۆزاکەی ڕۆستەم میرزا کە دژی وەستا بوو،بەمەبەستی وەرگرتنی دەسەڵات، کەوتە داوای یارمەتی لە فەرمانڕەوای (شێروان) بۆ لێدانی ئامۆزاکەی، لە بەرامبەردا ڕۆستەم میرزا هەستی کرد ناتوانێ ڕووبەڕووی ئەم هێزە و هاوپەیمانەکەی ببێتەوە، بۆیە پەنای بردە بەر ئازادکردنی

---

ئەوانیش لەرۆژهەلاتی ئەو ناوچەیە نیشتەجێ بوون، دواتر لەگەڵ لاوازی مەغۆلەکان لە ئاسیای بچووك لە سەدەی هەشتەم بە شێوەیەکی چالاك هاتنە ناو گۆڕەپانی سیاسی و دەسەلاتێکیان بۆ خۆیان دامەزراند، کە پێوەندییان لەگەڵ عوسمانییەکان باش نەبووە، بۆ زیاتر زانیاریی بڕوانە: سرجان ملکم، تاریخ ایران، ترجمە: میرزا حیرت، جلداول، کتابفروشی سعدی، تهران، ١٨٧٦م، ص١٦١ " حسین میر جعفری، تاریخ تحولات سیاسی اجتماعی اقتصادیو فرهنگی ایران در دوره تیموریان و ترکمانان، چاپ پنجم، انتشارات دانشگاه اصفهان، سازمان **مطالعه** وتدوین سمت، تهران، ١٣٨٥ھ.ش، ص ٢٧٩ .

(١٥) خورشاه بن قباد الحسینی، تاریخ ایلچی **نظام** شاه، تصحیح و **تحشیة و توضیح و اضافات: محمد رضا** نصیری، گولیچی هانەدا، چاپ اول، **انجمن اثارو** مفاخر فرهنگی، تهران، ١٣٧٩ھ.ش، ص ص٣-٤ " حسین میر جعفری، منبع پیشین، ص ٣١٦ " کارل بروکلمان، تاریخ الشعوب الاسلامیه، ترجمە: نبیه امین فارس، منیر البعلبکی، دار العلم للملاین، بیروت، ٢٠٠٥ م، **ص٤٩٥** .

(١٦) عبدالحسین زرین کوب، منبع پیشین، ص٦٦٢ " مستەفا محەمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩٣.

(١٧) نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥

نەوەکانی شێخ حەیدەر لە ئەستەخر و داوایکرد لێیان بە کۆکردنەوەی هێز بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی بایسنقەر بێتەوە، هەر بۆیەش (عەلی) کوڕە گەورەی شێخ حەیدەر توانی ژمارەیەکی زۆر لە هەوادارانی کۆ بکاتەوە و پاڵپشتی لە میرزا بەگ بکات لە ئاکامدا لە شەڕێکی یەکلاکەرەوەدا نێزیك (ئاهر) ڕوستم میرزا توانی بایسنقر بکوژێت و زاڵ بێت بەسەر هێزەکەی[18].

دوای ئەم ڕووداوە سوڵتان عەلی لە جاران بەهێزتر بوو، بۆیە ڕۆستەم میرزا لێی کەوتە ترسەوە و هەوڵیدا لە ناوی ببات، بۆ ئەم مەبەستە چەندین گێڕانەوەی جیاواز هەیە سەبارەت بەچارەنووسی سوڵتان عەلی، لەوانە هەندێك پێیان وایە کە خنکا بێت[19]. لەلایەکی دی دەنگۆی ئەوە هەیە کە لە ڕێگەی بانگهێشت کردنیان لەلایەن ڕوستم میرزا بۆ تەورێز و هەر لەوێش (عەلی) دەست بەسەر کراوە، دواتریش فەرمانی کوشتنی دەرکراوە،ب ەڵام ئەو بۆچوونەی کە زۆرینەی مێژوونووسان جەختی لەسەر دەکەنەوە برێتییە لەوەی کە سوڵتان عەلی بەر لە گەیشتنی بەشاری ئەردەبیل لە ساڵی ١٤٩٤ ڕووبەڕووی هێزەکانی رۆستەم میرزا دەبێتەوە و دەکوژرێت، [20].

بێگومان لەناوبردنی سوڵتان عەلی لە ساڵی ١٤٩٤ز بووە هۆکارێك کە موریدە دڵسۆزەکانی تەریقەتی سەفەوی هەوڵەکانیان چڕ بکەنەوە بۆ ئەوەی هەردوو براکەی دیکەی سوڵتان عەلی (ئیسماعیل و ئیبراهیم) بگەیێننەوە ئەردەبیل، بەمەبەستی پارێزگاریکردن لێیان[21].

لە ماوەی ساڵانی ١٤٩٥ز بەدواوە میرەکانی ئاق قوینلو بەربوونە وێزەی یەکدیی بەتایبەتی لەنێوان ئەحمەد بەگ کوڕی ئۆغرلوی نەوەی ئۆزۆن حەسەن و رۆستەم میرزای ئامۆزای، لە ئاکامی ململانێیەکە رۆستەم میرزا لە ساڵی ١٤٩٦ز دەکوژرێت، هەرچەندە بەمەش ناکۆکییەکان کۆتایی نەهات، بگرە تا دەهات ناکۆکییەکان چڕتر دەبۆوە، لە ئەنجامدا لە نێزیك ئەسفەهان ساڵی ١٤٩٧ز ئەحمەد بەگ دەکوژرێت، دواتر دووبەرەکی و ناکۆکیی لەسەر دەسەڵات دابەش دەبێتە سەر سێ بەرە، کە هەر یەکەیان خۆیان بەشایەنتر

(١٨) حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص١٦ .

(١٩) نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥ " كارل بروكلمان، المصدر السابق، ص ٤٩٦ .

(٢٠) مستەفا محەمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٩٤ .

(٢١) كارل بروكلمان، المصدر السابق، ص٤٩٦

دادەنا بۆ وەرگرتنی دەسەڵاتی ڕەها لەوڵاتدا، لەوانە موراد کوڕی یەعقوب میرزا و محەمەد میرزای کوڕی یوسف بەگ و براکەی بە ناوی ئەڵوەند میرزا، لە کۆتایدا ئەڵوەند میرزا توانی زاڵ بێت بەسەر رکابەرەکانی و فەرمانڕەوایی تاکە کەسی پیادە بکات، هەرچەندە یەکگرتنی سوڵتان موراد و ئەڵوەند میرزا هیچ سوودێکی بەدەسەڵاتی ئاق قوینلی نەگەیاند، چونکە ململانێی دوورودرێژی نێوان بنەماڵەکەیان هۆکارێك بوو بۆ لاوازبوونی دەوڵەتەکەیان، دواتر ڕووخانی بەدەستی شا ئیسماعیل سەفەوی[٢٢] .

ئیسماعیل کوڕی حەیدەر لەساڵی ١٥٠١ز، دوای دەست بەسەرداگرتنی تەورێز خۆی وەك (شا)ی ئێران دانا، پاشان بڕیاریدا بەسەپاندنی ئاینزایی شیعە و کردنی بەئاینزایی فەرمی وڵات، بەرامبەر بەمەش بۆ سەپاندنی سیاسەتەکەی هیچ بەزەیی بەکەسدا نەدەهاتەوە زۆر بە توندی کەوتە وێزەی نەیارەکانی و ئامادە نەبوو یەك هەنگاو پاشەکشە بکات لە بڕیارەکانی خۆی، هەروەها هەوڵیدا پەرە بەئاینزای شیعە بدات لە دەرەوەی سنوورەکانی ئێران، بەتایبەت مەڵبەندی ئەنادۆڵ بۆ شا ئیسماعیل لە هەموویان گرنکتر بوو، چونکە خەڵکێکی زۆر عەلەوی بوون، لەلایەکی دیکە پێڕەوکردنی ئەو سیاسەتە پتر بۆ پەستکردنی سوڵتانی عوسمانی بوو[٢٣] .

شا ئیسماعیل بۆ بونیادنانی پێگە و دەسەڵاتی سەفەوی لە ئێران پشتی بەست بەهۆزە تورکمانەکان، کە پێوەستبوون بە دەمارگیری هۆزایەتی و ئاینزای شیعەگەرایی، بەتایبەتی ئەو هۆزانەی ناسراون بە (حەوت هۆزەکە یاخۆ قزلباش) کە ئەوانیش برێتیبوون لە (ئۆستاجلو، شاملو، قاجار[٢٤]، تکالو، بهارلو، **ذوالقدر**، ئەفشار)[٢٥] .

---

(٢٢) فاروق سومر، نقش ترکان **اناطولی** در تشکیل و توسعه دولت صفوی، ترجمە: احسان اشراقی، چاپ اول، محمد تقی امامی، نشر گسترده، تهران، ١٣٧١ه.ش، ص٢٤ .

(٢٣) علی شریعتی، منبع پیشین، ص ٥٨.

(٢٤) قاجارەکان دەگەڕێنەوە بۆ ئەو هۆزە تورکانەی کە لە سەدەی ١٤ی زاینی لە کاتی لەشکرکێشییەکەی تەیمورلەنگ بۆ ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی لەو وڵاتدا نیشتەجێبوونە بەتایبەت لە ناوچەی ئازەربایجان و مازندەران ڕۆڵی سەرەکییان بینیوە لە بەهێزبوونی بزووتنەوەی سەفەوی و دەوڵەتی سەفەوی، توانیان دەسەڵات لە ئێران بگرنە دەست لە نێوان ساڵانی ١٧٩٦ — ١٩٢٥. بۆ زیاتر زانیاریی لەبارەی قاجارەکان بڕوانە: سعید نفیسی، تاریخ اجتماعی و سیاسی ایران در دوره معاصر( از اغاز **سلطنت** قاجار تا پایان جنگ نخستین با روسیه)، جلد اول، ناشر شرق، تهران، ١٣٤٤ه.ش، ص ص ٨ -٢٠ .

بەگوێرەی ئاماژەکردنی زۆرینەی مێژوونووسان،سەرەتای گرژبوونی پێوەندییەکانی ئێران و عوسمانی دەگەڕێنەوە بۆ هۆکاری ئاینزایی، بە تایبەت سیاسەتەکانی شا ئیسماعیل و هەوڵدانی بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینزای شیعە لە ناوچەکە و دروستکردنی کوشتارگەیەك بۆ سونە ئاینزاکان لە بەغدا[٢٦]، بەڵام ناکرێت لایەنی ستراتیژی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی لە ڕووی ئابووری و سیاسی و سەربازی کە ڕۆژ دوای ڕۆژ دەکەوتنە ژێر قەڵەمڕەوی دەوڵەتی سەفەوی لەبەرچاو نەگیرێت [٢٧]، ئەمەش گەورەترین مەترسی دروست کرد لەسەر پانتایی ئابووری دەوڵەتی عوسمانی، بۆیە بۆ پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندییە ئابوورییەکان، ململانێی ئاینزایی باشترین پەردەپۆش بوو بۆ یەکلاکردنەوەی پرسە ئابوورییەکانی نێوانیان.

لەلایەکی دیکەوە پرسی ئاینزایی بووە هۆکارێك بۆ ململانێی و گرژی لە پێوەندییەکانی نێوان خانەکانی ئوزبەك و بنەماڵەی سەفەوی لە ئێران، سەرەتای ئەو ململانێیەش دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی حوکمڕانی شا ئیسماعیلی یەکەم[٢٨]، چونکە شا ئیسماعیل لە هەوڵ دابوو، بەزۆر ئاینزای شیعە بسەپێنێ، لە بەرامبەریشدا محەمەد خان شەیبانی ئۆزبەکی ١٥٠٠ – ١٥١٠ داوای لێکردووە واز لە ئاینزای شیعە بهێنێت و کاری باوك و باپیرانی (دەروێشایەتی) ئەنجام بدات و لە مزگەوتەکانیش وتار بەناوی خانی ئوزبەك بخوێندرێتەوە، هەروەها ناویشی لەسەر پارەوپوول بێت[٢٩].

---

(٢٥) عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ الشعوب الاسلاميه، **الجزء الأول، دار النهضه العربيه**، بيروت، ١٩٧١م، ص ص٢٤-٢٥.

(٢٦) **سعدي عثمان هروتى، كوردستان والامبراطورية العثمانيية، الطبعة الأولى، مطبعة خاني، دهؤك، ٢٠٠٨م، ص٣٧.**

(٢٧) راجر سيورى، ايران عصر صفوى، ترجمه: كامبيز عزيزى، چاپ اول، نشر مركز، تهران، ١٣٧٢ه.ش، ص٤٢.

(٢٨) مەحەمەد سوهێل تەققوش، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٥.

(٢٩) عبدالحسين نوايى، عباسقلى غفارى فرد، تاريخ تحولات سياسى، اجتماعى، اقتصادى فرهنگى ايـران در دوران صفويه، چاپ چـهارم، سـازمان **مطالعـه** و تـدوين كتـب علـوم انسـانى دانشـگاها ( سمـت)، تهـران، ١٣٨٦ه.ش، ص٧٧.

(محەمەد خانی شەیبانی) خانی ئۆزبەك كە بەڕەچەڵەك ڕاستەوخۆ دەگەڕێتەوە سەر (جەنگیزخان)[٣٠]ی مەغۆلی، دەیویست دەسەڵاتداریەتی خۆی بەسەر ئێراندا بسەپێنێ، چونکە ڕۆژانێك خاکی ئێران لەژێر فەرمانڕەوایی باوك و باپیرانیان بووە[٣١].

دوابەدوای مردنی شا ئیسماعیل، لە ساڵی ١٥٢٤ز شا تەهماسبی یەکەم کە وەك (شا)ی ئێران دەسەڵاتی گرتە دەست، لە یەکەمین هەنگاویدا ڕەتیکردەوە دان بنێت بەدەسەڵاتی سوڵتان سلێمانی قانوونی وەك خەلیفەی موسڵمانان[٣٢]، هەروەها دوای داگیرکردنی بەغدا لەلایەن سەفەوییەکان لە ساڵی ١٥٣٠ز کەلەژێر دەسەڵاتی (زولفەقارخانی) کوردی سەرۆك هۆزی کەلهۆر سەر بەدەسەڵاتی عوسمانی[٣٣]، بووە هۆکاری دەستپێکی ململانێیەکی توند جارێکی دیکە لەسەر عێراق لە نێوان هەردوو دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانی، بەتایبەتی دوای کوژرانی (زولفەقارخان) لەلایەن براکانی بە پیلانی شا تەهماسب[٣٤]، ئەم ڕووداوە کاریگەریی زۆری کردە سەر سوڵتان سلێمان قانوونی، چونکە خۆی وا دادەنا کە پارێزەری ناوچە پیرۆزەکانە لە عێراق و لە هەمان کاتدا ڕۆڵی دەرباری عوسمانی لە هاندانی سوڵتان سلێمان و باسکردنی ڕۆڵی باوکی لە

---

(٣٠) زۆرینەی مێژوونووسان لەسەر ئەوە کۆکن کە جەنگیز خان لە ساڵی ١١٥٥ز لە نێزیك زێی ئونون لەدایکبووە، لەماوەی فەرمانڕەواییەکەی توانی هەموو هۆزەکانی مەغۆل لەژێر چەتری یەك سەرکردایەتییی کۆبکاتەوە و فرەوانخوازییەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای گرتەوە، لە ساڵی ١٢٢٧-١٢٢٩ مردووە. بۆ زیاتر زانیاریی لەبارەی جەنگیزخان بڕوانە: سەید باز ئەلعرینی، مەغۆلەکان، وەرگێڕان: شاخەوان محەمەد، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٨ز .

(٣١) ادوارد براون، تاریخ ادبیات ایران از صفویه تا عصر **حاضر**، **ترجمە**:بهرام مقدادی، چاپ دوم، انتشارات مروارید، تهران، ١٣٧٥ ه.ش، ص١٠٢.

(٣٢) کارل بروکلمان، المصدر السابق، ص ٤٥٢.

(٣٣) شەرەفخانی بەدلیسی، شەرەفنامە (مێژووی ماڵە میرانی کوردان)، وەرگێڕانی: مامۆستا هەژار، چاپی سێیەم، دەزگەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ل ٤١٧-٤١٨.

(٣٤) **عباس العزاوی، تاریخ العراق بین احتلالین، الحکومات الترکمانیة ( ٨١٤ه / ١٣٣٨م – ٩٤١ه / ١٥٣٤م)، الجزء الثالث، انتشارات الشریف الرضی، قم، ١٣٦٩ ه.ش، ص ص٣٦٣-٣٦٤.**

ڕووبەڕووبوونەوەکانی بەرانبەر بە ئێرانییەکان[٣٥]، داگیرکردنی بەغداش بەهانەیەکی باشی دایە دەست سوڵتانی عوسمانی کە هێرش بکاتە سەر ئێران[٣٦].

هێزەکانی عوسمانی وەك کاردانەوەیەك بەرانبەر بەسەفەوییەکان لەساڵی **١٥٣٣**ز هێرشیان کردە سەر ئازەربایجان لە ڕێگەی یارمەتی و هاندانی ئولامە تەکەولی فەرمانڕەوای ئازەربایجان کە یەکێ لە گەورە سەرکردەکانی قزلباشی بوو، کە ئەو کات یاخی ببوو لە شا تەهماسبی یەکەم و پەنای بردبووە لای سوڵتان سلێمان قانوونی[٣٧]، لەو هەلومەرجەدا توانی هەر یەکە لە ئیبراهیم پاشا[٣٨]ی سەدری ئەعزەم و سوڵتان سلێمان قانوونی رازی بکات لەسەر پەلاماردانی ئێران و ئەم لەشکرکێشییەش بەناو خاکی کوردستاندا گوزەری کرد، دواتر هێرشی کردە سەر ئازەربایجان، بەڵام ناکرێت ڕۆڵی ئۆلامە سوڵتانی تەکەلۆ پشت گوێ بخرێت، چونکە لە ڕێگەی یارمەتییەکانییەوە بۆ دەوڵەتی عوسمانی توانرا پایتەختی دەوڵەتی سەفەوی داگیر بکرێت[٣٩].

سوڵتان سلێمان قانوونی لە ساڵی **١٥٣٤**ز بۆ جێگیرکردنی ئەم سەرکەوتنە بە هێزێکی زەبەلاحەوە بەناو کوردستاندا ڕوویکردە تەورێز و لەوێشەوە بە هۆی نالەباری کەشوهەوا و سەختی زستان و کەمی ئازووقە تەورێزی چۆڵ کردوو ڕوویکردە هەمەدان، دواتر دووبارە بە کوردستاندا گوزەری کرد بەئاراستەی بەغدا[٤٠]، دوای نێزیکبوونەوەی لە بەغدا ترس و دڵەڕاوکێ لەنێو سەفەوییەکان بڵاوبووە و بەبێ بەرگرییەکی ئەوتۆ

---

(٣٥) **حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص٣٠.**

(٣٦) **كارل بروكلمان، المصدر السابق، ص ٤٥٢.**

(٣٧) عبدالحسین نوایی، عباسقلی غفاری فرد، منبع پیشین، ص١١٨.

(٣٨) ئیبراهیم پاشا سەرکردایەتیی سوپای عوسمانی کردووە لە ساڵی ١٥٢٤ز خزمەتی دەوڵەتی عوسمانی کردووە لە میسر و ئەنادۆڵ و هەنگاریا، پۆستی سەدری ئەعزەمی وەرگرتووە، لە ساڵی ١٥٣٦ز، سەرەڕای خزمەتەکانی کە پێشکێشی دەوڵەتی عوسمانی کردبوو، بە فەرمانی سوڵتان سلێمان قانوونی بە هاندانی روکسلانا لە لەدار درا. بۆ زانیاریی زیاتر بگەڕێوە: **الامير شكيب ارسلان، تاريخ الدولة العثمانية، جمع اصوله وحققه وعلق عليه: حسن السماحي سويدان، الطبعة الأولى، دار ابن كثير، دمشق، ٢٠٠١م، ص ص١٥٢ – ١٥٧.**

(٣٩) نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢.

(٤٠) نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢.

سوڵتان سلێمان قانوونی چووە ناو بەغدا و داگیری کرد، ئەوەی زانراوە کە سوڵتانی عوسمانی ڕێگەی بەتاڵانکاری و ئازاریی خەڵکی نەداوە[٤١].

دوای ئەم ڕووداوە ململانێ و جەنگ لەنێوان هەردوو دەوڵەت بۆ ماوەی بیست ساڵ درێژەی کێشا، لەدوایین قۆناخی جەنگی بیست ساڵەدا شا تەهماسب لە چوار قۆڵەوە هێزەکانی خۆی نارده سەرئاوایی و قەڵاکانی ئەرجیش و بارگیری و پاسین و موش و پەندماهی و (عادلجواز)[٤٢] سەرانسەری ئەو ناوچانەیان لە ئاگر و خوێن نقووم کرد، هەروەها بۆ دووەمین ساڵ لە سەریەك هەموو ناوچەکانی (وان، وستان، ئاموك، کواش، ئەلباق، خوشابیان) تالانکرد و ئاگریان لە دانەوێڵە و پوش و پاوانیان بەردا[٤٣]، لە دوای ئەم هێرشانەدا سوڵتان سلێمان قانوونی هێزەکانی عوسمانی سازدا بۆ لەشکرکێشیی بۆ سەر ئێران لە ساڵی ١٥٥٣ز گەیشتن بۆ نەخچەوان دوای ئەوەی شا تەهماسبی یەکەم هەستی کرد سوپای عوسمانی لە تخوبەکانی ئێران نێزیك بۆتەوە، بڕیاریدا باڵیۆزی خۆی بەناوی فەرخ زادە بەمەبەستی بەستنی پەیماننامەی ئاشتی بنێرێتە دەرباری عوسمانی، لە بەرامبەردا سوڵتان سلێمان قانوونی بە پێشنیازەکەی شا تەهماسب قایل دەبێت و پەیماننامەی ئاشتی (ئاماسیا)[٤٤] لە ساڵی ١٥٥٥ز لەنێوان هەردوولادا بەسترا[٤٥].

لەمیانەی مۆرکردنی ئەو ڕێککەوتننامەیە ئێرانییەکان گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە گرتنی بەغداد و گەڕانەوەی بۆ ژێر دەسەڵاتی سەفەوی کارێکی ئەستەمە، لە بەرامبەریشدا سوڵتان سلێمان قانوونی گەیشتە ئەو بڕوایەی لەشکرکێشییەکانی بۆ ناو خاکی ئێران بە هیچ جۆرێك ناتوانێت جێ پێی خۆی لەم وڵاتەدا قایم بکات، هەر بۆیەش هەردوو لایەنی ناکۆك بڕیاری بەستنی پەیماننامەی ئاشتییان قبووڵ کرد[٤٦]، کە بووە

---

(٤١) **علی الوردی، لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث، الجزء الأول، الطبعة الثانية، دارالراشد، بيروت، ٢٠٠٥م، ص ٥٦.**

(٤٢) دەکەوێتە کەنارەکانی دەریاچەی وان، بەشێکە لە ویلایەتی بەدلیسی کوردی لە تورکیا

(٤٣) نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣.

(٤٤) شارۆکەیەکە لە باکوری ئەنادۆڵ و سەر بە ویلایەتی سیواس.

(٤٥) اسکندر بیگ ترکمان، تاریخ عالم ارای عباسی، با اهتمام و **تنظیم**: ایرج افشار، جلد اول و نیمی از جلد دوم، چاپ چهارم، انتشارات امیر کبیر، تهران، ١٣٨٧هـ.ش، ص٧٩ " فاروق سومر، منبع پیشین، ص ص٨٤-٨٥ .

(٤٦) حسن کریم جاف، المصدر السابق، ص ص ٣٣-٣٤ .

هۆكارێك بۆ بەرقەراركردنی ئاشتی لە نێوان هەردوو دەوڵەت، تا مردنی شا تەهماسبی یەكەم لە ساڵی ١٥٧٦ز[٤٧].

لەلایەكی دیكەوە پێوەستبوونی شا تەهماسبی یەكەم بەئاینزای شیعەگەرایی زۆر بەڕوونی لەدیدارەكەی لەگەڵ محەمەد كوڕی هەمایون١٥٠٨ – ١٥٥٦ ئیمپراتۆری مەغۆلی هیندی دەردەكەوێت، چونكە داوا لە میوانەكەی دەكات، كە سونە ئاینزایە، ئامادەیە یارمەتی پێشكێش بكات بۆ گەڕانەوەی دەسەڵاتی بۆ دلهی دژ بەنەیارەكانی بەمەرجێك ئاینزاكەی بۆ شیعە بگۆڕێت[٤٨]، هەروەها شا تەهماسب بۆ پارێزگاریكردن لە هەرێمەكانی ڕۆژهەڵات دژ بەئۆزبەكەكان، لایەنی ئۆلی دەكاتە ئامرازێك بەمەبەستی هاندانی ئێرانییەكان دژ بەدوژمنەكانییان كە سونە ئاینزا بوون[٤٩].

دوا بەدوای مردنی شا تەهماسب لە تەمەنی شەست و چوارساڵیدا، دووبارە ئێران كەوتەوە گێژاوی ململانێیە نێوەخۆییەكانی ناو بنەماڵەی سەفەوی بەتایبەت لەنێوان نەوەكانی شا تەهماسب بەمەبەستی وەرگرتنی دەسەلآت[٥٠]، تا دەركەوتنی شا عەباسی گەورە، تا ڕادەیەك دەسەلآتی ئاینی و پیاوانی دەربار ئەو كاریگەرییە بەهێزەیان نەما، بەهۆی كۆكردنەوەی هەردوو دەسەلآت لەدەستی خۆی، هەرچەندە شەڕەكانی (ئێران- عوسمانی، ئێران- ئوزبەك) زیاتر پێوەست بوو بەهۆكاری ئاینی و ئاینزای، بەلآم ئەو گرینگییە زۆرەی نەبوو، چونكە لە سەردەمی شا عەباسی گەورە دەسەلآت لە ئێران زیاتر دەسەلآتی ستەمكاری بووە، توانی هەڕەشەكانی ئوزبەك لە سنوورەكانی ڕۆژهەلآت كۆتایی پێ بهێنێت [٥١]، هەروەها سوپای سەفەوی لە تشرینی ساڵی ١٦٠٣ز توانی تەورێز لەدەستی سوپای عوسمانی وەربگرێتەوە و بەردەوام بوو لە پێشڕەوییەكانی، سەركەوتن دوای سەركەوتنی بەسەر هێزەكانی عوسمانی بەدەست دەهێنا، بەشێوەیەك

---

(٤٧) **عبدالرضا** هوشنگ مهدوی، **تاریخ روابط** خارجی ایران از ابتدای دوران صفویه تا پایان جنگ دوم جهانی (١٥٠٠-١٩٤٥)، چاپ دوم، انتشارات امیر كبیر، تهران، ٢٥٣٥ شاهنشاهی، ، ص ص ٣٤-٣٥ .

(٤٨) مریم میر احمد، تاریخ سیاسی، اجتماعی، اقتصادی و فرهنگی در عصر صفوی، چاپ اول، انتشارات امیر كبیر، تهران، ١٣٧١ه.ش، ص٦٣

(٤٩) بهنام محمد پناه، تركان در **كذر** تاریخ، چاپ اول، انتشارات سبزان، تهران، ١٣٨٧ ه.ش، ص ٦٩

(٥٠) محمد جواد مشكور، تاریخ ایران زمین، چاپ چهارم، انتشارات اشراقی، تهران، ١٣٧٢ ه.ش، ص ٢٧٢

(٥١) لارنس لاكهارت، **انقراض** سلسله...، ص ص١٧-١٨.

ناوچەکانی یەریڤان و شیروان و قارسی وەرگرتەوە، دواتر لەشکرکێشییەکەی بەرەو بەغدا ئاراستە کرد و لەساڵی ١٦٢٣ز دەستی بەسەردا گرت[٥٢].

لەدوای مردنی شا عەباسی یەکەم لە ساڵی ١٦٢٩ز بەشێوەیەکی گشتیی دەسەڵاتی دەوڵەتی سەفەوی بەرەو کزبوون رۆیشت، بەتایبەتی دوای هاتنی ژمارەیەك لە (شا)ی لاواز، کە زۆرینەیان کاروباری وڵاتیان بەلاوەنابوو[٥٣]، لە سەرووی هەموویانەوە شا سەفی ١٦١١ – ١٦٤٢ز کە لە دوای مردنی شا عەباسی گەورە دەسەڵات وەردەگرێت و سەردەمەکەی بەلاوازترین سەردەمی سەفەوی هەژمار دەکرێت، ئەمەش پتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شکستە یەك لەدوای یەکانە لەسەر ئاستی دەرەوە، بەتایبەتی لەڕووی سەربازییەوە، چونکە شا سەفی بەشێوەیەکی گشتیی کاروباری وڵاتی بەلاوە نابوو[٥٤]، لە دیارترین ڕووداوی سەرەکیی سەردەمی شا سەفی برێتی بوو لە گەڕانەوەی بەغدا بۆ ژێر رکێفی دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی ١٦٣٨ز کە بە **بەسەرکردایەتیی** سوڵتان موورادی چوارەم بەڕێوەچوو[٥٥]، دوای ئەم ڕووداوە پەیماننامەی زەهاو بەسترا لەنێوان هەردوولا لە ساڵی ١٦٣٩ز کە بەغدا لەژێر شکۆی دەوڵەتی عوسمانی بێت و یەریڤانیش بەشێك بێت لە ئێران[٥٦].

پەیماننامەی زەهاو (قەسری شیرین) بووە هۆکارێك بۆ چارەسەرکردنی کێشە و ناکۆکییەکانی هەردوو وڵات لەسەر ئەو ناوچانەی، کە چەندین ساڵ جێگەی مشتومڕ و ناکۆکیی بووە لەنێوانیاندا، هەروەها ئەو پەیماننامەیە ئارامی لەنێوان هەردوو دەوڵەت بەرقەرارکرد تاکو کۆتایی سەردەمی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی سەفەوی[٥٧].

---

(٥٢) **حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص ٤٢.**

(٥٣) شواليه شاردن، سفرنامەی شاردن، ترجمه: اقبال يغمايى، جلد پنجم، انتشارات توس، تهران، ١٣٧٥هـ.ش، ص١٨٦٧.

(٥٤) عباس قديانى، تاريخ فرهنگ وتمدن ايران، چاپ اول، انتشارات فرهنگ مكتوب، تهران، ١٣٨٣ هـ.ش، ص٧٤.

(٥٥) **عبدالعزيز سليمان نوار، المصدر السابق، ص ٧٨.**

(٥٦) **حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص ٥١.** بۆ زانیاری پتر لەبارەی بەندەکانی رێککەوتننامەکە بگەڕێوە بۆ: **فاضل رسول، العراق-ايران.. اسباب وابعاد النزاع، الطبعة الثانيية، دار سردم للطباعة والنشر، السليمانيية، ٢٠١٠م، ص٢٨.**

(٥٧) **عبدالرضا** هوشنگ مهدوى، منبع پيشين، ص ١٠٢.

سەردەمی شاسەفی نموونەی زوڵم و زۆرداری بووە، چونکە هیچ کەسێك دڵنیا نەبوو لە ژیان و سامانی خۆی بە درێژایی فەرمانڕەوایەتییەکەی[٥٨]، بەشێوەیەك لە ماوەی فەرمانڕەوایی شاسەفی زۆر لەکەسایەتییە نێزیکەکانی بنەماڵەی سەفەوی تووشی چاو دەرهێنان و کوشتن بوونەتەوە، لەوانە چەندین سەرکردەی دیاری سوپای دەوڵەتی سەفەوی کە رۆڵی بەرچاویان هەبوو لە جەنگەکانی سەفەوی — عوسمانی لەلایەن شاسەفی لە داردراون لەوانە زەنیل خان شاملو لە ساڵی ١٦٣٠ز [٥٩]، هەروەها هەر یەکە لە عیسا خان و چەراغ خان کە دوو سەرکردەی سەربازی دیاری سوپای سەفەوی بوون لە ساڵی ١٦٣٢ز[٦٠]، میرزا تاڵیب ئەردبادی وەزیری گەورەی دەربار لە ساڵی ١٦٣٤ز[٦١]، سەرەڕای ئەوانەش هەڵسا بەکوشتنی ئیمام قوولی خان کە داڕێژەری راستەقینە بوو بۆ دەرکردنی پوورتوگالییەکان لە هورمز، بەڵام شاسەفی بەشێوەیەك رەفتاری دەکرد دۆست و دوژمنی خۆی لێك جیا نەدەکردەوە[٦٢].

دوا بەدوای مردنی شا سەفی، شا عەباسی دووەم ١٦٤٢ — ١٦٦٧ دەسەڵات وەردەگرێت و بۆ ماوەیەکی کورت لە فەرمانڕەواییەکەی جۆرە پێشکەوتنێکی پێوە دیاربووە، چونکە لە ساڵی ١٦٤٨ز توانی قەندەهار بگەڕێنێتەوە[٦٣] و زاڵبێت بەسەر شۆڕشەکەی تەهومورس خان لەساڵی ١٦٥٩ز لە گورجستان، سەرەڕای پیادەکردنی جۆرە دادپەروەرییەك لە ساتوسەودایکردن لەگەڵ خەڵك بێ گوێدانە بیروباوەڕیان[٦٤]، هەروەها لە کۆتاییەکانی فەرمانڕەوایەتی ئەم (شا)یە ڕووسەکان چەندین جار هێرشیان کردۆتە سەر سنوورەکانی باکووری ئێران، بەتایبەتی لە ساڵی ١٦٥٣ز هێرشیان کردە سەر قەڵاکانی دەربەند و شێروان، بەڵام دواتر لە رێگەی ڕێککەوتننامەوە ئاشتیان کردووە[٦٥].

---

(٥٨) کارل بروکلمان، المصدر السابق، ص ٥٠٥ .

(٥٩) پژوهش در دانشگاه کمبردج، تاریخ ایران، ترجمە: یعقوب اژاند، چاپ دوم، فراین، تهران، ١٣٨٤ ه.ش، ص٩٤.

)60 ( Peter Jackson and Lauraence Lockhart ( eds.), Op. Cit, P.280.

(٦١) پژوهش در دانشگاه کمبردج، منبع پیشین، ص٩٤.

(٦٢) عبدالعزیز سلیمان نوار، المصدر السابق، ص٧٨" سرجان ملکم، منبع پیشین، ص ١٨٧.

(٦٣) عەلی حەرب، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٢٢٧-٢٢٨.

(٦٤) کارل بروکلمان، المصدر السابق، ص ٥٠٥

(٦٥) مریم میر احمدی، منبع پیشین، ص٩٠

سەبارەت بە شاسلێمان ١٦٤٥ — ١٦٩٤ لە دوای شا عەباسی دووەم دەبێتە (شا)ی ئێران، وڵات لە سەردەمی ئەو (شا)یە تووشی نالەباری و بارودۆخی خراپ بۆتەوە، چونکە شا سلێمان کەسێکی لاوازبووە و دەسەڵاتی ناوەندیی جارێکی دیکە بەرەو لاوازی رۆیشت بەهۆی دەست خستنە ناو کاروباری دەوڵەت لەلایەن سەرکردە و کەسایەتییە دیارەکانی دەربار[٦٦].

بەشێوەیەك لە کاروباری وڵات دوورکەوتبووە، تەنانەت پاڵەپەستۆیەکانی کەشتیگەلی یەعاربە[٦٧] لەبەندەر عەباس، هەروەها دەستگرتنی هۆڵەندییەکان بەسەر دوورگەی قشم و هێرشی ئوزبەکەکان بۆ خوراسان[٦٨] هیچ کاردانەوەیەکی نەبووە لەسەر ئەو ڕووداوانە[٦٩]، تەنانەت شاسلێمان ئاگەدار کراوەتەوە لە مەترسی هەڕەشەکانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ سەر ئێران لەلایەن دارودەستەکەی، بەتایبەت لەدوای تەواوبونی جەنگەکانی عوسمانی لە ئەوروپا، تەنیا وەڵامێکی ساردی هەبووە، ئەویش برێتی بوو لەوەی ((تەنیا مانەوەی ئەسفەهان بەسەبۆ ئێمە)) [٧٠].

پاش مردنی شا سلێمان ١٦٩٤ز بەشێوەیەکی راستەوخۆ جێنشینی لەدوای خۆی دەستنیشان نەکرد، بەڵام دەڵێن لە کاتی سەرەمەرگیدا داوای لە دارودەستەکەی کردووە، بەتایبەت لە پووری بەناوی (خانم مریم بێگم) ئەگەر دەتانەوێت ئاشتی و ئارامی لە وڵاتدا بەرقەراربێت ئەوە (سوڵتان حوسێن)ی تەمەن بیست و شەش ساڵە بکرێتە (شا)ی

---

(٦٦) حسن کریم جاف، المصدر السابق، **ص ٥١.**

(٦٧) بنەچەی یەعاربە دەگەڕێتەوە بۆ نەسر کوڕی زەهرانی کوڕی کەعبی کوڕی حارس کوڕی کەعب، لە ساڵی ١٦١٧ز کە کۆتایی ماوەی فەرمانڕەوای بەنی نەبهان بوو، بەهۆی ململانێی توندی سەرکردەکانی نەبهان لەسەر دەسەڵات و مەترسییەکانی مەملەکەتی هورمز، هەروەها پورتوگالییەکان، یەعاربەکان لەژێر سەرکردایەتیی ناسر کوڕی مورشد لە ساڵی ١٦٢٤ پاش ئەوەی توانی هەرێمەکانی عومان یەکبخات و دەوڵەتی یەعاربە دابمەزرێنێت و بەردەوام بێت تاکو ساڵی ١٧٤٩ز. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: **سعید بن محمد الهاشمی، دراسات في تاریخ العمانی، الطبعة الأولی، دار الفرقد، مسقط، ٢٠١١م،** ص ص٢٣٧ — ٣٠٤.

(٦٨) ن.و.بیکولوسکایا و دیگران، تاریخ ایران از دوران باستان تاپایان سدەو هیجدهم میلادی، انتشارات پیام، تهران، ١٣٥٤ه.ش، ص٥٥٩.

(٦٩) عبدالعزیز سلیمان نوار، المصدر السابق، ص ٧٨

(٧٠) ادوارد براون، **منبع** پیشین، ص ١٢١.

ئێران، ئەگەر گەڕانەوەی شکۆ و هێز و دەسەڵات بۆ ئیمپراتۆریەتی سەفەوی مەبەستانە ئەوە عەباس میرزای تەمەن بیست و سێ ساڵە بکرێتە جێنشین[٧١]، دیارە خانم مریم بێگم زیاتر لایەنگری سوڵتان حوسێن بووە، هەر بۆیەش لە ساڵی ١٦٩٤ز تاجگوزاری کرا بۆ شاحوسێن[٧٢].

بەڕاستی کرداری هاتنە سەرتەخت لاوازی دەسەڵاتەکەی دەرخست، چونکە بەڕاسپاردە و پاڵپشتی دەرباریانی سەفەوی هاتبووە سەر دەسەڵات، زیاتر مەبەستی ئەوانیش پارێزگاریکردن بوو لە دەسەڵات و پلەوپایە بەرزەکانیان [٧٣]، تاڕادەیەکی زۆریش کاروباری وڵات لە سەردەمی ئەو (شا)یە لەدەست پیاوانی ئاینی بووە، لە سەرووی هەمووشیان باقر مەجلیسی[٧٤] یەکێك بوو لە گەورە زاناکانی ئاینزای شیعەی دوازدە ئیمامی کە کاروباری ئاینی و دنیایی لە دەوڵەتی سەفەوی هەڵدەسووڕاند[٧٥].

شا حوسێن خاوەن کەسایەتییەکی لاواز و ترسنۆك بووە، زۆر باوەڕی بەشتە ئەفسانەییەکان هەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر پێوەست بووە بە ئاینزای شیعەگەرایی و کاریگەریی لەسەریدا هەبووە، بۆیە پیاوانی ئاینی شیعە توانیویانە لە رێگەی ئەو وابەستەیەی بەئاینزای شیعەگەرایی سوودی لێ وەربگرن و بەشێوەیەکی راستەوخۆ

---

(٧١) حاج میرزا حسن حسینی فسائی، فارسنامەی ناصری، تصحیح: منصور رستگار فسایی، جلداول، چاپ دوم، انتشاراتی امیر کبیر، تهران، ١٣٧٨هـ.ش، ص٤٩٠"محمد **کاظم** مروی وزیر مرو، عالم ارای نادری، تصحیح و **توضیحات: محمد** امین ریاحی، جلد اول، چاپ دوم، نشر علم، تهران، ١٣٦٩هـ.ش، ص١٨.

(٧٢) پژوهش در دانشگاه کمبردج، منبع پیشین، ص ص١٢٢ – ١٢٣.

(٧٣) مریم میر احمدی، منبع پیشین، ص٩١ " سرجان ملکم، منبع پیشین، ص١٩٤.

(٧٤) مەلا محەمەد باقر مەجلیسی کوڕی مەلا محەمەد تەقی مەجلیسییە، یەکێك بوو لە گەورە زاناکانی ئاینزای شیعەی دوازدە ئیمامی، لە ساڵی ١٦٢٥-١٧٠٠ز-١٠٣٣-١١١١ك، کۆچی دوایی کردووە، لە سەردەمی شا سوڵتان حوسێن ژیاوە و رێزێکی زۆری لای شا حوسێن هەبووە و دەسەڵاتێکی زۆری هەبووە، لەگەڵ خەڵکانی (سونە مەزهەب) توونـد بـووە. بـۆ زانیـاریی زیـاتر بگەڕێوە بۆ: محمد هاشم اصف، رستم التواریخ، تحقیق: محمد مشیری، انتشارات کتاب نمونە، تهران، ١٩٧٨م، ص٩٣؛ منصور صفت گل، ساختار نهاد و اندیشە دینی در ایران عصر صفوی، چاپ اول، **مؤسسە** خدمات فرهنگی رسا، تهران، ١٣٨١ هـ.ش، ص ص٢٢٠-٢٢٥.

(٧٥) عباس پرویز، تاریخ دوهزارو پانصد ساڵە ایران، جلد سوم، چاپ اول، شرکت سهامی چاپ و اتشارات کتب ایران، تهران، ١٣٤٣ هـ.ش، ص ٣٢

کاریگەریی لەسەر چێ بکەن، تەنانەت شا حوسێن بە (مەلا حوسێن) یاخۆ (زاهید حوسێن) ناوبانگی دەرکردبوو[٧٦].

سەردەمی شا حوسێن بەسەردەمی توندڕۆیی شیعەگەریی ناوزەد دەکرێت، کە تیایدا بە توندترین شێوە رەفتار لەگەڵ سونە ئاینزاکان کراوە[٧٧]، بەشێوەیەك داپڵۆسینی سونە ئاینزاکان گەیشتە ڕادەیەکی زۆر، کە بووە هۆکارێك بۆ ئەوەی دەوڵەتی سەفەوی دووچاری هێرشی دەرەکیی ببێتەوە لەلایەن ئەفغانەکان[٧٨].

لە ئەفغانستان[٧٩] چەندین هۆزی ناودار تێدا دەژین هەروەکو هۆزی ئەبدالی و هۆزی غەلزائی، کە دەکەونە بەشی باشوور و باشووری ڕۆژئاوای ئەفغانستان[٨٠]هۆزی غەلزائی کە بەهێزترین هۆزە لە قەندەهار، هەرچی ناوجەرگەی ئەفغانستانیشە چەند هۆزێکی مەغۆلی تێدا نیشتەجێن وەك (هزارە، تیمانی و چهارئیماخ) لەڕووی ئاینەوە موسڵمانن، زۆرینەی هۆزەکانیش لەسەر ئاینزای سوننی حەنەفی، تەنیا هۆزی (هزارە) نەبێت کە شیعە ئاینزان[٨١]، سەدەی شازدە و حەڤدە و سەرەتای سەدەی هەژدە بەسەدە تاریکەکان لە مێژووی ئەفغانستان هەژمار دەکرێت، چونکە ئەفغانەکان لەو سەردەمانەدا گیرۆدەی ژیانێکی تاڵ و پڕ لە ململانێ و شەڕ و تاڵان کردنەوە بوونەتەوە[٨٢]، بەتایبەت لە بەرامبەر دوژمنەکانیان کە برێتی بوون لە دەوڵەتی سەفەوی لە ڕۆژئاوا و ئیمپراتۆرییەتی مەغۆلی هیندی لە باشوور [٨٣].

---

(٧٦) عبدالحسين نوايي، عباسقلي غفاري فرد، منبع پيشين، ص٢٥٣"

Krusinski., The History of the Late Revolutions of Persia,Londone,1733, Volume.I , P.71.

(٧٧) حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص ص ٥٢ – ٥٣.

(٧٨) كارل بروكلمان، المصدر السابق، ص ص ٥٠٥ – ٥٠٦ .

(٧٩) ئەم ناوە لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەم لە ساڵی ١٧٤٧ بەتایبەت لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی ئەحمەد شا هاتووە، پێشتر هەر هەرێمێك لەو ناوچەیە ناوێکی تایبەتی خۆی هەبووە: **فاروق حامد بدر، تاريخ افغانستان من قبل الفتح الاسلامي حتى وقتنا الحاضر، مطبعة حسان، القاهرة، ١٩٨٠م، ص٥.**

(٨٠) عباس قدياني، منبع پيشين، ص ٨٢.

(٨١) بصير احمد دولت ابادی، شناسنامه افغانستان، چاپ اول، چاپخانەی ليتوگرافی شهيد، قم، ١٣٧١هـ.ش، ص٣١٠.

(٨٢) حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص ص ٥٤-٥٥.

)83 ( A. Yusuf Ali, The making of India, Deutschland,2012,P.183.

لە سەردەمی سولّتان حوسێن ئەفغانستان لەژێر ركێفی دەولّەتی سەفەوی بوو، بەلاّم فەرمانڕەوای ناوچەكەیان دابوو بەئەمیرێكی جۆرجی بەناوی (گۆرگین)[٨٤] كە پیادەی سیاسەتێكی توندی دەكرد لە قەندەهار بەتایبەتی بەرامبەر بەسەرۆك هۆزەكان[٨٥]، چەندین جار سەران و كەسایەتییە دیارەكانی ئەفغانی سكالاّیان لە گورگین خان كردووە لە دەرباری سەفەوی، بەلاّم لەلایەن شا حوسێن گوێ بەسكالاّكان نەدراوە، چونكە گورگین خان لەلایەن شا حوسێن زۆر باوەڕپێكراو بووە[٨٦]، ئەمەش وایكرد گورگین خان هەلّسێت بەسزادانی هەموو ئەو كەسانەی سكالاّیان دەبردە دەرباری سەفەوی، هەندێكیان لە سێدارەدەدران و هەندێكی دیكەیان پاش سزادانیان دەخرانە زیندان[٨٧].

میر وەیس یەكێك لە دیارترین سەرۆك هۆزی غەلزائی ئەفغانی بوو، كە لەناو ئەفغانەكان شایەنی ڕێز و پلەوپایە بوو هەر بۆیە زوو لەلایەن گۆرگین خانی جۆرجی دەستگیر دەكرێت و ڕەوانەی ئەسفەهان دەكرێت[٨٨]، هەرچەندە میر وەیس وەك

---

(٨٤) گۆرگین خان ناسراو بە شا نوازخان، كەسایەتییەكی نەسرانی جۆرجیاییە، چەندین ڕاپەڕین و شۆڕشی دژ بەدەسەلاّتی سەفەوی لە جۆرجیا ئەنجام داوە، كە نائارامی بۆ دەسەلاّتی سەفەوی لە ناوچەكە چێ كردبوو، بەلاّم شا حوسێنی سەفەوی لە ڕێگەی فەرمانڕەوای گەنجە توانی بەسەریدا زال ببێت و دەستگیری بكات، دواتر رەوانەی دەرباری سەفەوی كرد لە ئەسفەهان، دوای ئەوەی لە بەرامبەر شا حوسێن موسلّمان بوونی خۆی ڕاگەیاند، فەرمانی لێخۆش بوونی بۆ دەركرا لەلایەن شاهی ئێران و رەوانەی قەندەهار كرا وەك فەرمانڕەوا و دەسەلاّتداری سەفەوی لەناوچەكەدا. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: عبدالحسین نوایی، عباسقلی غفاری فرد، منبع پیشین، ص ٢٦٠، احمد پناهی سمنانی، نادر شا بازتاب حماسه و فاجعه ملی، چاپ هشتم، انتشارات كتاب نمونه، تهران، ١٣٧٢ هـ.ش، ص٥٤.

(٨٥) احمد پناهی سمنانی، منبع پیشین، ص٥٥.

(٨٦) محمد شفیع **طهرانی**، مرأت واردات(تاریخ **سقوط** صفویان پیامدهای ان و فرمانروای ملك محمود سیستانی)، تصحیح و تحقیق: منصور صفت گل، **میراث** مكتوب، تهران، ١٣٨٣هـ.ش، ص ص١٠٩-١١٠ " عباس قدیانی، منبع پیشین، ص٨٣.

(٨٧) عباس پرویز، منبع پیشین، ص٣٤ .

(٨٨) احمد پناهی سمنانی، منبع پیشین، ص٥٤"دەربارەی هۆكارەكانی دەستگیركردنی میر وەیس لەلایەن گۆرگین خان بگەڕێوە بۆ: **عبدالرضا** هوشنگ مهدوی، **منبع ثیشین**، ص ١٣٣.

یاخیبوویێك لە دەسەڵاتی سەفەوی لەلایەن کورگین خان ڕەوانەی ئەسفەهان کرا[89]، کەچی ئەو ماوەیەی لە ئەسفەهان بوو، توانی خۆی لە شا حوسێن نێزیك بکاتەوە و باوەڕیشی پێ بێنێ، کە ئەو کارانەی خراونەتە پاڵی دوورن لە راستی و هەمووی قسەی هەڵبەستراون[90]، بۆ ئەم مەبەستەش هەندێك لە پیاوانی دەربار لەبەر بوونی ناکۆکییان لەگەڵ گورگین خان پاڵپشتییان بۆ بێ تاوانبوونی میر وەیس دەربڕی[91].

سەرەڕای ئەوەش میر وەیس لە دەرباری سەفەوی بوو بەپیاوە باشترینەکەی شا حوسێن، دواتر توانی مۆڵەت لە شا حوسێن وەربگرێت بەمەبەستی جێبەجێکردنی فەریزەی حەج لە حیجاز[92]، لەوێشەوە توانی فەتوایەکی بەهێز لە زانایانی سونە ئاینزا وەربگرێت، کە شەڕکردن لەگەڵ شیعە ئاینزا کارێکی جیهادییە و دەگونجێت لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامی[93]، چونکە دەسەڵاتدارێتی سەفەوی مەترسییەکی گەورەیە لەسەر جیهانی ئیسلامی، بۆیە پێویستە جیهاد لە بەرامبەریاندا بکرێت[94].

دوای گەڕانەوەی میر وەیس لە حیجاز بۆ ئەسفەهان و هاتنی شاندی ڕووسیای تەزار بەسەرۆکایەتی (ئیسرائیل ئاوری) دەنگۆیەکی زۆری چێ کرد بەتایبەتی دەنگۆی ئەوە هاتە ئاراوە، کە گوایە ناوبراو یەکێکە لە دوا نەوەکانی پادشای کۆنی ئەرمەنستان و ڕایگەیاندووە، کە دەیەوێ خاکی باوك و باپیرانی وەربگرێتەوە[95].

---

(٨٩) مريم مير احمدی، منبع پيشين، ص٩٢ .

(٩٠) محمد جواد مشكور، منبع پيشين، ص٢٩٠.

(٩١) عبدالحسين نوايی، عباسقلی غفاری فرد، منبع پيشين، ص٢٦١" حاج ميرزا حسن حسينی فسائی، منبع پيشين، ص٤٩٣.

(٩٢) عباس پرويز، منبع پيشين، ص٣٤.

(٩٣) **تاد يوز يودا كروسينسكی**، عبرت نامه، ترجمه: عبدالرزاق دنبلی، چاپخانه شفق، تبريز، ١٣٦٣هـ.ش، ص ص٢٣-٢٤.

(٩٤) عبدالحسين نوائی، اسنادو مكاتبات سياسی ايران، **مؤسسه مطالعات و تحقيقات** فرهنگی، تهران، ١٣٦٣ هـ.ش، ص١٠.

(٩٥) راجر سيوری، منبع پيشين، ص ص ٢٤٣-٢٤٤"
P. SYKES, A HISTORY OF PERSIA, Volume. II, LONDON, 1915, P.303.

لەو نێوەندەدا میر وەیس توانی سوود لەم دەرفەتە وەربگرێت و باوەڕ بە شاحوسێن بهێنێت، کە (پەترۆسی گەورە)[٩٦] لە هەوڵی ئەوەدایە گورجستان و ئەرمەنستان بخاتە ژێر رکێفی خۆی[٩٧]، لەو هەوڵەشیدا تەزاری رووسیا سوود لە یارمەتی و کۆمەکییەکانی گۆرگین خان و چەکدارانی وەردەگرێت، لەم رێگەیەوە میروەیس توانی گومان لەسەر گورگین خان لەلایەن شا حوسێنەوە چێ بکات، لەهەمان کاتدا رەزامەندی (شا)ی ئێران بەدەست بهێنێت بۆ چاوەدێریکردنی رەفتارەکانی گورگین خان[٩٨].

دوای ئەوەی میر وەیس وەك چاوەدێر لەسەر گۆرگین خانی جۆرجی لەلایەن شاحوسێن دانرا و گەڕایەوە قەندەهار، دەستی کرد بە کۆکردنەوەی سەرانی ئێلەکەی، لاوازی دەوڵەتی سەفەوی بۆ ڕوونکردنەوە و هانیدان بۆ یەککگرتن و شۆڕش، دواتر لە رێگەی پیلانێکەوە دەتوانێت گورگین خان لەناو ببات[٩٩]، بەمەش قەندەهار کەوتە ژێر دەسەلاتی میر وەیسی سەرکردەی غەلزائی، لەو گۆڕانکاریانەشدا شا حوسێن ئامادە نەبوو هێز بنێرێتە قەندەهار دژ بەمیر وەیس، بگرە لە هەوڵی ئەوەدا بوو لە رێگەی ڕێکەوتنێك لەگەڵ میر وەیس کۆتایی بەناکۆکییەکان بێنن، بۆ ئەم مەبەستە یەکێك لە

---

(٩٦) پەترۆسی گەورە ١٦٨٢ — ١٧٢٥ لە سەردەمی ئەم تەزارە رووسیا گەیشتە ئەوپەڕی بەهێزی دوای ئەوەی چەندین چاکسازی ئەنجامدا وەك گرینگیدانی بە رێکخستنی سوپا و کارگێڕی و خوێندن، هەروەها سنووری ولاتەکەی لە رۆژئاوا و باشوور فرەوان بوو، چەندان قەلا و قایمکاری دەوڵەتی عوسمانی داگیر کردووە، لەوانە قەلای ئازوف، لەگەڵ ئەوانەش زۆر سەرسام بوو بە داب و نەریتی رۆژئاوا، دواتر هەڵسا بە دروستکردنی شاری (سان پەترۆسبۆرگ)، کە پاشان بوو بە پایتەختی رووسیاوە لە گرینگترین هەوڵەکانی برێتی بوو لە گەیشتنی بە ئاوە گەرمەکان و دەریای ناوەڕاست. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: علی شعب، **بطرس** الاکبر( قیصر روسیا)، دار الفکر العربی، بیروت، ١٩٩٢م، ص ص٣٤، ٦٥-٦٨" محمد محمد صالح، **تاریخ اوروبا من عصر النهضة الی الثورة الفرنسیة** (١٥٠٠-١٧٨٩) بغداد، ١٩٨٢، ص٤١١ .

(٩٧) عباس پرویز، منبع پیشین، ص٣٥ .

(٩٨) عبدالحسین نوایی، عباسقلی غفاری فرد، منبع پیشین، ص٢٦٣" ن.و.بیکولوسکایا و دیگران، منبع پیشین، ص٥٨٠.

(٩٩) نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٧" بۆ زیاتر زانیاریی دەربارەی پیلانی کوشتنی گورگین خان بڕوانە: عباس قدیانی، منبع پیشین، ص ٨٥" حبیب الله شاملوئی، تاریخ ایران از ماد تا پهلوی، چاپ اول، انتشارات صفیعلیشا، تهران، ١٣٤٧ه.ش، ص ٦٦٤" محمد شفیع **طهرانی، منبع** پیشین، **ص١١٣.**

دەربارییانی سەفەوی بەناوی محەمەد جامی خان وەك نوێنەری شا حوسێن چوو بۆ قەندەهار بەمەبەستی گەیاندنی پێشنیازی شا حوسێن[100]، کەبرێتی بوو لە گوێڕایەڵبوونی میر وەیس بۆ دەوڵەتی سەفەوی[101].

دوا بەدوای ئەوەی میر وەیس گەیشتە ئەو بڕوایەی کە هێزەکانی دەتوانێ بەرپەرچی هێزی سەفەوی بداتەوە، بۆیە ئەم دەست پێشخەرییەی ڕەتکردەوە، چونکە شارەزای لاوازی و خراپی بارودۆخی دەوڵەتی سەفەوی بوو[102]، بۆیە دوای رازی نەبوونی میر وەیس بە دەست پێشخەرییەکانی دەوڵەتی سەفەوی شا حوسێن ناچاربوو داوا لە خسرۆ خان فەرمانڕەوای جۆرجیا بکات بۆ گەڕاندنەوەی قەندەهار و دەرپەڕاندنی میر وەیس[103]، بۆ ئەم مەبەستەش خسرۆ خان بەلەشکرێکی زەبەلاحی سێ هەزار سەربازی لە ساڵی ١٧١١ز گەیشتە قەندەهار و دەستیکرد بەگەمارۆدانی، هەروەها توانی لە سەرکەوتنی بەسەر میر وەیس نێزیك ببێتەوە و وا لە هێزی ئەفغانەکان بکات ئامادەی خۆبەدەستەوەدان بن[104]، بەڵام هەڵەیەکی مێژوویی، کە خسرۆ خان ئەنجامیدا، هاوکێشەکەی لە سەرکەوتنێکی حەتمی بۆ دۆڕاندنێکی چاوەڕواننەکراو گۆڕی، ئەو هەڵەیەش برێتی بوو لە نەدانی هیچ زەمانەتێك بەخەڵکەکە ئەگەر خۆیان ڕادەستی هێزی سەفەوی بکەن، هەروەها لەو ماوەیەشدا میر وەیس توانی پێوەندیی لەگەڵ (بلوجەکان)[105] بکات و یارمەتی و کۆمەکیان لێ وەربگرێت[106].

---

(١٠٠) عباس پرويز، منبع پيشين، ص ٣٦ .

(١٠١) عباس قدياني، منبع پيشين، ص٨٦.

(١٠٢) حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص٥٥.

(١٠٣) عبدالحسين زرين كوب، منبع پيشين، ص٧٣٣.

(١٠٤) راجر سيوری، منبع پيشين، ص٢٤٣" حاج ميرزا حسن حسينی فسائی، منبع پيشـين، ص٤٩٥"محمد **كاظم** مروی وزير مرو، منبع پيشين، ص ص١٩-٢٠.

(١٠٥) زۆرینەی دانیشـتوانی ئـەو هەرێمـە موسـڵمانی سـونە ئـاینزان، رووبەرەکـەی نێزیکـەی ٣٤٧,١٨٨ کیلومەتر چوارگۆشەیە، هەرێمی بلوجستان درێژ دەبێتەوە لە پاکستان و دەکەوێتە بەشی باشـوور و باشـووری ڕۆژهەڵات هەر یەکە لەئێران و ئەفغانستان، بەشێوەیەك لە باشووری دەریای هیندییەوە، لەڕۆژهـەڵاتی سـند، ئەفغانستانیش لەباکوری، هەروەها مەکران و لارستان دەکەونە ڕۆژئاوای، دانیشتووانانی ئـەو هەرێمـە چـەند

ئەفغانەکان دوای دڵنیابوونیان لە نەبوونی هیچ زەمانەتێك بەتوندترین شێوە دەستیانکرد بەبەرگرییکردن لە قەندەهار، بەشێوەیەك لە بەرگرییکار بوون بە هێرشبەر توانیان شکست بە سوپای سەفەوی بهێنن و خسرۆ خانی سەرکردەی سوپای سەفەویش لەم جەنگەدا بکوژن[١٠٧]، دوو ساڵ دواتر هێرشێکی دیکە بە**سەرکردایەتیی** رۆستەم خان بۆ سەر قەندەهار کرا، بەڵام چارەنووسی ئەم هێزەش شکان و لەناوچوون بوو[١٠٨] لە کۆتاییدا میر وەیس بوو بەمیرێکی سەربەخۆ دوور لە دەسەڵات و هەژموونی دەوڵەتی سەفەوی تاکو مردنی لە ساڵی ١٧١٥ز[١٠٩].

لە دوای مردنی میر وەیس لەساڵی ١٧١٥ز، عەبدوڵای برای توانی فەرمانڕەوای هۆزی غەلزائی بۆ خۆی قۆرخ بکات، دوای دوورخستەوەی مەحمود کوڕە گەورەی میر وەیسی جێنیشینی راستەقینە، کە ئەو کات تەمەنی ١٢ ساڵن بوو[١١٠]، میر عەبدو**ڵا** لە یەکەمین هەنگاویدا هەڵسا بەپێڕەوکردنی سیاسەتێکی نەرمونیان لەگەڵ سەفەوییەکاندا بەتایبەت لە ساڵی ١٧١٦ز رازی بوو بەئەنجامدانی ئاشتی و مانەوەی لەژێر رکێفی دەسەڵاتی سەفەوی بە چەند مەرجێك، کە دواتر ئەو نێزیکبوونەوەیە بووە هۆکارێك لەلایەن میر مەحمودی برازای لەهەمان ساڵدا بکوژرێت[١١١] .

---

نەتەوەیەکی جیاواز لەخۆ دەگرێت لەوانە فارس، هیند و تەتار، ئەفغان و کورد. بۆ زانیاریی زیاتر بگەڕێوە بۆ:

**فیض** محمد کاتب هزاره، سراج التواریخ، جلد اول، **مطبعه** حروفی دار **السلطنه**، کابل، ١٣٣١، ص٨ "

The New Encyclopaedia Britannica,1973-1974,Volume 2,PP. 677-678.

(١٠٦) محمد جواد مشکور، منبع پیشین، ص ٢٩١ .

(١٠٧) حسن کریم جاف، المصدر السابق، ص ٥٦"

P. SYKES, Op. Cit, p.310.

(١٠٨) **ادوارد براون، منبع** پیشین، **ص ١٣٢.**

(١٠٩) احمد پناهی سمنانی، منبع پیشین، ص٥٧. ئەم بنەماڵەیە لە مێژووی ئەفغانستان ناسراون بە زنجیرە پادشاهی هوتکی کە بەدەسەڵاتی میر وەیس دەست پێ دەکات و بە شا حوسێن کۆتایی دێت ( ١١٢١ه.ق — ١١٥١ه.ق) . بصیر احمد دولت ابادی، منبع پیشین، ص٢٠٣.

(١١٠) حسن کریم جاف، المصدر السابق، ص٥٦.

(١١١) ن.و.بیکولوسکایا و دیگران، منبع پیشین، ص٥٨٠ . سەبارەت بە مەرجەکانی میر عەبدوڵا لەگەل دەوڵەتی سەفەوی بگەڕێوە بۆ:

Krusinski., Op.Cit, Volume. I , P204"P. SYKES, Op. Cit, p.310.

سەرکەوتنی هۆزی غەلزائی جێگیربوونی دەسەڵاتیان لە قەندەهار لەلایەك و لاوازی دەوڵەتی سەفەوی لە ڕووی سیاسی و سەربازی لەلایەکی دیکەوە بوونە هۆکار بۆ ئەوەی شۆڕش و **ڕاپەڕین** لەچەند ناوچەیکی دیکەش ڕووبدات، لەوانە هۆزی ئەبدالی بە**سەرکردایەتیی**ی ئەسەدوڵا خان توانیان هەرات داگیر بکەن(١١٢)، لەو بارودۆخەدا هێزی سەفەوی بە**سەرکردایەتیی**ی سەفی قلی خان ناسراو بەدێوانە دوای سەرکەوتنی بەسەر شیرغازی خانی ئۆزبەکی لە خۆراسان(١١٣)، خۆی ئامادەکرد بۆ جەنگکردن دژ بەئە**فغانە**کان و توانی تا ڕادەیەك ڕووبەڕووی شۆڕشگێرانی ئەبدالی بوەستێتەوە(١١٤)، بەڵام بێهێزی سوپا و نەمانی متمانە و کارکردن لەسەر بنەمای **بەرژەوەندییە**کان، ئاکامەکەی دۆڕاندنی سوپای سەفەوی لێ کەوتەوە، کە تێیدا سەفی قلی خان لەلایەن ئەبدالییەکانەوە کوژرا(١١٥).

بەگژیەکداچوونی هۆزە سەرەکییەکانی ئەفغانی بەتایبەت ململانێی نێوان هۆزی غەلزائی بە**سەرکردایەتیی**ی میر مەحمود لەگەڵ هۆزی ئەبدالی بە**سەرکردایەتیی** ئەسەدوڵا خان جارێکی دیکە چانسی بەدەوڵەتی سەفەوی دایەوە بۆ ئەوەی هەژموونی خۆی بەسەر قەندەهار و هەرات بگەڕێنێتەوە و بیخاتەوە ژێر شکۆی دەوڵەتی سەفەوی، بەڵام ئەم هەلە لەلایەن شاحوسێن بەهەند وەرنەگیرا و پشتگوێی خست، لە جیاتی دانانی ڕێوشوێنی تایبەت بەچارەسەرکردنی کێشەکان بڕیاری چوونە دەرەوەی دا لە ئەسفەهان بۆ بەسەربردنی کات، لەو **هەلومەرجە**شدا میرمەحمود توانی لە ساڵی ١٧١٨ز زاڵ بێت بەسەر ئەبدالییەکان و دەسەڵاتی بەسەر تەواوی ئەفغانستان بسەپێنێت(١١٦).

---

دەربارەی هۆکارەکانی کوژرانی بڕوانە: احمد پناهی سمنانی، منبع پیشین، ص٥٨"بهنام محمد پناه، منبع پیشین، ص ١٨٤.

(١١٢) ادوارد براون، منبع پیشین، ص ١٣٣.

(١١٣) دەربارەی جەنگی سەفی قلی خان لەگەل شیر غازی بڕوانە: میرزا عبدالنبی شیخ الاسلام بهبهانی، بدایع الاخبار ( وقائع بهبهان در زمان حمله مەحمود افغانی)، مقدمه و تصحیح و **توضیحات:** سید سعید میر محمد صادق، مرکز پژوهشی **میراث** مکتوب، تهران، ١٣٨٩هـ.ش، ص ص١٠٨-١٠٩.

(١١٤) عبدالحسین نوایی، عباسقلی غفاری فرد، منبع پیشین، ص٢٦٦-٢٦٧" عباس پرویز، منبع پیشین، ص٣٧.

(١١٥) ادوارد براون، منبع پیشین، ص ١٣٣.

(١١٦) عبدالحسین زرین کوب، منبع پیشین، ص ٧٣٤.

**سەبارەت** بەدەست پێکردنی ململانێ لە نێوان هۆزی ئەبدالی و هۆزی غەلزائی دەگەڕێتەوە بۆ لەخۆباییبوونی ئەسەدولا خانی ئەبدالی لە دوای سەرکەوتنەکانی بەسەر هێزی سەفەوی، هەروەها پلان دارشتنی بۆ دەستگرتن بەسەر قەلاَی (فراە) کە بەدەست هێزەکانی غەلزائی بوو، پاش هێرشکردنە سەر قەلاَکە دەستی بەسەرداگرت، ئەم کارەی ئەبدالییەکان میر مەحمودی غەلزائی زۆر نارەحەت کرد، بۆیە بڕیاری گەڕاندنەوەی قەلاَکەی دا لەگەلَ تۆلّەکردنەوە لە ئەنجامدەرانی ئەو کارە [١١٧]، بۆ ئەم مەبەستە هێزەکانی غەلزائی **بەسەرکردایەتیی** میر مەحمود پێشڕەویان کرد بۆ گرتنەوەی قەلاَکە، بەلاَم ئەسەدولاَخانی ئەبدالی لە ناوچەی دلارام ڕووبەڕووی هێزەکانی غەلزائی دەبێتەوە، دوای شەڕێکی سەخت ئەبدالییەکان شکستیان خوارد و ئەسەدولاَخانی ئەبدالییش کوژرا[١١٨].

## ب – داگیرکردنی ئێران لەلایەن ئەفغانەکان ١٧٢١ – ١٧٢٢

لاوازی و سیستی دەسەلاَتی سەفەوی، سەرکەوتنەکانی میر مەحمودی ئەفغانی هەردووکیان بەیەکەوە ڕێگە خۆشکەربوون بۆ میر مەحمودی ئەفغانی بیر لە هێرشکردن بکاتەوە بۆ سەر ئێران و بکەوێتە هەولّ بۆ بەدەستهێنانی تەخت و تاجی ئێران[١١٩].

دوا بەدوای سەرکەوتنەکانی میر مەحمود و جێگیربوونی دەسەلاَتی بەسەر تەواوی ئەفغانستان، دەولّەتی سەفەوی لە هەموو بوارەکاندا بەقۆناخی لاوازیدا دەڕۆیشت، هەروەها ئیمپراتۆرییەتی مەغۆلی هیندیش هەمان چارەنووسی تووش هاتبوو بەتایبەتی دوای مردنی ئەورەنگ زیب لە سالّی ١٧١٧ ز خوازیارانی تاج و تەختی پادشایەتی کەوتبوونە ململانێی شەڕوشۆڕ، ئەمەش ڕێگە خۆشکەر بوو بۆ میر مەحمود ئەگەر پەلاماری ئێران بدات دلّنیا دەبێت لەوەی کە لەلایەن هێزەکانی مەغۆلی هێرشی ناکرێتە سەر[١٢٠].

---

(١١٧) عبدالحسین نوایی، عباسقلی غفاری فرد، منبع پیشین، ص ٢٦٧.

(١١٨) همان منبع، ص ٢٦٧ .

(١١٩) محمد جواد مشکور، منبع پیشین، ص ٢٩١.

(١٢٠) راجر سیوری، منبع پیشین، ص ص ٢٤٥-٢٤٦.

میر مەحمود بەهێزێکی یازدە هەزار سەربازییەوە لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٧٢٠ز لە ڕێگەی سیستان ڕێگەی گرتەبەر بەرەو ناوەوەی ئێران و هێرشی کردە سەر کرمان بەبێ بەرگریی توانی ئەم شارە داگیر بکات[١٢١]، چەند مانگێك لەکرمان مایەوە، بەڵام دواتر بەهۆی بڵاوبوونەوەی دەنگۆی سەرهەڵدانی شۆڕش لە قەندەهار، بۆیە بڕیاری گەڕانەوەی دا بۆ ئەفغانستان[١٢٢]، هەر لەو ساڵەشدا عومانییەکان توانیان دوورگەی قشم و چەند دوورگەیەکی دیکە لە کەنداو[١٢٣] لە چەنگی سەفەوییەکان دەربهێنن[١٢٤]، هەروەها

)121 ( P. SYKES, Op. Cit, p.312.

(١٢٢) عبدالحسين نوايي، عباسقلي غفاري فرد، منبع پيشين، ص ٢٧٠ .

(١٢٣) ناوی کەنداو لە چەرخە کۆنەکاندا بەتایبەت لە میلە هەڵکەندراوە ئەکادییەکان بە دەریایی نزم یاخود دەریای تاڵ هاتووە، بۆ یەکەمین جاریش لە سەردەمی ئەسکەندەری مەکدۆنی ئەم کەنداوە بەکەنداوی فارس ناوی بردووە، هەروەها کەنداوی فارسی زیاتر باو بووە لەلایەن ئەورووپییەکان و جیهانی ئیسلامی، چونکە بەشێوەیەکی گشتیی پشتیان بەستووە بەوەرگێڕدراوی جوگرافیای بەتلیمۆس ،کە ئەویش بەکەنداوی فارس ناوی بردووە، دواتر ئەم ناوە بەردەوام بووە، لەلایەکی دیکەوە لەسەدەی یەکەمی زاینی مێژوونووسی ڕۆمانی پلینی ٦٢ -١١٣م ناوی کەنداوەکەی بەکەنداوی عەرەبی هێناوە، بەڵام لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی ناوەکەیان گۆڕی بۆ کەنداوی بەسرە، لەلایەکی دیکەوە دانیشتووانانی ئەحسا بەکەنداوی قەتیف ناویان هێناوە، تاکو ئێستە سەبارەت بەناوی کەنداو مشتومڕی زۆری لەسەرە و یەکلایی نەکراوەتەوە، چونکە سرووشتێکی سیاسیی وەرگرتووە، لەلایەن ئێرانییەکان بەکەنداوی فارس دادەنرێت، بەڵام وڵاتانی عارەبی کەنداو بە کەنداوی عارەبی دادەنێت، سەبارەت بەجوگرافیای ناوچەکە، کەنداو دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای کیشوەری ئاسیا، دەکەوێتە سەر هێڵی پانی ٢٤-٣٠ پلە باکور، هەروەها هێڵی درێژی ٤٨-٥٠ پلە ڕۆژهەڵات، شاری بەسرە دەکەوێتە باکوری و وڵاتی کوێت لەباکوری ڕۆژئاوای، هەریەکە لە بەحرێن و قەتەر و ناوچەی ئەحسای عارەبستانی سعودیە لە ڕۆژئاوا، هەروەها باشوور و باشووری ڕۆژئاوا دەوڵەتی ئیمارات و تەنگەبەری هورمز و کەنداوی عومان، ئێرانیش دەکەوێتە ڕۆژهەڵات وباکوری ڕۆژهەڵاتی: **قدری قلعجی، الخليج العربي، الطبعة الثالثة، شركة المطبوعات للتوزيع والنشر، بيروت، ١٩٩٥م، ص ص٧-٨ " صبري فارس الهيتي، الخليج العربي دراسة في الجغرافية السياسية، دار الرشيد، بغداد، ١٩٧٨م، ص ص٧-٨" مصطفى عبدالقادر النجار و اخرون، المصدر السابق، ص٧-٨.**

(١٢٤) **عبدالاميرمحمد امين، اضواء جديدة على تاريخ الخليج العربي الحديث، المجلة التاريخية، تصدرها الجمعية العراقية للتاريخ والاثار، العدد(١)، السنة الاولى، مطبعة اسعد، بغداد، اب ١٩٧٠م ، ص٨٨.**

**ڕاپەڕینە**کانی لورستان و کوردستان دژ بەدەسەڵاتی سەفەوی و ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی لەلایەن مەلیك مەحمود سیستانی(١٢٥) فەرمانڕەوای مەشهەد (١٢٦).

سەرەڕای بوونی پیلان و ڕکابەری لەناو دەرباری سەفەوی بەتایبەت لەنێوان فەتح عەلی خانی داغستانی وەزیری ئەعزەم(١٢٧) و مەلاباشی(١٢٨)، کۆمەڵێك بەڵگەی ئاشکران کە لاوازی دەوڵەتی سەفەوی دەردەخەن و ئەو بۆچوونانەش ڕەتدەکەنەوە، کە گوایە میر مەحمود لە ئەنجامی شکستخواردنی بەرامبەر بە سوپای سەفەوی لە کرمان پاشەکشەی کردبێت(١٢٩).

لەساڵی ١٧٢٠ز فەتح علی خان داغستانی لە هەوڵی زۆر دابوو بۆ گەڕاندنەوەی هەرات و قەندەهار بۆ ژێر رکێفی دەوڵەتی سەفەوی، بەڵام بوونی مەلا باشی وەك رکابەرێکی توند لە دەرباری سەفەوی دژ بە فەتح عەلی خانی وەزیر ئەم بیرۆکەیە سەری نەگرت(١٣٠)، چونکە توانی باوەڕ بە شاحوسێن بهێنێت کە فەتح عەلی خان داغستانی بەنیازە سەری بخاتە گۆمەوە، بەڵام لەراستیدا ئەم پیلانەی دەربار لە سەرووی

---

(١٢٥) لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی شا حوسێن وەك فەرمانڕەوای سیستان دەستنیشانکرابوو، خۆشـی دەگەڕانـدەوە بـۆ زنجیرەی بنەماڵەی سەفارییەکان، لەگەڵ هێرشی ئەفغانەکان بۆ سەر ئێران، سـەربەخۆیی خـۆی ڕاگەیانـد، پاشـان هەڵسـا بەلێدانی پارە و خوێندنەوەی وتاری هەینی بەناوی خۆی. مهدی بامداد، شرح حال رجال ایـران درقـرن ( ١٢ و ١٣ و ١٤ هجری)، جلد چهارم، چاپ دوم، انتشارات زوار، تهران، ١٣٥٧هـ.ش، ص ص١٥٤-١٥٥.

(١٢٦) لکهارت، نادر شا، ترجمە اقتباس: مشفق همدانی، چاپخانەی شرق، تهران، ١٣٣١هـ.ش، ص ص١٥-١٦.

(١٢٧) وەزیری ئەعزەم بەرامبەر پۆستی سەدر ئەعزەمە لە دەوڵەتی عوسمانی، لە دوای شـا دووەمـین پۆسـتی گەورەی دەوڵەتە.

(١٢٨) گەورەترین پۆستی ئاینییە لەناو دەوڵەتی سەفەی و هاوتایە لەگەڵ پۆستی شەیخولئیسلام لە دەوڵەتی عوسمانی.

(١٢٩) لەبارەی گەڕانەوەی میر مەحمود بۆ قەندەهار لەلایەن هەندێك لە **مێژوونووسـان** ڕاڤـەی جیـاوازی بـۆ کراوە، پێیان وایە هۆکاری گەڕانەوەکەی سەرهەڵدانی شۆڕش نەبووە لە قەندەهار، **بگرە** شکسـتخواردنی مـیر مەحمود بوو لە بەرامبەر سوپای سەفەوی و ناچار کرا، کە پاشەکشە بکات بەرەو قەندەهار. بۆ زانیـاریی پـتر بڕوانە: علی اکبر بینا، تـاریخ سیاسـی دبلوماسـی ایـران، جلـد اول، چـاپ سـوم، تهـران، ١٣٤٣هـ.ش، ص ١٦"علی **مظهر**، تاریخ افغانستان، قاهرە، ١٩٥٠م، ص٦٣ .

(١٣٠) ادوارد براون، منبع پیشین، ص ١٣٣ .

هەمووشیانەوە مەلا باشی دژ بە بیرۆکەی فەتح عەلی خان داغستانی بەسەرەتای کۆتایی دەوڵەتی سەفەوی دادەنرێت[١٣١].

هۆکاری ئەو دووبەرەکییە لە نێوان **محەمەد** حوسێن مەلاباشی و فەتح عەلی خان داغستانی دەگەڕێتەوە بۆ پلەوپایەی **فەتح** عەلی خان داغستانی، کە ببووە جێگەی باوەڕی شاحوسێن سەرەڕای ئەوەی **سونە** ئاینزا بووە، هەروەها ئەم وەزیرە ئاینزا **سونە**یە توانی داوا لە لوتف عەلی خانی برازای بکات، کە فەرمانڕەوای فارس بوو سوپاکەی ئامادە بکات و بەرەو خۆراسان **جووڵە** بکات بەمەبەستی گەڕاندنەوەی هەرات و قەندەهار[١٣٢]، ئەم کارەی وەزیری ئەعزەم لەلایەن گەورە بەرپرسانی دەربار بووە جێگەی ئیرەیی، سەرەڕای **سونە** بوونی و یەکێك بووە لە **خانەدانەکانی** لزگی[١٣٣]، بۆیە دەسەڵاتدارانی دەربار، توانیان باوەڕ بە شاحوسێن بکەن کە **فەتح** عەلی خان دەستی هەیە لە یارمەتیدانی شۆڕشگێرانی لزگی و تۆمەتباریان کرد بەناپاکیکردن بەرامبەر بە دەوڵەت[١٣٤].

لە هاوینی ساڵی ١٧٢١ز میر مەحمودی ئەفغانی پاش زاڵبوونی بەسەر شۆڕشگێڕان و گەڕاندنەوەی سەقامگیری بۆ قەندەهار دووبارە لە دەشتی لووتەوە ڕوویکردە ناو خاکی ئێران بەئاراستەی کرمان[١٣٥]، بەڵام بەرەنگاربوونەوەکانی (ڕۆستەم **محەمەدی** سعدلوو)ی فەرمانڕەوای کرمان داگیرکردنەکەی دواخست تا ئەو کاتەی ڕۆستەم **محەمەد** دەمرێت و جێنشینەکەی شاری کرمان رادەستی میر مەحمودی ئەفغانی دەکات[١٣٦].

---

(١٣١) عبدالحسين زرين كوب، منبع پیشین، ص ٧٣٦.

(١٣٢) ادوارد براون، منبع پیشین، ص ١٣٣.

(١٣٣) ن.و.بيكولوسكايا و ديگران، منبع پیشین، ص٥٨١.

(١٣٤) لارنس لاكهارت، **انقراض** سلسله...، ص١٠٣" بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ململانێی و رکابەرییەکانی دەربار لە سەرووی هەمووشیان مەلاباشی و چارەنووسی فەتح عەلی خان بڕوانە: حاج ميرزا حسن حسينی فسائی، منبع پیشین، ص٤٩٦ " **مرتضی** راوندی، تاريخ اجتماعی ايران، جلد٤، پخش اول، انتشارات نگاه، تهران، ١٣٨٢هـ.ش، ص ص٣٧٩-٣٨٠.

(١٣٥) حاج ميرزا حسن حسينی فسائی، منبع پیشین، ص٤٩٧.

(١٣٦) عبدالحسين نوايی، عباسقلی غفاری فرد، منبع پیشین، ص ٢٧٠.

دوای گرتنی کرمان لەلایەن میر مەحمودی ئەفغانی بەرەو یەزد بەڕێکەوت، بەڵام بەهۆی بوونی لافاو نەیتوانی دەستی بەسەر دابگرێت و بەناچاری ڕووی لە ئەسفەهان کرد، لە ڕێگەدا چاوی کەوت بەشاندی دەوڵەتی سەفەوی داوایان لێکرد ئامادەن سێ هەزار لیرەی پێ بدەن، لە بەرامبەر ڕاگرتنی شەڕ و گەڕانەوەی بۆ قەندەهار، [١٣٧] بەڵام میر مەحمود پێشنیازەکەی ڕەتکردەوە و زیاتر سووربوو لەسەر پێشڕەوییەکانی بەرەو ئەسفەهان، چونکە گەیشتە ئەو بڕوایەی، کە ئەو پێشنیازە بەڵگەیە بۆ لاوازی و نەمانی توانای دەوڵەتی سەفەوی [١٣٨].

پاش ئەوەی میر مەحمود پێشنیازەکەی ڕەتکردەوە ڕێگەی گرتەبەر بەرەو ئەسفەهان لە نێزیك گلناباد بەدووری چوار فەرسەخ (١٢میل) لە ڕۆژهەڵاتی ئەسفەهانەوە سوپاکەی وەستاند [١٣٩]، هەرچەندە سوپای ئەفغانی بەهۆی ئەو بەرگرییە زۆرانەی کە لە شارەکانی کرمان و یزد بەرامبەریان کرابوو، بارودۆخەکەی زۆر دڵخۆشکەر نەبوو، کە بتوانێ لەو جەنگە سەرکەوێت [١٤٠]، بەڵام بارودۆخی ناوەخۆیی ئێران لەبەرژەوەندی ئەفغانەکان بوو تەنانەت سرووشتیش یارمەتی ئەفغانەکانیدا، بەشێوەیەك بوومەلەرزە چەند ناوچەیەکی گرتەوە و زیانی پێگەیاندن کە خەڵکەکە هاتنە سەر ئەو ڕایەی کە هێرشەکانی ئەفغانی و بومەلەرزە تۆڵەسەندنەوەیەکی خودایە لەسەریان [١٤١].

شاحوسێن گەیشتە ئەو بڕوایەی کە شەڕکردن لەگەڵ ئەفغانەکان بۆتە کارێکی حەتمی، بۆیە داوای لە فەرمانڕەوایانی دەربار کرد بەچ جۆرێك ڕووبەڕووی هێرشبەرانی ئەفغانی بێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە سەردارانی سەفەوی بوونە دوو دەستە، هەندێکیان پێیان وابوو لەناو شاری ئەسفەهان بمێننەوە و بەرگریی لێ بکەن، لەلایەکی دیکەوە دەسەتەیەکی دیکە بە ڕابەرایەتی والی خۆزستان (شێخ محەمەد عەلی حەزین) پێیان وابوو

---

)137 ( P. SYKES, Op. Cit, p.314.

(١٣٨) عباس پرويز، منبع پيشين، ص٣٩ .

(١٣٩) عباس اقبال اشتيانى، تاريخ مفصل ايران از صدر اسلام تـا **انقـراض** قاجاريـه، بكوشـش:محمد دبـير سياقى، انتشارات كتابخانه خيام، تهران، ١٣٤٦هـ.ش، ص٧٠٥.

(١٤٠) حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص ٥٧ .

(١٤١) ادوارد براون، منبع پيشين، ص ١٣٣ .

کە لە دەرەوەی شار لەگەڵ ئەفغانەکان بجەنگن[١٤٢]، دواتر هەر ئەو بۆچوونەش سەری گرت کە ناوبراو دایڕشتبوو، بۆیە پاش یەکلاکردنەوەی بابەتەکە سوپای سەفەوی بەرەو ناوچەی گلناباد بەڕێکەوت [١٤٣].

لە ٨ی ئازاری ساڵی **١٧٢٢**ز هەردوو سوپا لە گلناباد ڕووبەڕووی یەك بوونەوە، هەرچەندە لە ڕووی تەکنیکی سوپاوە هێزی سەفەوی زۆر پێشکەوتووتر بوو[١٤٤]، بەڵام بوونی ناکۆکیی لەنێوان سەردارانی هاوبەشی سەفەوی واتە وەزیر و فەرمانڕەوای خوزستان لەلایەك و لێهاتووی ئەمانولا خان فەرماندەی هێزی ئەفغانی، ئەگەری بەزینی سوپای ئەفغانی بۆ سەرکەوتن گۆڕی[١٤٥]، و ئەفغانەکان توانیان دەست بگرن بەسەر (فرح ئاباد)ی بارەگەی هاوینی شا حوسێن [١٤٦]، هەر لە هەمان ڕۆژدا دەیانتوانی دەست بەسەر ئەسفەهان دابگرن، بەڵام مەترسی ئەفغانەکان لەوەدابوو نەوەك هێزێکی یەدەگی سەفەوی لە ئەسفەهان لەئامادەباشی دابن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان، بۆیە لە دەوروبەری ئەسفەهان بڕیاری گەمارۆدانی شارەکەیاندا[١٤٧].

دوای شکستخواردنی سوپای سەفەوی، میر مەحمود ئەفغانی چەند پێشنیازێکی وەك مەرج بۆ ئاشتیکردن خستە بەردەم شا حوسێن، لەوانە دەسبەرداری قەندەهار و سیستان و خۆراسان بێت بۆی، هەروەها بڕی پەنجا هەزار تومان وەك قەرەبووی جەنگ بدات، دواتریش کچی خۆی پێ بدات، بەڵام ئەم داوایانە لەلایەن کاربەدەستانی دەوڵەتی

---

(١٤٢) مەحمودی **طلوعي**، خواندنیهای تاریخی، چاپ چهارم، نشر علم، تهران، **١٣٧٧** ه.ش، ص ٥٢.

(١٤٣) عبدالحسين زرين كوب، منبع پيشين، ص ٧٣٧ .

)144 ( Michael Axworthy,(( The Army of Nader Shah)),Iranian Studies, Institute of Arab and Islamic Studies at the University of Exeter, volume. 40, number 5, London, December 2007, P.637.

(١٤٥) راجر سيورى، منبع پيشين، ص ٢٤٨"منوچهر پارسا دوست، زمينەهای تاریخی اختلافات ایران وعراق، شرکت سهامی انتشار، تهران، ١٣٦٤ه.ش، ص٤٧.

(١٤٦) محمد جواد مشكور، منبع پيشين، ص ٢٩٢"بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ڕەوت و پەرەسەندنەکانی جەنگی گلنباد، بڕوانە: حاج میرزا حسن حسینی فسائی منبع پیشین، ص٤٩٨.

(١٤٧) محمد جواد مشكور، منبع پيشين، ص ٢٩٢.

سەفەوی ڕەتکرایەوە، هەربۆیە گەمارۆدانی شاری ئەسفەهان لەلایەن ئەفغانەکانەوە توندتر کرا[١٤٨].

ئابلۆقەدانی شاری ئەسفەهان نێزیکەی نۆ مانگی خایاند، بەشێوەك قاتوقڕی لەناو پایتەختدا بڵاوبۆوە کاریگەریی توندی خستەسەر خەڵکە گەمارۆدراوەکە، بەشێوەیەك خەڵك ئامادەبوو پەنابەرێتە بەر خواردنی سەگ و پشیلە، تەنانەت سەربڕینی منداڵیش کارێکی ئاسایی بووە[١٤٩]، خراپی بارودۆخی مرۆیی لەناو شاری ئەسفەهان وای لە شا حوسێن کرد، کە هەنگاوێك هەڵبنێت بۆ رزگارکردنی خەڵك لەو نەهامەتییە، بۆیە لە ١٢ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٧٢٢ز لەژێر گوشاری خەڵك بڕیاری خۆبەدەستەوەدانیدا، لەگەڵ کۆمەڵێك لە کەسایەتی و کاربەدەستانی دەوڵەتی سەفەوی[١٥٠].

جێگەی ئاماژە پێکردنە لە ساڵی ١٧٢٢ز مەلیك مەحمود سیستانی کە فەرمانڕەوایی سیستانی دەکرد بەسوپایەکی ١٠ هەزار سەربازی ڕوویکردە ئەسفەهان بەمەبەستی یارمەتیدانی گەمارۆدراوانی شاری ئەسفەهان، بەڵام بەر لەگەیشتنی بۆ ئەسفەهان میر مەحمودی ئەفغانی توانی لە ڕێگەی پێدانی دیاری، هەروەها بەڵێنی پێدا کە فەرمانڕەواییەتی خۆراسانی پێ ببەخشێت، بۆیە مەلیك مەحمود پاشگەزبۆوە و گەڕایەوە سیستان[١٥١].

دوای ئەوەی شا حوسێن بێ هیوا بوو لە گەیشتنی یارمەتییەکانی تەهماسب میرزا ١٧٠٤-١٧٤٠ لە قەزوین، کە سێ مانگ بەر لەداگیرکردنی ئەسفەهان لەلایەن ئەفغانەکانەوە وەك جێنشین دیاری کرابوو، توانی لەکاتی گەمارۆیەکەدا ئەسفەهان جێ بهێڵێت و بڕوات بەرەو قەزوین بەمەبەستی کۆکردنەوەی هێز بۆ رزگارکردنی پایتەخت،

---

(١٤٨) ن.و.بیکولوسکایا و دیگران، منبع پیشین، ص ٥٨٢ .

(١٤٩) لەبارەی بارودۆخی خەڵکی ئەسفەهان لەکاتی گەمارۆی ئەفغانەکان بڕوانە: احمد پناهی سمنانی، منبع پیشین، ص ص٦١-٦٢" **محمد کاظم** مروی وزیر مرو، منبع پیشین، ص ص٢٨-٢٩"میرزا عبدالنبی شیخ الاسلام بهبهانی، منبع پیشین، ص ص٢٢-٢٤.

(١٥٠) مریم میراحمدی، منبع پیشین، ص ٩٦ " **تاد یوز یودا کروسینسکی،** منبع پیشین، ص**٥٦.**

(١٥١) مهری ادریسی اریمی، فتحلی خان قاجار از شاه **سلطان** حسین تا نادر شاه، فصلنامه کنجینه اسناد، شماره ١٥، تهران، پاییز ١٣٧٣هـ.ش، ص٢٣.

بەڵام لە هەوڵەکانیدا سەرکەوتوو نەبوو[١٥٢]، لە هەمان کاتدا خراپبوونی بارودۆخی ناو شاری ئەسفەهان بەهۆی گەمارۆدانە توندەکەی میر مەحمودی ئەفغانی، شا حوسێنی سەفەوی ناچار کرد ڕووبکاتە فەرح ئاباد، لەوێش بەدەستی خۆی تاجی (شا)یەتی لەسەر هێنایە خوارەوە و کردیە سەر میر مەحمودی ئەفغانی، ڕۆژێك دوای ئەم ڕووداوەش میر مەحمود پێی خستە ناو ئەسفەهان و رۆیشتە سەرتەختی دەسەڵات[١٥٣].

میر مەحمودی ئەفغانی لە سەرەتای فەرمانڕەوایەتی هەڵسا بەپێڕەوکردنی سیاسەتێکی نەرم و مام ناوەند بەرانبەر بە خەڵکی ئێران[١٥٤] وەك سزدان هەموو ئەو کەسانەی ناپاکیان بەرامبەر بە شاحوسێن کرد بوو، لە بەرانبەردا لە هەموو ئەوانە خۆشبوو کە بەرگرییان لە شا حوسێن کرد بوو[١٥٥]، هەروەها پەنای بردە بەر هێشتنەوەی هەموو خاوەن پایەکان و کارمەندانی دەوڵەت، لەگەڵ دانانی کەسێکی ئەفغانی وەك چاوەدێر لەداوودەزگەکان، چونکە ئەفغانەکان شارەزایان نەبوو لەبەڕێوەبردنی وڵاتێکی گەورەی وەك ئێران[١٥٦].

سەرەڕای ئەوەش میر مەحمود زوو ئەو بارودۆخەی گۆڕی، کە ئەسفەهان لەکاتی گەمارۆدانەکە تووشی هاتبوو بەتایبەتی زۆر لەوانەی ڕایانکردبوو گەڕانەوە شار و دەستیان بەکارەکانیان کردەوە، (میرمەحمود)یش بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی ئاینزای لە ئەسفەهان، سەد هەزار کەسی سونە ئاینزای لە هەمەدانەوە گواستەوە بۆ ئەسفەهان[١٥٧]، هەرچەندە پێدەچێت ئەو ژمارەیە زیادەڕۆیی تێدا بێت، چونکە ئەگەر توانرا بێت لە هەمەدانەوە سەد هەزار کەس کۆچ پێ بکات بۆ ئەسفەهان، ئایا لەو کاتەدا دەبێت ژمارەی دانیشتووان ئەسفەهان چەند بووبێت.

---

(١٥٢) همان منبع، ص٢٤" میرزا عبدالنبی شیخ الاسلام بهبهانی، منبع پیشین، ص ص٢٢-٢٤.

(١٥٣) مەحمود **طلوعی**، منبع پیشین، ص ٥٥.

(١٥٤) حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص ٥٨.

(١٥٥) محمد جواد مشکور، منبع پیشین، ص ٢٩٢" لارنس لاکهارت، **انقراض** سلسله...، ص١٧٠.

(١٥٦) فریدون اسلام نیا، نگاهی به تاریخ ایران بعد از اسلام، چاپ دوم، حسین اصل، اورومیه، ١٣٨٢ ه.ش، ص ١٨٤ " سرجان ملکم، جلد دوم، منبع پیشین، ص٢.

(١٥٧) مریم میر احمدی، منبع پیشین، ص ٩٥ .

**سەبارەت** بە تەهماسب میرزا ناسراو بە تەهماسبی دووەم، پاش ئەوەی هەواڵی پێدانی تاجی (شا)یەتی لەلایەن باوکی بۆ میر مەحمودی پێ گەیشت خۆی لە قەزوین وەك (شا)ی ئێران ناوزەدکرد[158]، بەڵام سوپای ئەفغانی دوای دەستگرتنیان بەسەر ئەسفەهان، بە**سەرکردایەتیی** ئەمانو**ڵڵا** خان توانیان هەر یەکە لەشارەکانی قوم و کاشان، دواتریش قزوین داگیر بکەن و شا تەهماسب میرزا لە قەزوین بەرەو تەبرێز پاشەکشەی پێ بکەن[159].

دەکرێت بڵێین هەرچەندە میر مەحمود دەستی بەسەر تەختی ئێران داگرت، بەڵام هەموو ئێران نەکەوتە ژێر دەسەڵاتی و نەیتوانی سەروەری خۆی بەسەر تەواوی وڵاتدا بسەپێنێت، هەرچەندە توانیان تەهماسبی دووەم لە قەزوین دەربکەن و بەرەو تەبرێز پاشەکشەی پێ بکەن، بەڵام پاش ئەوە خەڵکی قەزوین لە **راپەڕینێکدا** توانیان ئەفغانەکان لەشار دەربکەن[160].سەرەڕای ئەوەش چەندین **راپەڕین** دژ بە ئەفغانەکان لە ناوچە جیاجیاکانی ئێران وەك کاشان، یزد و خوانسار و شیراز و بەندەر عەباس سەریهەڵدا[161] ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوەی کە ئێرانییەکان سەرەڕای زەبروزەنگی (شا)یەکانی سەفەوی، بەڵام ئامادە نەبوون لەژێر سایەی دەسەڵاتێکی بێگانە ژیان بگوزەرێنن.

---

(١٥٨) حاج میرزا حسن حسینی فسائی، منبع پیشین، ص٥٠١" میرزا مهدی خان استرابادی، دره نادره تاریخ عصر نادر شاه، بااهتمام جعفر شهیدی، تهران، ١٣٤١هـ.ش، ص٧٢٤، لکهارت، نادر شا، ص١٩.

(١٥٩) مریم میر احمدی، منبع پیشین، ص ٩٥ . سەبارەت بە ئەمانوڵڵا دوای داگیرکردنی شارەکانی قوم وکاشان و قەزوین، لەسەر دەسکەوتەکان لەگەڵ مەحمود ئەفغانی کەوتە ململانێ و ڕایگەیاند کە سەر بە پادشای هیندستانە، لە سەرەتادا مەحمود ئەفغانی زۆر گوێی پێ نەدا، بەڵام کاتێك هەستی کرد کە ئەمانوڵڵا خەریکە پێوەندیی دەکات بە تەهماسب میرزا، لە ڕێگەی هەندێك بەڵێنی بریقەدار توانی لە کارەکەی پەشیمانی بکاتەوە و بۆ ئەسفەهان بیگەڕێنێتەوە، لەوێش دەست بەسەری کرد. میرزا عبدالنبی شیخ الاسلام بهبهانی، منبع پیشین، ص ص٢٤-٢٥.

(١٦٠) ن.و.بیکولوسکایا و دیگران، منبع پیشین، ص٥٨٤.

(١٦١) عبدالحسین نوائی، منبع پیشین، ص ١٤.

# بەشی یەکەم

## دەرکەوتنی نادر قوولی خان و بەرزبوونەوەی بۆ دەسەڵات

## ١٧٣٦-١٧٢٧

### تەوەری یەکەم: دەرکەوتنی نادرقوولی خان لە شانۆی ڕووداوەکانی ئێران ١٧٢٧ — ١٧٢٩

### تەوەری دووەم: هەنگاونانی تەهماسب قوولی بەرەو دەسەڵات

### ١٧٣٦-١٧٣٠

## تەوەری یەکەم:

# دەرکەوتنی نادر قوولی لە شانۆی ڕووداوەکانی ئێران ١٧٢٧ – ١٧٢٩

### أ- ژیاننامە و رەچەڵەکی نادر قوولی خان

(نادر قوولی)[١٦٢] لە دەرگزی[١٦٣] خۆراسان لە شوێنێك بەناوی (مەولودخانە) لەنێوان بەرزاییەکانی ئەڵاوئەکبەر[١٦٤] و ناوچەی ئەبیوەرد لە ساڵی١٦٨٨ز لەدایکبووە[١٦٥]،

---

(١٦٢) نادر قوولی لە سەرەتادا ناوی (نادر قوولی) بووە، کە لەلایەن باوکییەوە ناوی لێنراوە وەك گەڕاندنەوەیەك بۆ ناوی باپیری ندر قوولی، بەڵام دواتر لەلایەن فەرمانڕەوای ئەبیوەرد (بابا عەلی) ناوەکەی گۆردرا بۆ (نادر قوولی) بەهۆی ئەو ئازایەتیی و نەبەردیانەی کە دەینواند بەرامبەر هێرشەکانی ئوزبەك کە دەیانکردە سەر خۆراسان. بۆ زیاتر زانیاری: نوراللە لارودی، زندگانی نادرشا پسری شمشیر، مجمع ناشر کتاب، تهران، ١٣١٩ هـ.ش، ص٢٩.

(١٦٣) دەرگز لەکۆندا بە داراگز، نیسیا، نسا (کە یەکەمین پایتەختی ئەشکانییەکان) بووە، هەروەها بەناوی ئاپاوارتاکن و خاواران واتك، ئەبیوەرد نسا ناوبانگی دەرکردووە، سەبارەت بە جوگرافیای ئەو ناوچە ئوزبەکستان و تورکمانستان و ڕووسیا دەکەونە باکوری، کلات دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی، لە باشووریدا قوچان و مەشهەدە، لە ڕۆژئاوای تورکمانستان و ڕووسیایە، هەروەها ٤٥٠ مەتر لەسەر ئاستی ڕووی دەریایە: سید علی میرنیا، ایلات **وطوایف** درگز، جلد دوم، چاپخانەی خراسان، مشهد، ١٣٦٢هـ.ش، ص١٣.

(١٦٤) ئەم شاخە دەکەوێتە باشوور و باشووری ڕۆژئاوای دەرگز بە درێژایی ٧٥کم، هەروەها بەرزی ئەم شاخە نێزیکەی ٢٨٠٤مەترە، هەردوو ڕووباری رودبارسو و دونگر سەرچاوەکەیان لەو شاخەدایە. عباس جعفری،

هەروەها رەچەڵەکی نادر قوولی دەگەڕێتەوە بۆ تیرەی (کرکلو)[166] سەر بەهۆزی (ئەفشار یاخود ئەوشاری) تورکمانی[167]، کە لە ئەنجامی هێرشی مەغۆلەکان تورکستانیان جێ هێشتووە و ڕوویان لە ئازەربایجان کردووە، دواتر لەماوەی حوکمڕانی شا ئیسماعیل گواسترانەتەوە خۆراسان لە ناوچەی ئەبیوەرد نیشتەجێ بوونە[168].

---

گیتاشناسی ایران(کوهاوکوهنامه ایران)، جلد اول، **مؤسسه** جغرافیایی وکارتوگرافی گیتاشناسی، تهران، ١٣٧٩هـ.ش، ص٧٦.

(١٦٥) حبیب الله شاملوئی، منبع پیشین، ص٦٩٨ " کەلیمولاّ تەوەحودی، کۆچی مێژووی کورد بۆ خۆراسان، وەرگێڕان: عەدنان بەرزنجی، بەشی یەکەم، چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٥ز، ل ٧٢. دەست نیشانکردنی ساڵی لەدایکبوونی نادر قوولی لەلایەن **مێژوونووسان** مشتومڕی لەسەرە، عەبدولکەریم کشمیری لە (بیان واقع) ساڵی ١٦٨٧/١٠٩٩هـ دەستنیشانکردووە بۆ لەدایکبوونی نادر قوولی، هەندێکی دیکە پێیان وایە لەدایکبوونەکەی ساڵی ١٦٨٩ز. بۆ زیاتر زانیاریی بگەڕێوە: محمد شفیع تهرانی، تاریخ نادر شاهی(نادر نامه)، باهتمام: **رضا** شعبانی، **مؤسسه مطالعات** و تحقیقات فرهنگی، تهران، ١٣٦٩هـ.ش، ص ٢٦٢ "
Peter Avery and Others(eds.), The Cambridge History of Iran, Volume.7, From Nadir Shah to the Islamic Republic(U.K – Cambridge University press-1991),P.3.

(١٦٦) سەبارەت بەناوی تیرەکە لە سەرچاوەکان بەچەند شێوازێك هاتووە وەك (قرخلو، قرقلو، کرکلو)، هەندێك پێیان وایە(کرکلو) لقێك **نییە** لە هۆزی ئەفشاری، **بگرە** لەبەر لاوازییان چوونەتە ژێر چەتری ئەو هۆزە.بۆ زانیاریی زیاتر بگەڕێوە بۆ: محمد جواد مشکور، منبع پیشین، ص٢٩٧.

(١٦٧) سەبارەت بە زنجیرە پادشایانی ئەفشاری، شوکرەڵا بابان پێی وایە ئەم بنەماڵەیە لە کوردانی هەوشاری دەوروبەری بیجاری کوردستانن، هەروەها کەلیمولاّ تەوەحودی جەخت لەوە دەکاتەوە ئەو ناوچەی کە نادر شا لێی لەدایکبووە کورد و تورکمانی تێدایە و روونی ناکاتەوە، کە ئەم بنەماڵەیە کوردن یاخود تورکمان. شوکرەڵای بابان، مێژووی کورد و کوردستان، چاپخانەی شڤان، سلیمانی، ٢٠٠٤ز، ل١٨٩" کەلیموڵڵای تەوەحودی، سەرچاوەی پێشوو، ل ل٧١-٧١.

(١٦٨) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای نادری، تصحیح:سید عبدالله انوار، انجمن **اثار** ملی، تهران، ١٣٤١ هـ.ش، ص ص ٢٦-٢٧. دیاردەی کۆچپێکردن زیاتر لە سەردەمی شا عەباسی گەورە جێبەجێ کراوە، چونکە (شا)یەکانی پێشووتر لەبەر هۆکاری ناوەخۆیی و دەرەکیی نەیانتوانی بەشێوەیەکی فرەوان ئەم کارە ئەنجام بدەن. بۆ زیاتر زانیاریی بڕوانە: **رضا** شعبانی، تاریخ اجتماعی ایران درعصر افشاری، جلداول، چاپ اول، نشر قومس، تهران، ١٣٧٣هـ.ش، ص ص ٤٢ – ٤٣ " سید علی میرنیا، منبع پیشین، ص ص١٩-٢٠.

نادر قوولی لە بنەماڵەیکی هەژار و سادە چاوی بەدنیا هەڵهێناوە، بۆ ئەم مەبەستە زۆرینەی سەرچاوەکان جەخت لە سادەیی ئیمام قوولی باوکی نادر دەکەنەوە، کە لە ژیانیدا خەریکی کاری پێستە خۆشکەری و بەخێوکردنی مەڕومالآت بووە[169]، هەروەها ژان ئوتەر[170] لە گەشتنامەکەیدا بەپێچەوانەی هەموو بۆچوونەکان جەخت لەوە دەکاتەوە کە نادرقوولی لە بنەماڵەیەکی خاوەن پایە و دەسەلآت چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و باوکی فەرمانڕەوای کەلات بووە لە خۆراسان[171]، هەروەها هەندێك لە سەرچاوە هیندییەکان و نووسەرە ئێرانییە دوورخراوەکانی هیندستان باس لەوە دەکەن، کە نادرخان کوڕی یەکێ لە سەرکردە سەربازییەکانی فەرمانڕەوای ئەبیوەرد بووە[172]، کەچی میرزا مەهدی خان ئەسترئابادی جەخت لەسەر سادەیی ڕەچەڵەکی ئەو بنەماڵەیە دەکاتەوە، بەلآم لە هەمان کاتدا هەوڵ دەدات ڕۆڵی ڕەچەڵەك لەدەرکەوتنی سەرکردە کەم بکاتەوە دەڵێت ((خودا تیژبڕی داوە بەگەوهەر نەك بەئاسن، نازی گەوهەر بەڕەنگ و ئاوی خۆیەتی، نەك بەناواخنی مەعدەن))[173].

(169) Jonas Hanway,The Revolutions of Persia containing History of the celebrated usurper Nadir Kouli, from his Birth in 1687,till his Death in 1747,And Some particulars of the unfortunate reign of his Successor Adel Shah, Volume.IV, London,1753,P3 "George Ripley and Chrles A. Dana, The New American Cyclopaedia:art."Nadir shah" , Volume. XII , New York, 1863, P.84.

(١٧٠) ژان ئوتەر نێردراوی تایبەتی پاشا لویسی پازدەیەمی فەرەنسا بووە، کە لە ساڵی ١٧٣٤ تا ١٧٤٣ز بۆ ماوەی نۆ ساڵ لە ڕۆژهەلآت ژیاوە و لە زۆر ناوچە جیاجیاکانی ئێران گەڕاوە. فریدون شایستە، ایران عصر نادر شا در سفرنامە ژان اوتر، مجلە کتاب ماە تاریخ و جغرافیا، شمارە (٧٧-٧٨)، اسفند١٣٨٢ و فروردین١٣٨٣ه.ش، ص٦٢.

(١٧١) ژان اوتر، سفرنامە ژان اوتر، ترجمە: علی اقبالی، چاپ دوم، ناشر جاویدان، تهران، ١٣٦٦ه.ش، ص١٢٠. لەو بارەیەوە (عەلی ئەقبالی) وەرگێڕی گەشتنامەکە لە پێشەکییەکەیدا هاوڕایە لەگەڵ بۆچوونەکەی ژان ئوتەر، کە پاشماوەی سەفەوییەکان و بنەماڵەی قاجارەکان تاوانبار دەکات بە لەکەدارکردن و کەمکردنەوەی رەچەڵەکی بنەماڵەی نادر قوولی پێی وایە پاشماوەی سەفەوییەکان و بنەماڵەی قاجارەکان ئەو کارەیان ئەنجام داوە وەك تۆڵەکردنەوەیەك، چونکە نادرشا لەلایەك توانی کۆتایی بەبنەماڵەی سەفەی بهێنێت، لەلایەکی دیکەوە لە ڕێگەی پیلانێکەوە کۆتایی بە فەتح عەلی خانی قاجار هێنا. فریدون شایستە، منبع پیشین، ص٦٣.

(172)Peter Avery and Others, Op.Cit, P.5.

(١٧٣) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص٢٦.

سەبارەت بەسەرەتاکانی ژیانی نادر قوولی، چ لە سەرچاوە ئەورووپییەکان یاخود سەرچاوە فارسییەکان زانیاریی ئەوتۆی لەسەر نییە، تەنیا ئەوەی زانراوە کە لە ژیانێکی سەخت و دژوار ژیاوە و یارمەتی دەری باوکی بووە لە فەراهەمکردنی کاری رۆژانەیان[١٧٤]، لە ساڵی ١٧٠٤ز کە ئەوکات نادر قوولی تەمەنی لەدەوروبەری حەڤدە ساڵی دەبوو، ئوزبەکەکان هێرشیان کردە سەر ناوچەی خۆراسان و خەڵکانێکی زۆریان بەدیل گرت، لە نێویشیاندا نادرقوولی و دایکی وەك کویلە دەبردێنە خیوە[١٧٥]، دوای ماوەی چوارساڵ مانەوەیان لەخیوە، دایکی بەکۆیلایەتی دەمرێت و نادرقوولی لە دەرفەتێکدا دەتوانێت خۆی دەرباز بکات و بگەڕێتەوە خۆراسان[١٧٦].

پاش گەڕانەوەی بۆ خۆراسان، نادر قوولی پێوەندیی کردەوە بەهۆزەکەی و بەشداری چالاکانەی نواند لە ململانێی هۆزەکەی لەگەڵ هۆزەکانی دیکەی ناوچەکە لە تورکمان و کورد و ئوزبەك و تەتار، هەروەها نادر قوولی لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا چۆتە ریزی سەربازی لەژێر فەرمانڕەوای بابا عەلی فەرمانڕەوای ناوچەی (ئەبیوەرد)، لەبەر بەهێزی و ئازایەتیی بەتایبەت لەبەرانبەر ئوزبەکەکان نادرقوولی بۆتە خاوەن رێزێکی تایبەت لەلایەن بابە عەلی تا دەگاتە ئەو رادەیەی نازدار خانمی کچی لێ مارەدەکات[١٧٧].

نادر قوولی دەیزانی چۆن ئارەزووەکانی بشارێتەوە، لەهەمان کاتیشدا لە هەوڵدانی بەردەوامدا بووە بۆ بەدیهێنانی ئارەزووەکانی، یەکەمین هەنگاویشی بۆ جێبەجێکردنی ئەو مەرامەی برێتی بوو لەدەستگیرکردنی فەرمانڕەوای کەلات[١٧٨] لە ساڵی ١٧١٩ز،

---

(١٧٤) حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص٨١.

(175)Jonas Hanway,Op.Cit, P.4.

(176)P. SYKES, Op. Cit, p.340.

(١٧٧) حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص٨٢.دوای پێنج ساڵ بەسەر هاوسەرگیرییەکەیان تێدەپەڕێت نازدارخانم دەمرێت و رەزا قوولی میرزا یەکەمین کوڕی نادرقوولییە لەو ئافرەتە، دواتر نادرقوولی هەڵدەستێت بەمارەکردنی (کوهرشاد) خوشکی نازدارخانم، لەو ئافرەتەش، نادرقوولی دەبێتە خاوەنی دوو کوڕ بەناوەکانی ئیمام قوولی و نەسروڵا میرزا. نورالله لارودی، منبع پیشین، ص٢٩" محمد شفیع تهرانی، تاریخ...، ص٢٦٠.

(١٧٨) کەلات چەند ساڵ پێش بەشێك بووە لە دەرگز، بەڵام ئێستە بەشێکە لەشاری مەشهەد. سید علی میرنیا، منبع پیشین، ص١٣.

ئەم ڕووداوە دەنگۆیەکی گەورەی نایەوە لە هەموو خۆراسان و تورکستان[179]، بۆیە سێ تیرە لە هۆزی جەلایری بە**سەرکردایەتیی** هەر یەکە لە تەهماسب قوولی جەلایری و محەمەد عەلی بێگ و ترخان بێگ، هەروەها دوو تیرە لەهۆزی ئەفشاری لەژێر **سەرکردایەتیی** هەر یەکە لە ئەمیرلۆ و کۆندوزلۆ هاتنە ژێر ئاڵای نادرقوولی[180].

لەلایەکی دیکەوە بەمردنی بابا عەلی فەرمانڕەوای ئەبیوەرد لە ساڵی **١٧٢٣**ز، ئارەزووەکانی نادرقوولی هەنگاوێکی دیکە بەرەو پێشتر دەچێت، چونکە دەبێتە فەرمانڕەوای ئەبیوەرد[181]، ئەو کاتیش تەواوی خۆراسان بە ئەبیوەردەوە لەژێر فەرمانڕەوای مەلیك مەحمود سیستانی بوو[182]، ئەوەی زانراویشە سەبارەت بەنادرقوولی ئارەزووەکانی تەنیا بە فەرمانڕەوایکردن لەئەبیوەرد پرنەدەبۆوە، بگرە خوازیاری فەرمانڕەوایکردنی تەواوی خۆراسانی لە هزریدا گەڵاڵە کردبوو[183].

بڕیاردان لەسەر کارێکی وا مەترسیدار ئاسان نەبوو بۆ نادر قوولی، چونکە هەر لەکاتی فەرمانڕەوایکردنی لە ئەبیوەرد کێشە ناوەخۆییەکان لەسەریەك گەڵاڵە ببوون، بەتایبەت لەنێو هۆزە ئەفشارییەکان و پێوەندییکردنی ژمارەیەك لە ئەفشارەکان وەك (قلیج خان و ئیمام قوولی) و هەندێك لە کوردەکان بەمەلیك مەحمودی سیستانی[184]، هەروەها کوردەکانی زافەرانلو و شادانلو و قەراچوورلو کە نیشتەجێی خەبوشان بوون،

---

(١٧٩) محمد حسین میمندی نژاد، زندگی پرماجرای نادر شا، جاویدانی علمی، بی جایی چاپ، ١٣٤٥هـ.ش، ص٣٤.

(١٨٠) نورالله لارودی، منبع پیشین، ص٣٠.

(١٨١) عبدالحسین زرین کوب، منبع پیشین، ص ٧٤٢. دەربارەی مردنی باباعەلی فەرمانڕەوای ئەبیوەرد، محمد فرید بگ پێوایە نادرقوولی لەڕێگەی ژەهراوی کردن کوشتویەتی.محمد فرید بگ المحامی، **تاریخ الدولة العلیة العثمانیة، تحقیق: احسان حقی، الطبعة الاولی٠، دارالنفائس، بیروت، ٢٠٠٦م، ص١١٤**.بەڵام هەریەکە لەلوکهارت و فسائی تێوەگلانی نادرقوولی بەمردنی بابا عەلی ڕەتدەکەنەوە، پێانوایە بابا عەلی لەساڵی ١٧٢٣ز مردووەو موڵکەکانی بۆ نادر جێهێشتووە. لکهارت، نادرشا، ص٣٢" حاج میرزا حسن حسینی فسائی، منبع پیشین، ص٥٠٧.

(١٨٢) **عبدالعظیم رضائي**، تاریخ ده هزار ساڵە ایران، جلد چهارم، انتشارات اقبال، تهران، ١٣٨١ هـ.ش، ص١٦.

(١٨٣) حسن کریم الجاف، المصدر السابق، ص٨٢.

(١٨٤) نورالله لارودی، منبع پیشین، ص٣٢

بەدوژمنی سەرسەختی نادرقوولی هەژماردەکران[١٨٥]، لەو بارەیەوە عاشووربەگ کە لە عەشیرەتی ئەفشار بوو چەندین جار لە دژی نادر شەڕی کردووە، بەتایبەت دوای ئەوەی لەگەڵ جەعفەر بەگی شادلۆو کە یەکێك بوو لە سەرۆك عەشیرەتی چەمشەگزەکە بەهاوکاریکردنی یەکدیی دژ بەنادر بڕیاری جەنگیاندا، بەڵام پەشیمان بوونەوەی جەعفەر بەگی شادلۆو دەبێتە هۆی شکستخواردنی عاشووربەگ لەشەڕی چەهچەهە[١٨٦] بەرامبەر بەنادرقوولی[١٨٧].

سەرەڕای ئەو بارودۆخانە نادرقوولی لە سەرەتادا ملکەچی خۆی بۆ مەلیك مەحمود ڕاگەیاند، هەرچەندە قلیج خان و ئیمام قوولی هەوڵیاندا لەدەرخستنی مەرام و ئارەزووەکانی نادرقوولی و مەترسییەکانی لەسەر ئایندەی فەرمانڕەوای خۆراسان، بەڵام لەلایەن مەلیك مەحمود ئاگەدارکرنەوەکانیان بەهەند وەرنەگیرا[١٨٨]لەو کاتەشدا نادر قوولی بەنهێنی لە هەوڵی داڕشتنی پیلانێك بوو بۆ لەنێوبردنی مەلیك مەحمود، بەڵام پیلانەکە لەکاتی جێبەجێکردنیدا سەری نەگرت[١٨٩]، بۆیە هەر لەدوای ئاشکرابوونی پیلانەکە نادرقوولی مەشهەد جێدەهێڵێت و ڕوو لەناوچەی ئەبیوەرد دەکات لەترسی تۆڵەکردنەوە و سزای مەلیك مەحمود[١٩٠].

دوابەدوای ئەو ڕووداوە قۆناخێکی نوێ لە ژیانی نادرقوولی دەست پێدەکات ئەویش ئەنجامدانی کاری ڕێگرییە، بەتایبەت دوای راکردنی لە مەشهەد، دەبێتە مەترسییەکی گەورە لەسەر ئاسایشی ناوچەکە بەگشتی و دەسەڵاتی مەلیك مەحمود بەتایبەتی، چونکە پاش ئەوەی

---

(١٨٥) کەلیمولای تەوەحودی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٣.

(١٨٦) ناوچەیەکە لەنێوان کەلات و سەرەخس.

(١٨٧) کەلیمولای تەوەحودی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٤.

(١٨٨) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص ص٣١-٣٢.

(١٨٩) پیلانەکە لەلایەن خودی نادرقوولی داڕێژرابوو، ئەنجامدانیشی لە کاتی بەڕێوەچوونی ڕێوڕەسمیی کێبەرکێی ئەسپ سواری بوو، کە مەلیك مەحمود تێدا بەشداربوو، نیشانەی دەستپێکی پیلانەکە بریتی بوو لەگرتنی لغاوی ئەسپی مەلیك مەحمود لەلایەن نادرقوولی، بەڵام لەگرتنی لغاوەکە سەرکەوتوو نەبوو، بۆیە پیلانەکە سەری نەگرت. بۆ زیاتر زانیاریی لەبارەی ئەم ڕووداوە بڕوانە: محمد حسین قدوسی، نادر نامە، خراسان، ١٣٣٩ه.ش، ص٦٦.

(١٩٠) محمد **کاظم** مروی وزیر مرو، منبع پیشین، ص٤٤.

کۆنترۆڵی قەڵای کەلاتی کرد، کە دواتر ناسرا بەقەڵای نادری و کردی بەسەنتەری چالاکییەکانی و داڵدەدانی ژمارەیەکی زۆر لەو کەسانەی یاخی دەبوون لە دەسەڵاتی مەلیك مەحمود[١٩١]، هەروەها دەرکەوتنی نادر قوولی وەك ڕێگر و بڵاوبوونەوەی ئەو دەنگۆیە لە تەواوی خۆراسان، بووە هۆی ئەوەی کە خەڵکانێك پێشووتر کاریان لەگەڵدا کردبوو، پێوەندی پێوە بکەن و لەژێر **سەرکردایەتیی** و فەرمانی ئەو کاربکەن[١٩٢].

لەئەنجامدا ژمارەیەك لە هەوادارانی کە نێزیکەی ٥٠٠ کەس دەبوون لە دەوروبەری کۆبوونەوە، لە دوای ئەنجامدانی هەر کارێکی ڕێگری ڕوویان لە شاخەکانی دەوروبەری ئەبیوەرد دەکرد، پاشان کرداری ئاڵوگۆری هەندێك لە کەلوپەلەکانیان بەچەك دەکرد، بەمەش توانی تا ڕادەیەك گرووپێکی چەکداری ئامادەکراو بۆ خۆی ئامادە بکات لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ دوژمنەکانی[١٩٣].

### ب ـ ململانێی نادر قوولی لەگەڵ مەلیك مەحمود سیستانی

ئاڵۆزبوونی بارودۆخی ئێران لە ڕووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی، بەهۆی داگیرکاری ئەفغانەکان لەلایەك و هەڕەشە و داگیرکارییەکانی هەریەکە لەدەوڵەتی عوسمانی و رووسیای تەزاری لەلایەکی دیکەوە، کە هەر لایەکیان هەندێك لە ناوچە و مەڵبەندەکانی ئێرانیان بۆ خۆیان داگیرکردبوو[١٩٤]، لەو بارودۆخەدا نادر قوولی لە ناوچەی خۆراسان دەسەڵاتەکەی ڕوو لە زیادبووندا بوو، دوای ئەوەی کەوتە ململانێ لەگەڵ فەرمانڕەوای خۆراسان، بەتایبەت پاش ئەوەی سەیفەدین بیگ سەرۆکی ئێلی

---

(١٩١) حسن كريم الجاف، المصدر السابق، ص٨٢.

(192) Fraser. J. The History of Nadir Shah, formerly Called Thamas Kuli Khan, London,1971,P.74.

(١٩٣) رضا زاده **شفق، نادر شاه افشار في نظر المستشرقين، ترجمة:احمد الخولى، الطبعة الاولى، المطابع الاميرية، القاهرة، ٢٠١٠م، ص ص٢٥٥-٢٥٦.**

(١٩٤) **عبدالرحمن بن على السديس، الحملات الفارسية على عمان وسقوط حكم اليعاربة (١١٤٩-١١٦٢ه/ ١٧٣٧ – ١٧٤٩م)، مجلة الامام محمد بن سعود، العدد(٢٨)، القصيم، شوال ١٤٢٠ه، ص٣٣٩ " عبدالاميرمحمد امين، المصدر السابق، ص٨٨.**

بەیات لە خۆراسان کە یەکیَ بوو، لە سەرکردەکانی تەهماسب میرزا هاتە پالْ نادر قوولی لەگەلْ گرووپەکەی، کە نیَزیکەی ١٥٠٠ کەس دەبوون[١٩٥].

زیادبوونی دەسەلأتی نادر قوولی لە ناوچەکە بووە هۆی زیادبوونی مەترسی و دلّەڕاوکیّی مەحمود سیستانی، بۆیە داوای لە کوردەکانی خەبوشان[١٩٦] کرد، بەهەر شیّوەیەك بیّت ڕووبەڕووی نادرقوولی ببنەوە، بەلأم ئەو داواکارییە لەلایەن کوردەکان ڕەتکرایەوە، لە ئەنجامدا فەرمانڕەوای خۆراسان بڕیاری هیّرشکردنی دا بۆ سەر خەبوشان[١٩٧]، لە بەرئەنجامی ڕەتکردنەوەی داواکارییەکە مەحمود سیستانی بەهیّزیّکی ٥ — ٦ هەزار سەربازی هیّرشی کردە سەریان، هەرچەندە بەر لە هیّرشەکە کوردەکان داوای ئاشتییان کرد، بەلأم لەلایەن فەرمانڕەوای خۆراسان ڕەتکرایەوە، دوای شەڕیّکی سەخت هیّزەکانی مەلیك مەحمود توانیان کوردەکان لە قەلأی (زیرانلورا) بەدووری دوو فەرسەخ (٦میل) لە باکووری خەبوشان گەمارۆ بدەن[١٩٨].

لەو بارودۆخەدا نادر قوولی بەمەبەستی یارمەتیدانی کوردەکان ڕوویکردە قەلأی زیرانلورا، هەر بەگەیشتنی بەناوچەکە توانی هاوکیّشەی جەنگەکە بگۆڕیّت، بەشیّوەیەك کوردەکان لە بەرگرییکار بوون بە هیّرشبەر و توانیان پاشەکشە بەسوپای مەحمود سیستانی بکەن بەرەو عەشرەت ئاباد[١٩٩]، لەویّشەوە بەناچاری ڕوویانکردەوە مەشهەد[٢٠٠]، هەروەها لەبەرئەوەی کوردەکان چەکی ئاگرینیان نەبوو، نادرقوولی وای بەچاك زانی لەگەلْ مەحمود سیستانی بەردەوامی بەجەنگەکە نەدات، بۆیە بڕیاری گەڕانەوەی دا بۆ ئەبیوەرد و کوردەکانیش بەرەو خەبوشان، بەلأم نادر قوولی لەکاتی گەڕانەوەیدا بەیارمەتی کوردانی خەبوشان لەسەرووی هەمووشیان(محەمەد حوسیّن بەیگ زافەرانلو) نویّنەری چەمشەگزك توانی شاری نسا داگیربکات[٢٠١].

---

(195) Fraser. J., Op.Cit, P.84

(١٩٦) لە هەندیّك سەرچاوە بە (قوچان) هاتووە.

(١٩٧) کەلیمولأ تەوەحودی، سەرچاوەی پیّشوو، ل٧٧.

(١٩٨) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص ص٣٣-٣٤.

(١٩٩) دەکەویّتە نیّوان خەبوشان و مەشهەد.

(٢٠٠) میرزا مهدی خان استرابادی جهانگشا...، ص٣٥.

(٢٠١) کەلیمولّلا تەوەحودی، سەرچاوەی پیّشوو، ل٧٨.

نادر قوولی دوای گەڕانەوەی بۆ ئەبیوەرد، دەستیکرد بەداگیرکردنی قەڵاو دێهاتەکانی دەوروبەری ئەبیوەرد، لەوانە قەڵای ینگی کە لەلایەن ئەمیرلو فەرمانڕەوایەتی دەکرا، دوای ئابلۆقەدانی دەستی بەسەرداگرت، هەروەها قەڵای باغوادە کە لەژێر دەسەڵاتی کوندوزلوی ئەفشاری بوو، دوای سێ مانگ لە ئابلۆقەدان داگیری کرد، دواتر توانی بەسەر هێزەکەی قراخان زاغچندی زاڵ بێت و دەست بگرێت بەسەر قەڵای زاغچند[٢٠٢].

لەوکاتەی نادر قوولی خەریکی داگیرکردنی قەڵاکانی دەوروبەری ئەبیوەرد بوو، لە مازندەرانەوە بەفەرمانی تەهماسب میرزا سوپایەك بە**سەرکردایەتیی** (ڕەزا قوولی خان) بەڕێکرا بەرەو خۆراسان بەمەبەستی لەناوبردنی دەسەڵاتی مەلیك مەحمودی سیستانی، کەداوای تەخت و دەسەڵاتی تەواوی ئێرانی دەکرد[٢٠٣].هەر بەگەیشتنی بۆ خۆراسان هەڵسا بەناردنی نێردەی تایبەتی خۆی بۆ لای نادرقوولی و داوای لێکرد پێوەندیی پێوە بکات لە خەبوشان بەمەبەستی هێرشکردنە سەر مەشهەد[٢٠٤]، هەرچەندە نادر قوولی ڕەزامەندیی نیشاندا بەرامبەر بەداواکارییەکە، بەڵام ڕاستەوخۆ نەچوو بەرەو خەبوشان، بگرە ڕوویکردە ناوچەی میرکە هریزەك کە فەرسەخێك (**٣**میل) لە مەشهەدەوە دوورە، لەوێش ڕووبەڕووی سوپای مەلیك مەحمود بۆوە و شکستی پێدان و ناچاری کردن پاشەکشە بکەن بەرەو مەشهەد[٢٠٥].

دوای ئەو بەرەنگاربوونەوە، نادر قوولی هێزەکەی لە حاجی توراب[٢٠٦] جێگیرکرد، لە چاوەڕوانی گەیشتنی سوپای (ڕەزا قوولی خان) دابوو، بەڵام کوردەکان ڕۆڵی گەورەیان گێڕا لەدانانی بەربەست لەبەردەم ئەو هاوپەیمانییەتە، بەرئەنجام ڕەزا قوولی خان پەشیمانکرایەوە و ئاراستەی سوپاکەی بەرەو باکوور گۆڕی و لەناوچەی خواجە ڕەبیع جێگیر بوو[٢٠٧]، ئەمەش

---

(٢٠٢) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص ص٣٥-٣٩.

(٢٠٣) **عبدالعظیم رضائی**، منبع پیشین، ص١٦.

(٢٠٤) محمد حسین میمندی نژاد، منبع پیشین، ص١٠٦.

(٢٠٥) کەلیموڵڵا تەوەحودی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٨.

(٢٠٦) ئەم ناوچەیە دەکەوێتە دووری ٢٠کم لە مەشهەد.

(٢٠٧) لوکهارت پێی وایە کوردەکانی ناوچەکە ئامۆژگاری ڕەزا قوولی خانیان کردووە، کە هاوپەیمانییەتی لەگەڵ نادرقوولی نەکات، چونکە هەر سەرکەوتنێك لەسەر مەلیك مەحمود بەقازانجی نادرقوولی دەشکێتەوە و ناوبانگ دەردەکات:لکهارت، نادرشا، ص٣٤. هەروەها (شاهوێردی خان شەیخوانلو) گەورە فەرمانڕەواکانی عەشیرەتی کاویانلوو

هەلێکی زێڕین بوو بۆ مەحمود سیستانی، چونکە لە ڕێگەی هێرشێکەوە توانی شکستی پێ بدات و ناچاری بکات پاشەکشە بکات بەرەو توس[٢٠٨] و لەوێشەوە بە دۆڕاوی بگەڕێتەوە خەبوشان[٢٠٩]، پاش سێ مانگ جارێکی دیکە ڕەزا قوولی خان لە خەبوشان سوپایەکی ئامادەکرد و ڕوویکردە مەشهەد بەمەبەستی ڕووبەڕووبوونەوەی مەحمود سیستانی، بەڵام دووبارە شکستی خوارد[٢١٠]، ئەو شکستخواردننانەی بەرامبەر فەرمانڕەوای سیستان، بووە هۆکارێك کە تەهماسب میرزا لەسەر کارەکەی دووری بخاتەوە و لەشوێنی ئەودا محەمەد خان تورکمان دەستنیشان بکات وەك فەرمانڕەوای خۆراسان[٢١١].

سەبارەت بەهەڕەشەکانی مەحمود سیستانی لە نیسابور، جارێکی دیکە بووە هۆی هەڵگیرساندنەوەی شەڕ لەنێوان مەلیك مەحمود و نادر قوولی، چونکە خەڵکی نیسابورر هانایان برد بۆ نادرقوولی بەمەبەستی یارمەتی دانیان لەبەردەم هەڕەشەکانی مەحمود سیستانی، هەرچەندە لە سەرەتادا لە ناوچەی قەدەمگا نادرقوولی چەند سەرکەوتنێکی بەدەست هێنا، بەڵام دواتر زۆر بەتوندی شکستی خوارد و ژمارەیەکی زۆری هێزەکەی لەدەستدا[٢١٢].

---

شەیخوانلو، لەگەل گەورەی ناوچەی (چناران و رادەکان) کە دژ بە نادرقوولی بوون بە(ڕەزا قوولی)یان ڕاگەیانـدووە ((ئەگـەر نادر دەستی بگاتە ئەو ناوچەیە گەورەیی و مەزنی تۆ نامینێت)). کەلیمولڵا تەوەحودی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٨.

(٢٠٨) دەکەوێتە دووری ١٨کم لەشاری مەشهەد.

(٢٠٩) نوراللە لارودی، منبع پیشین، ص ٣٦.

(٢١٠) حوسێن حوزنی موکریانی، کورد و نادرشا لە خاکی ئێرانا، پەرتی زاری کرمانجی، ڕەواندوز، ١٩٣٤، ل٨.

(٢١١) محمد حسین میمندی نژاد، منبع پیشین، ص١١١ " محمد شفیع **طهرانی**، مرات...، ص١٥٨.

(٢١٢) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص ص٤٤-٤٥. لەو شەڕەدا ئیسحاق برای مەحمود سیستانی بەدیل دەگیرێت، بۆیە مەحمود سیستانی نێردەی خۆی بەناوی (مەلا ڕەفیعای گەیلانی) بۆ وتووێژ ڕەوانە دەکات سەبارەت بە چارەنووسی ئیسحاق، لەو بارەیەوە جۆرە ناکۆکییەك دروست دەبێت لەنێوان نادرقوولی کە لە ڕوانگەی رامیارییەوە سەیری بابەتەکەی دەکرد، بەپێچەوانەی کوردەکان کە داوای کوشتنیان دەکرد، لە ئاکامدا کوردەکان بڕیاری گەڕانەوەیاندا ئەمەش بووە هۆکارێك کە مەلیك مەحمود سوود لەو دەرفەتە وەربگرێت و شکست بەنادرقوولی بدات. کەلیمولڵا تەوەحودی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٩-٨٠. لوکهارت باس لە گەڕانەوەی نادرقوولی دەکات بۆ ئەبیوەرد پاش شکانەکەی بەرامبەر بە مەحمود سیستانی، کە تەنیا دوو کەسی لەگەڵدا مابوو: لکهارت، نادرشا، ص٣٤.

ئەو شکستە نەبووە هۆکارێك بۆ ڕووخانی ورەی نادر قوولی، چونکە دووبارە توانی خۆی ڕێك بخاتەوە و ڕوو بکاتەوە مەشهەد، لەوێش شکست بەسوپای مەحمود سیستانی بهێنێت، بەڵام نەیتوانی بەردەوام بێت لە هێرشەکانی، چونکە چەند هەڵگەڕانەوە و یاخیبوونێك لەلایەن تورکمانەکان لە ناوچەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەبیوەرد ڕوویاندا[٢١٣]، لەو **هەلومەرجەدا** تەهماسب میرزا لەگەڵ **فەتح** عەلی خانی سوپاسالار بەهێزێکەوە بۆ سەرکوتکردنی مەحمود سیستانی ڕوویانکردە خۆراسان، هەر بەگەیشتنیان بەناوچەکە بەشێکی زۆر لە هۆزەکانی کورد و ئەفشار و چەند هۆزێکی دیکە پێوەندییان پێوەکردن، کە بەنێزیکەی بیست هەزار کەس خەملێندراوە [٢١٤].

دوای ئەوەی نادر قوولی توانی **ڕاپەڕینە**کان سەرکوت بکات، دووبارە ڕوویکردەوە مەشهەد بەمەبەستی هێرشکردن، لە ڕێگەدا حەسەن عەلی بێگ نێردەی تەهماسب میرزای پێگەیشت و داوای لێکرد، پێوەندیی بەسوپای تەهماسب میرزا بکات لە خەبوشان[٢١٥]، لەو بارەیەوە نادرقوولی داواکەی قبووڵکرد، لەگەڵ هێزەکەی ڕوویانکردە خەبوشان و چوونە ریزی سوپاکەی تەهماسب میرزا[٢١٦]، بۆیە دەکرێت بڵێین تەهماسب میرزا بەبوونی نادرقوولی لە ریزی سوپاکەی بووە خاوەن بەهێزترین سەرکردەی جەنگی[٢١٧]، کە لەسەر دەستی ئەو سەرکردەیە توانرا تەخت و دەسەڵاتی سەفەوی جارێکی دیکە زیندوو بکرێتەوە ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بووبێت.

---

(٢١٣) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص ص٤٩-٥١.

(٢١٤) مقصود علی صادقی، مجموعه مقالات همایش (صفویه در گستره تاریخ ایران زمین)، انتشارات ستوده، تبریز، ١٣٨٣ ه.ش، ص ٩٥٣. کۆی گشتیی سوپای تەهماسب میرزا بەر لە گەیشتنیان بۆ خۆراسان نێزیکەی حەوت هەزار سەرباز دەبوون، پێکهاتەکەشی برێتی بوو لە ٢٥٠٠ سەرباز لە قاجارەکان و ٢٥٠٠ سەرباز لە تورکمانەکان، ٢٠٠٠ سەربازیش لە هەموو هۆزەکانی دیکە. بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی پێکهاتەی سەربازی سوپای تەهماسب میرزا بگەڕێوە بۆ: مقصود علی صادقی، همان منبع، ص ٩٥٣.

(٢١٥) لارنس لاکهارت، **انقراض** سلسله...، ص٢٦٨.

(٢١٦) **رضا** شعبانی، منبع پیشین، ص ٥٢ " میرزا مهدی خان استرابادی، دره نادره...، ص٧٣٦.

(٢١٧) م.ر. ارنوا- ك.ز.اشرافیان، دولت نادر شاه افشار، ترجمه: حمید **مؤمنی**، چاپ دوم، انتشارات شبگیر، تهران، دی ما ٢٥٣٦، ص٦١.

نادر قوولی بۆماوەیەکی کەم لە خزمەتکردنی لە ڕیزەکانی سوپا بووە جێگەی باوەڕی تەهماسب میرزا و ناسناوی تەهماسب قوولی[٢١٨] پێ بەخشی و یەکەمین ئەرکیش کە پێی راسپێردا بریتی بوو لە هێرشکردنە سەر مەشهەد، بۆ ئەم مەبەستە تەهماسب قوولی لە ١٠ی ئەیلوولی ساڵی **١٧٢٦** لەگەڵ سوپاکەی بەڕێکەوت و لە ناوچەی خواجە رەبیع جێگیر بوو[٢١٩]، سەبارەت بەهێرشکردنە سەر ئەو شارەش لە رێگەی پلانێکەوە بەدوو قۆناخ ئەنجام درا، سەرەتا ئابلۆقەدانی شاری مەشهەد، دواتر چوونە ناو شارەکە، بەڵام شکستخواردنی تەهماسب قوولی لە بڕینی قایمکارییەکانی شارەکە لە سەرەتادا، بووە هۆکار بۆ چێبوونی ململانێیەکی توند لەنێوان تەهماسب قوولی لەلایەك و **فەتح** عەلی خان قاجار لەلایەکی دیکەوە[٢٢٠].

لەکاتی گەمارۆدانی شاری مەشهەد، تەهماسب قوولی گەیشتە ئەو بڕوایەی کە **فەتح** عەلی خانی قاجار، کە ئەو کات پلەی (نائب سەلتەنەت)ی هەبوو، دەیەوێت لە رێگەی ئەو پلەوپایەوە دەسەڵاتی بەسەر تەهماسب میرزا بسەپێنێت[٢٢١]، ئەمەش دەبێتە رێگر لەبەردەم حەز و ئارەزووەکانی، بۆیە کەوتە بیرۆکەی خۆ رزگارکردن لەو ڕکابەرە[٢٢٢]، هەرچەندە تەهماسب قوولی نەیدەویست ململانێی راستەوخۆ لەگەڵ **فەتح** عەلی خان ئەنجام بدات بۆ ئەوەی کێشەی بۆ چێ نەبێت، لە سەرەتادا توانی بەپیلانگێڕ و دەستێکەڵکردن لەگەڵ مەحمود سیستانی تاوانباری بکات، هەروەها توانی باوەڕ بەتەهماسب میرزا بهێنێت کە **فەتح** عەلی خان قاجار خەریکی پیلانێکە بۆ بەدەستەوەدانی بەمەحمود سیستانی و دواتر لەناوبردنی[٢٢٣].

---

(٢١٨) تهماسب قوولی بەواتای بەندەی تەهماسب دێت. السید عبدالله بن السید نورالدین بن السید نعمت الله الجزائری، **تذکرەء** شوشتر، کتابفروشی صافی، اهواز، ١٣٢٨هـ.ش، ص١١١.

(٢١٩) لکهارت، نادرشا، ص٣٧.

(٢٢٠) حسن مجید الدجیلی، ایران والعراق خلال خمسه قرون، **دارالاضواء**، بیروت، ١٩٩٩، ص ٥٧.

(٢٢١) احمد پناهی سمنانی، منبع پیشین، ص ١١٢.

(٢٢٢) م.ر. ارنوا- ك.ز.اشرافیان، منبع پیشین، ص٦٢.

(٢٢٣) **رضا** شعبانی، منبع پیشین، ص ٣٤ " حسن مجید الجیلی، المصدر السابق، ص ٥٧. لەراستیدا گرینگیدان بە نادرقوولی لەلایەن تەهماسب میرزا و پێدانی پایەی تەهماسب قوولی مایەی قبوولکردن نەبوو لەلایەن فەتح عەلی خان، چونکە ئەو پایە بەئەندازەی پایەی وەکیلی دەوڵەت بوو، هەر ئەمەش وایکرد کە فەتح عەلی خان بیر لە پێوەندیی

دوابەدوای ئاشکرابوونی پیلانەکەی **فەتح** عەلی خان، هەوڵ دەدرێت لەلایەن تەهماسب میرزا بۆ کوشتنی، بەڵام لەبەر دروستبوونی ئاژاوە لەلایەن قاجارەکانەوە ئەو کارەی ئەنجام نەدا[٢٢٤]، بۆیە بڕیاری دەستگیرکردنی دەدات، پاشان ڕەوانەی کەلاتی دەکات و لە١١ی تشرینی یەکەمی ١٧٢٦ز بەفەرمانی تەهماسب میرزا و بەدەستی تەهماسب قوولی دەکوژرێت[٢٢٥]، دواتر تەهماسب میرزا لەرێگەی فەرمانێکەوە کە لە سەرەتادا فەتح عەلی خان قاجار بەناپاك ناوزەد دەکات، پاشان جەخت دەکاتەوە لەدانانی ئە**ڵا** قلیخان قاجار وەك فەرمانڕەوای نوێی ئەستەرئاباد[٢٢٦].

بەکوژرانی **فەتح** عەلی خان قاجا رپشێوی و ئاڵۆزی لەناو سوپای تەهماسب میرزا دروست بوو، لەهەمان کاتدا هەلێکی باش بوو بۆ مەحمود سیستانی کە ئەو بارودۆخە بۆ خۆی بقۆزێتەوە و هێرش بکاتە سەر هێزەکەی تەهماسب قوولی لە خواجە رەبیع، بەڵام سەرکەوتوو

---

بکاتەوە لەگەڵ مەحمود سیستانی بۆ ئەمەش پێویست بوو لە ڕێگەی بەهانەیەکەوە خۆی بدزێتەوە لە هێزەکانی تەهماسب میرزا، بەڵام ئاشکرابوونی پێوەندییە نهێنییەکانی لەگەڵ مەحمود سیستانی بووە هۆکار کە تەهماسب فەرمانی کوشتنی بۆ دەربکات. عبدالحسین زرین کوب، منبع پیشین، ص٧٤١" ادوارد براون، منبع پیشین، ص١٣٩. لوکهارت باس لەوە دەکات کە تەهماسب میرزا کەسایەتێکی لاوازی هەبووە، بەشێوەیەك کەوتبووە بەر کاریگەرییەکانی بۆچوونی وەزیر و سەرکردەکانی سوپا. لکهارت، نادرشا، ص ٣٨.

(٢٢٤) لارنس لاکهارت، **انقراض** سلسله...، ص٢٦٩.

(٢٢٥) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص ص٥٨-٥٩" **رضا** شعبانی، مروری کوتاه بر تاریخ ایران از اغاز عصر مادها تا پایان دوران قاجاریه، انتشارات سخن، تهران، ١٣٨٠ه.ش، ص٥٢٠.سەبارەت بەکوژرانی فەتح علی خان هەندێك پێیان وایە بەر لەداگیرکردنی مەشهەد کوژرابێت، بەڵام هەندێکی دیکە جەخت لەوە دەکەنەوە کە دوای داگیرکردنی مەشهەد کوژرابێت: محمد شفیع **طهرانی**، مرات...، ص١٨٣.لەلایەکی دیکەوە فسائی باس لە ناشتنی تەرمی فەتح علی خان دەکات دوای کوژرانی لە نێزیك مەزارگەی خواجە رەبیع: حاج میرزا حسن حسینی فسائی، منبع پیشین، ص٥٠٨.

(٢٢٦) مهری ادریسی اریمی، منبع پیشین، ص٢٦. دەقی فەرمانەکەی تەهماسب میرزا بۆ دانانی ئەڵا قلیخان قاجار وەك فەرمانڕەوای ئەستراباد و جەختکردنەوەی لەسەر ناپاکییەکانی فەتح عەلی خان قاجار بگەڕێوە بۆ: پاشکۆی ژمارە(٢).

نەبوو، بۆیە گەڕایەوە ناو مەشهەد[٢٢٧]، پاش ئەم جەنگە گەمارۆدانی مەشهەد لەلایەن تەهماسب قوولی دەستی پێکرد، کە نێزیکەی دوومانگ و نیوی خایاند، پاشان لە شەڕێکی سەخت لەگەڵ سوپای مەحمود سیستانی توانی شارەکە داگیر بکات، بەتایبەت دوای ئەوەی پیر محەمەد بەگ فەرماندەی مەحمود سیستانی یەکێك لە دەرگەکانی دەروازەی شاری بەناوی (میر عەلی) بۆ والا کردن[٢٢٨]، ئەم ڕووداوەش مەحمود سیستانی ناچار کرد ملکەچبوونی خۆی ڕابگەیەنێت و بڕیاری مانەوەیدا لە حوجرەیەك لە مەزاری ئیمام رەزا[٢٢٩].

دوابەدوای داگیرکردنی مەشهەد لەلایەن تەهماسب قوولی [٢٣٠]، چەندین **ڕاپەڕین** لەناوچە جیاوازەکانی خۆراسان سەریهەڵدا، بەتایبەت لەلایەن کوردەکانی خەبوشان و تورکمانەکانی ئەبیوەرد و دانیشتووان کەلات کەلەلایەن تەتارەکانی مرو پاڵپشتیان دەکرا، بەڵام تەهماسب قوولی توانی لە ڕێگەی هێزەوە هەموو **ڕاپەڕینە**کان کپ بکات، پاشان گەڕایەوە مەشهەد و لەئازاری ساڵی **١٧٢٧**ز بانگهێشتی تەهماسب میرزای کرد بۆ شارەکە و بەگەرمی پێشوازی لێکرد[٢٣١]، هەروەها فەرمانی دا بەکوشتنی مەحمود

---

(٢٢٧) **محمد** حسین میمندی نژاد، منبع پیشین، ص١٤٠.دوای کوژرانی فەتح عەلی خان تەهماسب قوولی دەبێتە سەرکردەی گشتیی سوپای تەهماسب میرزا، لە یەکەمین کاریدا هەڵسا بەلابردنی هەموو سەرکردەکانی قاجاری لە پۆستە گرینگەکان و دانانی کەسی نێزیك لەخۆی. میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص ص٥٨-٥٩.بۆ زیاتر زانیاریی لەبارەی هەڵوێستی تەهماسب قوولی لەگەڵ هۆزی قاجار لە دوای کوژرانی فەتح عەلی خان قاجار بڕوانە:علی اصغر شمیم، ایران در دوره **سلطنت** قاجار، چاپ دهم، انتشارات مدبر، تهران، ١٣٧٤ه.ش، ص ص٢٦-٢٧.

(٢٢٨) احمد پناهی سمنانی، منبع پیشین، ص٨١-٨٢" مجید دوامی، **طوطی**:گوشەای از تاریخ **جذاب** و پرماجرای نادر شا، انتشارات راستی نوە، تهران، ١٣٨٢، صچ " **محمد کاظم** مروی وزیر مرو، منبع پیشین، ص ص٦٦-٦٧.

(٢٢٩) لارنس لاکهارت، **انقراض** سلسله...، ص٢٧١.

(٢٣٠) تەهماسب قوولی دوای داگیرکردنی مەشهەد سەردانی مەزارگەی ئیمام رەزای کرد و بڕیاری دروستکردنی منارەیەکی دیکەی دا بۆ مەزارەکە. میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص٦٢.

(٢٣١) نوراللە لارودی، منبع پیشین، ص ٤٥ " حسن مجید الدجیلی، المصدر السابق، ص ٥٧.

سیستانی و ژمارەیەك لە ئەندامانی بنەماڵەکەی، دوای ئەوەی تاوانبارکرا بەهاندانی **ڕاپەڕینە**کانی مرو دژ بە تەهماسب قوولی[٢٣٢].

بەکوژرانی مەحمود سیستانی **ڕاپەڕین** لە ناوچەکانی قاین و بهدادین و سنگان سەریهەڵدا دژ بە تەهماسب قوولی کە لەلایەن ئەبدالییەکانەوە پاڵپشتی دەکران، بەڵام لەلایەن تەهماسب قوولی بەهاوکاری تەهماسب میرزا توانیان لە ئەیلوولی ١٧٢٧ز کۆتایی بە **ڕاپەڕینە**کانی هەرسێ شوێنەکە بهێنن[٢٣٣] و ئاسایش بۆ ناوچەکە بگەڕێننەوە، لەو **هەلومەرجەدا** تەهماسب میرزا پەلەی دەکرد بۆ پەلاماردانی ئەسفەهان، بەڵام تەهماسب قوولی هاوڕا نەبوو لەگەڵ ئەو بۆچوونە[٢٣٤]، چونکە پێی وابوو ئەبدالییەکان لە هەرات مەترسی گەورەن لەسەر خۆراسان، وا باشترە سەرەتا هێرش بکرێتە سەر ئەبدالییەکان بەمەبەستی زامنکردنی بەرەی پشتەوەی سوپاکەیان، ئینجا قۆناخی هێرشکردنە سەر ئەسفەهان دەست پێ بکەن[٢٣٥].

### جـ ـ کۆتایی هێنان بەداگیرکاریی ئەفغانەکان لە ئێران

دوا بەدوای داگیرکردنی ئەسفەهان لەلایەن ئەفغانەکان بە**سەرکردایەتیی** میر مەحمود ئەفغانی، سەرەتا پیادەی سیاسەتێکی نەرمونیان لەگەڵ خەڵکی ئێران پێڕەوکرد، پیادەکردنی ئەم سیاسەتەش بۆ ڕازیکردنی ئێرانییەکان بوو، چونکە ئەفغانییەکان نەرمە هێزێکی بچووك لە وڵاتێکی پان بەرینی وەك ئێران، مەحاڵ بوو بتوانن ئەم وڵاتە بەڕێوەببەن، لەلایەکی دیکەوە لە تێڕوانینی ئێرانییەکان ئەم هێزە بەچاوێکی کەم سەیردەکران بۆیە هەر زوو **ڕاپەڕینە**کان دژ بەو دەسەڵاتە زۆر لە ناوچەکانی ئێرانی گرتەوە وەك کاشان، یزد و خوانسارو شیرازو بەندەر عەباس.

---

(٢٣٢) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص ٧١" عباس اقبال اشتیانی، باقر عاقلی، تاریخ ایـران پس از اسلام، نشر نامك، تهران، ١٣٨٠هـ.ش، ص٦١٣.

(٢٣٣) بۆ زانیاریی لەبارەی شۆڕشەکانی قائن و بهـدادین و سـنگان و سـەرکوتکردنیان لەلایـەن تەهماسـب قوولی بگەڕێوە بۆ: میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص ص٧٢-٧٤.

(٢٣٤) عباس اقبال اشتیانی، منبع پیشین، ص٧١٣.

(٢٣٥) مجید دوامی، منبع پیشین، صح " لارنس لاكهارت، **انقراض** سلسله...، ص٢٨٣.

پیادەکردنی ئەم جۆرە سیاسەتە لەلایەن ئەفغانەکان تا سەر بەردەوامی نەبوو، چونکە هەڕەشە دەرەکییەکانی هەر یەکە لە رووسیای تەزاری و دەوڵەتی عوسمانی لەلایەك و زۆری **راپەڕین** و مەترسییەکانی تەهماسبی دووەم لەناو خودی ئێران لەلایەکی دیکەوە، بوونە هۆی ئەوەی کە میر مەحمودی ئەفغانی نەتوانێ کۆنترۆڵی ئەو بارودۆخە بکات، بۆیە داوای هێزی زیاتری کرد لەئەفغانستان، هەروەها ئەو هەموو کێشانە بەسەر یەکەوە هانی میر مەحمودی ئەفغانیاندا پیادەی سیاسەتێکی توند بکات لە فەرمانڕەوایەتی کردن لە ئێراندا(٢٣٦).

لەو کاتەی ئێران ڕووبەڕووی هێرشەکانی ئەفغانی دەبۆوە، پەترۆسی گەورە١٦٨٢ — ١٧٢٥ لە رێگەی پەیماننامەی ئاشتی نیشتاد لە ساڵی ١٧٢١ز کۆتایی بەجەنگ هێنا لەگەڵ سوید(٢٣٧) بەمەش دەستی واڵا بوو بۆ دەست خستنە ناو کاروباری ئێران، بەتایبەت دوای گەمارۆدانی شاری ئەسفەهان لەلایەن ئەفغانەکان و گەیاندنی هەواڵەکان بە پەترۆسی گەورە باشترین هەل بوو بۆ تەزاری رووسیا پلانەکەی تایبەت بەهێرشکردنە سەر ئێران بخاتە بواری جێبەجێکردن(٢٣٨).

پەترۆسی گەورە بڕیاری ئامادەکردنی سوپایەکی گەورەیدا لەژێر **سەرکردایەتیی** خۆی و لە رێگەی ڕووباری ڤۆڵگا بەکەنارەکانی دەریای خەزەر ڕوویکردە ناو خاکی ئێران، هەروەها لەرێگەی وشکانییەوەش نێزیکەی (١٠) هەزار سەرباز (قۆزاق) بە**سەرکردایەتیی** ژەنراڵ وترانی لە سێپتەمبەری ساڵی ١٧٢٢ز توانیان بەشێکی زۆری ناوچەکانی داغستان و دەربەند داگیر بکەن(٢٣٩).

پێشڕەوییەکانی هێزی ئەفغان لە ئەسفەهانەوە بەئاراستەی قەزوین و رشت، دەبێتە هۆکارێك کە فەرمانڕەوای گەیلان، داوا لە رووسیای تەزاری بکات بۆ رێگەگرتن لە

---

(٢٣٦) عبدالحسين نوائی، منبع پيشين، ص ١٤ " ادوارد براون، منبع پيشين، ص ١٣٨.

(٢٣٧) علی شعب، المصدر السابق، ص٥٣.

(٢٣٨). لەو بارەیەوە لوکهارت پێی وایە دوو هۆکار هەیە بۆ هێرشکردنی ڕووسەکان بۆ سەر ئێران، لەوانە ئاشتیکردن لەگەڵ سوید، هەروەها هێرش کردنی لزگیەکان بەسەرکردایەتیی مودەرس حاجی داود و ئەحمەد خان ئەوسمی بۆ شماخ، کە تێیدا کوشتن و تاڵانکردنی چەند دوکانێکی ڕووسی لەو ناوچەیە ئەنجام دا. لارنس لاكهارت، **انقراض** سلسله...، ص١٥٨.

(٢٣٩) **عبالرضا** هوشنگ مهدوی، منبع پيشين، ص ١٤٠ " منوچهر پارسا دوست، منبع پيشين، **ص٤٨.**

ئەفغانەکان[240]، ئەمەش دەرفەتێکی زێڕین بوو بۆ تەزاری رووسیا گەیلان بخاتە ژێر رکێفی خۆی، زیاتر ئەو هەنگاوانەی رووسیای تەزاری بۆ رێگەگرتن بوو لەدەست گرتنی عوسمانییەکان بەسەر ویلایەتەکانی قەفقاز و ناوچەکانی کەناری دەریای خەزەر، کە مەترسی لەسەر رووسیا دروست دەکات لە ڕووی سەربازی و بازرگانییەوە[241].

دوای داگیرکردنی ناوچەکانی باکووری ئێران لەلایەن رووسیای تەزاری لەلایەك و ئەو پشێویانەی باڵی کێشابوو بەسەر ئێران لەئەنجامی داگیرکاری ئەفغانی لەلایەکی دیکە بوونە هۆکار بۆ زەقبوونەوەی دڵەڕاوکێ و مەترسییەکانی دەوڵەتی عوسمانی و ناردنی سوپا بەمەبەستی داگیرکردنی چەند ناوچەیەکی گرینگ لە ئێران[242]، لەو **هەلومەرجەدا** حەسەن پاشا والی بەغدا ١٧٠٤ – ١٧٢٣، پاش ئەوەی والی شارەزوور عەبدولرەحمان پاشا بەیاوەری هۆزە کوردەکان لەگەڵ هەندێك لە سەربازەکانی ئینکشاری[243] پێوەندییان پێوە کرد[244]، بەفەرمانی سوڵتانی عوسمانی لە رێگەی خانەقین بەرەو کرماشان بەرِێکەوتن، لەگەڵ نێزیکبوونەوەی سوپای عوسمانی لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٧٢٣ز عەبدولباقی خان فەرمانڕەوا بەیاوەری کەسایەتییە دیارەکانی کرماشان ملکەچبوونی خۆیان بۆ سوپای عوسمانی ڕاگەیاند[245].

لەلایەکی دیکەوە هێزێکی دیکە بە**سەرکردایەتیی** خانە پاشا بابان (١٧٢١ – ١٧٢٨ز) بەرِێکەوت بەمەبەستی داگیرکردنی ئەردەڵان و نێزیکبوونەوەی ئەو هێزە لە

---

(٢٤٠) مەحمود **طلوعی**، منبع پیشین، ص ص ١٠١ – ١٠٢

(٢٤١) ن.و.بیکولوسکایا و دیگران، منبع پیشین، ص ٥٨٧.

(٢٤٢) کمال **مظهر**، دراسات **في** تاريخ ايران **الحديث** والمعاصر، بغداد، ١٩٨٥م، ص١٩.

(٢٤٣) ئینکشاری یاخود یەنی چەری بەواتای سوپای نوێ دێت، بەڵام لەلای ئەورووپییەکان بە(Janissaries) هاتووە، هەروەها لە نووسینی تورکی کۆنەوە بە یکی شار هاتووە. بۆ زانیاریی زیاتر لەباری ئینکشاری بڕوانە: **هاملتون جيب و هارولد بوين، المجتمع الاسلامي والغرب، ترجمة: عبدالمجيد حسيب القيسي، الجزء الأول، الطبعة الاولى، دارالمدى، دمشق، بيروت، ١٩٩٧م، ص ص١٠٣-١١٥.**

(٢٤٤) ستيفن هيمسلي لونكريك، **اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ترجمة: جعفر الخياط، الطبعة الخامسة، دار الرافدين، بيروت، ٢٠٠٤م، ص ١٦٣.**

(٢٤٥) الشيخ رسول الكركوكلي، **دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد الزوراء، ترجمة:موسى كاظم نورس، الكتاب العربي، بيروت، ١٩٦٤م، ص١٧.**

سنە بووە هۆكارێك كە عەلی قلی خان فەرمانڕەوا ملكەچی خۆی بۆ دەسەڵاتدارێتی عوسمانی ڕابگەیەنێت[٢٤٦]، دواتر هێزێكی دیكەی عوسمانی بە**سەركردایەتیی** عەبدولرەحمان پاشای والی شارەزوور توانی دەست بەسەر لورستان دابگرێت، بەتایبەت دوای ئەوەی عەلی مەردان خان فەرمانڕەوای ناوچەكە شكۆی عوسمانی ڕەتكردەوە و پاڵپشتی خۆی ڕاگەیاند بۆ تەهماسب میرزای كوڕی شاحوسێنی سەفەوی[٢٤٧]، لە ٢٤ی تشرینی دووەمی ساڵی **١٧٢٣**ز، والی بەغدا توانی خورەم ئاباد داگیر بكات و دەسەڵاتی عوسمانی بەسەردا بسەپێنێت[٢٤٨].

لە دوای مردنی حەسەن پاشا كوڕەكەی بەناوی ئەحمەد پاشا توانی هەمەدان داگیر بكات، دوای شەڕێكی توند كە سێ ڕۆژی خایاند، پاشان لە ڕێگەی ئاگربەستەوە شەڕەكە كۆتایی پێهات بەمەرجێك هەمەدان لەژێر شكۆی دەوڵەتی عوسمانی دابێت[٢٤٩]، دوای ئەو بارودۆخە میر مەحمودی ئەفغانی لە ساڵی **١٧٢٣**ز لەئەسفەهان هەڵسا بەكوشتنی نێزیكەی سێ سەد كەس لە نەجیب زادەكانی ئەسفەهان و نێزیكەی سێ هەزار لە سەربازانی لەچەك داماڵراوی پێوەست بەشا حوسێن [٢٥٠]، هەروەها میر مەحمود لەساڵی **١٧٢٥**ز كە ئەو كاتە تەمەنی تەنیا **٢٧** ساڵ بوو، هەڵسا بەكوشتنی كەسە نێزیكەكانی بنەماڵەی سەفەوی، تەنانەت دوو منداڵی بچووكی (شا حوسێن) ی سەفەوی لەو هەڵمەتە بەدەر نەبوون[٢٥١].

جێگەی ئاماژەپێكردنە تەهماسبی دووەم، كە ئەوكات لەباكووری ئێران بوو وەك (شا)ی ئێران خۆی ناوزەد كردبوو، بەناچارییەوە داوای لە هەریەكە لە رووسیای تەزاری و دەوڵەتی عوسمانی كرد بۆ دەركردنی ئەفغانەكان لە وڵاتدا، بەڵام وەڵامی عوسمانییەكان بۆ داواكارییەكە مەرجی زۆر قورسی لەخۆگرتبوو، وەك داواكردنی تەواوی ئەو ناوچە و

---

(٢٤٦) ستيفن هيمسلي لونكريك، المصدر السابق، ص١٦٣.

(٢٤٧) **روبرت دبليو.اولسن، حصار الموصل والعلاقات العثمانيه الفارسية، ترجمة: عبدالرحمن بن الحاج امين بك الجليلي، دار العلوم، الرياض، ١٩٨٣م، ص١٠٩.**

(٢٤٨) **عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، العهد العثماني الثاني (١٠٤٩ه / ١٦٣٩م – ١١٦٣ه / ١٧٥٠م)، الجزء الخامس، بغداد، ١٩٥٣م، ص٢٠٧.**

(٢٤٩) حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص ص ٦٠ – ٦١.

(٢٥٠) ادوارد براون، منبع پيشين، ص١٣٨.

(٢٥١) عبدالحسين نوائى، منبع پيشين، ص١٤.

مەڵبەندانەی کە بەئارەزووی خۆیان داوای دەکەن، پێویستە تەهماسبی دووەم پێیان بدات، ئەو کات یارمەتی دەدەن لەگەڕانەوەی دەسەڵاتەکەی، هەروەها هەوڵیش دەدەن بۆ دەرکردنی ئەفغانەکان لە ئێران، ئەو مەرجانەش ڕێك وەك مەرجەکانی تەزاری رووسیا بوو[٢٥٢].

باڵا دەستی رووسیا لە کەنارەکانی دەریای خەزەر زەنگێکی مەترسیداربوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی، ئەگەری هەڵگیرسانی شەڕی لێدەکەوتەوە بەڵام هەوڵەکانی باڵیۆزی فەرەنسا (مارکیز دویوناك) لە ئیستانبول توانی کێشەکە یەکلایی بکاتەوە[٢٥٣]، دوای هێورکردنەوەی بارودۆخەکە لەلایەن باڵیۆزی فەرەنسا هەردوو وڵات گەیشتنە ڕێککەوتننامەیەك لە٢٤ ی حوزەیرانی ساڵی ١٧٢٤ز، کە سەدری ئەعزەم داماد ئیبراهیم پاشا لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی و باڵیۆزی رووسیا لە ئیستانبول (نیبلوییف) ڕێککەوتننامەکەیان واژۆ کرد، دواتریش باڵیۆزی فەرەنسا لە ٢ی تەمووزی هەمان ساڵ وەك لایەنی ناوبژیکەر واژۆی لەسەر ڕێککەوتننامەکە کرد[٢٥٤].

ناوەرۆکی ڕێککەوتننامەکە زیاتر بۆ دابەشکردنی ناوچەکانی باکوور و رۆژئاوای ئێرانە لەنێوان رووسیا و دەوڵەتی عوسمانی، بەگوێرەی ئەو پەیماننامەیە عوسمانییەکان باڵادەستی ڕووسەکانیان لە کەنارەکانی دەریای خەزەر قبوولکرد، لە بەرامبەردا شاری تەبرێز و ئەردەبیل و هەمەدان و هەموو ناوچەکانی نێوان ئەو شارانە بۆ دەوڵەتی عوسمانی لەلایەن رووسیاوە قبووڵ کرا[٢٥٥]، هەروەها سەبارەت بە تەهماسب میرزا، هەردوو لایەن جەختیان کردەوە لەسەر ئەوەی ئەگەر تەهماسب میرزا رازی بێت بە بەندەکانی ڕێککەوتننامەکە ئەوە وەك (شا)ی ئێران دانی پێدادەنێن و یارمەتی پێویستیشی پێشکێش دەکەن بۆ دەرکردنی ئەفغانەکان،

---

(٢٥٢) راجر سیوری، منبع پیشین، ص ٢٥١.

(٢٥٣) اصغر جعفر ولدانی، بررسی تاریخی اختلافات مرزی ایران و عراق، دفتر **مطالعات** سیاسی وبین المللی وابسته به وزارت امور خارجه جمهوری اسلامی ایران، تهران، ١٣٦٧هـ.ش، ص ص١٦-١٧.

(٢٥٤) **علاء** موسى **كاظم** نورس، العراق في العهد **العثماني** دراسه في العلاقات السياسيه(١٧٠٠ -١٨٠٠)، بغداد، ١٩٧٩م، ص١٠٩.

(٢٥٥) رابرت ماسی، **بطر** کبیر، ترجمه: **ذبيح** الله منصوری، جلد دوم، انتشارات زرین، تهران، ١٣٨٠ هـ.ش، ص١٢٦٨ " منوچهر پارسا دوست، منبع پیشین، ص٤٩ "

J.C. Hurewitz, Diplomacy in the near and Middle East (A Documentary Record 1535-1914), Volume.1,New York,1956,PP.42-45.

لەبەرانبەریشدا ئەگەر نارەزایی دەربڕێت ئەوە هەردوو وڵات ڕێوشوێنی هاوبەش دەگرنە بەر بۆ داگیرکردنی شارەکانی ژێر دەسەڵاتی تەهماسب و کەسێکی گونجاو دادەنێن بۆ فەرمانڕەوایکردنی ناوچەکە[٢٥٦].

هەردوو دەوڵەت تا کۆتایی ساڵی ١٧٢٥ز توانیان ئەو شوێنانەی بەگوێرەی پەیماننامەکە دیاری کرابوو بیخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، تەنیا شاری تەبریز نەبێت کە عوسمانییەکان لە ساڵی ١٧٢٤ز هێرشیان کردە سەر کەچی نەیانتوانی داگیری بکەن، لەبەربوونی بەرگرییەکی بەهێز لەلایەن خەڵکەکەوە، بەڵام لە هێرشی دووەم لە ساڵی ١٧٢٥ز داگیر کرا[٢٥٧].

سەبارەت بە میر مەحمودی ئەفغانی دوای ئەنجامدانی ئەو کارانە و هەستکردنی بە تاوان بەرامبەر بەو کوشتارەی کە ئەنجامیدا بوو، لەگەڵ خراپی ئەو بارودۆخەی کە لە ناوەوە بەرۆکی گرتبوو وەك **راپەڕین** و دژایەتی کردنی خەڵکی ئێران بەرامبەر فەرمانڕەوایەتییەکەی، لە سەرووی هەمووشیان تەهماسب میرزا، سەرەڕای هەڕەشە و مەترسییەکانی دەرەوە لەلایەن رووسیای تەزاری و دەوڵەتی عوسمانی، لە ئاکامدا بەهۆی بەرگەنەگرتن و هەرس نەکردنی ئەو بارودۆخە، تووشی شێتی هات[٢٥٨]، لەو کاتەدا ئەشرەف خان ئامۆزای میر لەلایەن هەوادارانی لە زیندان رزگار کراو لە کودەتایەکدا لە ٢٦ نیسانی١٧٢٥ز توانی میرمەحمود بکوژێت و فەرمانڕەوایی ئێران بگرێتە دەست[٢٥٩].

ئەشرەف خان دوای کوژرانی میر مەحمود دەسەڵاتی وەرگرت و یەکێکە لەمیرە بەهێزەکانی ئەفغانی، پاش وەرگرتنی دەسەڵات نازناوی (شا)ی وەرگرت، لە سەرەتای هەڵمەت و هەوڵەکانیدا ویستی ڕووبەڕووی تەهماسبی دووەم ببێتەوە بۆ ئەم مەبەستە ڕووی لە تاران کرد، توانی بەسەر تەهماسبی دووەم زاڵ بێت و ناچاری بکات ڕووبکاتە

---

(٢٥٦) شاكر صابر **الضابط**، العلاقات الدوليه ومعاهدات الحدود بين العراق وايران، دار منشورات البصرى، بغداد، ١٩٦٦، ص ص ٣٨ – ٣٩ " ن.و.بيكولوسكايا و ديگران، منبع پيشين، ص٥٩٠.

(٢٥٧) مريم مير احمدى، منبع پيشين، ص ١٨٧.

(٢٥٨) عبدالحسين زرين كوب، منبع پيشين، ص٧٣٨.

(٢٥٩) فريدون اسلام نيا، منبع پيشين، ص ١٨٥ " ميرزا عبدالنبى شيخ الاسلام بهبهانى، منبع پيشين، ص ص٦٣-٦٤. هۆكاری زیندانی كردنی ئەشرەف ئەفغانی لەلایەن میر مەحمود پێوەستە بەراكردنی تەهماسب میرزا لەو قۆڵەی كە ئەشرەف شا ئەركی چاوەدێریكردنی پێ ڕاسپێردرابوو. لارنس لاكهارت، **انقراض** سلسله...، ص١٤٢.

(مازەندەران)[٢٦٠] و لەلایەن **فەتح** عەلی خانی سەرکردەی قاجار دالّدە درا[٢٦١]، هەروەها رەخنەی توندی ئاراستەی رێککەوتننامەی ١٧٢٤ز کرد، دەستیکرد بەجەنگ کردن لەگەلّ دەولّەتی عوسمانی لەنێوان سالأنی ١٧٢٦ – ١٧٢٧ لە چەند ناوچەیەکی جیاواز سەرکەوتنی بەدەست هێنا[٢٦٢]، بەلأم لاوازی دەسەلأتی ئەشرەف شا لەئەسفەهان، بووە هۆکارێك لە٣ی تشرینی دووەمی ١٧٢٧ز رێکەوتن لەگەلّ دەولّەتی عوسمانی ئەنجام بدات کە ناسراوە بەرێککەوتننامەی ئەشرەف، دواتریش لە ماوەیەکی کورتدا رێککەوتننامەی لەگەلّ رووسیا ئەنجامدا [٢٦٣].

دەکرێت بلّێین ئەشرەف شا لە رێگەی رێکەوتنەکانی لەگەلّ دەولّەتی عوسمانی و رووسیای تەزاری نەیتوانی کۆتایی بە کێشەکانی بهێنێت، چونکە بوونی تەهماسب لە باکووری رۆژهەلأتی ئێران مەترسییەکی گەورە بوو بۆ دەسەلأتەکەی بەتایبەت دوای ئەوەی لەلایەن **فەتح** علی خانی قاجار دالّدە درا و لایەنگرانی زۆر لە دەوروبەری کۆبوونەوە، لەلایەکی دیکەوە ئەوەی زیاتر دەسەلأتی میرزا تەهماسبی بەهێزکرد، دەرکەوتنی تەهماسب قوولی بوو لەسەر شانۆی رووداوەکان لە ئێران، بەتایبەت دوای ئەوەی دەبێتە بەشێك لەدەسەلأتی.

تەهماسب قوولی دوای ئەوەی توانی بەسەر هەردوو رکابەرە بەهێزەکەی **فەتح** عەلی خان و مەحمود سیستانی زالّ بێت و لەناویان ببات، کەوتە هەولّی لابردنی مەترسی ئەبدالییەکان لە هەرات کە لە سالّی ١٧١٧ز دەسەلأتی ئەو شارەیان بۆ خۆیان دەستەبەرکردبوو، هەروەها قەلّەمرەوی دەسەلأتیان درێژ دەبۆوە بۆ ناوچەی قائن و

---

(٢٦٠) هەرێمێکە دەکەوێتە باکوری ئێران و نیزیکە لە سنوورەکانی رووسیا.

(٢٦١) عبدالحسین زرین کوب، منبع پیشین، ص ٧٤٠

(٢٦٢) لەبارەی شەرەکانی ئەشرەف ئەفغانی لەگەلّ دەولّەتی عوسمانی بڕوانە: **رضا** شعبانی، تاریخ اجتماعی..، جلد اول، ص ٢٤ " **سلیمان فائف بك، حروب الایرانیین في العراق، ترجمة:محمد خلوصی بن محمد سعید الناصری التکریتی، منشور ضمن مقالة: عبدالجبار العمر، کتاب حروب الایرانیین فی العراق، مجلة (افاق العربیة)، العدد (٣-٤)، بغداد، کانون الثانی (١٩٨٠)، ص ص١٠٩-١١٠.**

(٢٦٣) رێککەوتنامەی ئەشرەف برێتی بوو لە ١٢ بەند، گرینگترینیان دان پێدانی ئەشرەف شا بە سولّتانی عوسمانی وەك خەلیفەی موسلّمانان. بۆ زیاتر زانیاریی بگەڕێوە بۆ: روبرت دبلیو.اولسن، المصدر السابق، ص ١١٦. سەبارەت بەرووسیای تەزاری بڕوانە: منوچهر پارسا دوست، منبع پیشین، ص ٥٠.

ناوچەکانی نێزیك مەشهەد، هەرچەندە تەهماسب قوولی لەساڵی ١٧٢٧ز توانی قائن لەژێر چەنگیان دەربکات[٢٦٤].

دوابەدوای ئەو ئاڵۆزییەی کە باڵی کێشا بەسەر هەرات، بەتایبەت رکابەری و ململانێی توند لەنێوان سەرکردەکانی ئەبدالی لەسەر دەسەڵات، هەروەها راپۆرتەکانی رەزا قوولی فەرمانڕەوای مەشهەد لەبارەی ئاڵۆزییەکانی هەرات و مەترسییەکانی لەسەر مەشهەد هۆکارێك بوون بۆ گەڕانەوەی تەهماسب قوولی لە ئازەربایجان بۆ مەشهەد، کە ئەوکات خەریکی لێکۆڵینەوە بوو لەسەر باردۆخی سەربازی ناوچەکە، ئەمەش دەرفەتێکی باش بوو بۆ تەهماسب قوولی بۆ ئەوەی هێرش بکاتە سەر هەرات و دەستی بەسەردابگرێت[٢٦٥].

لە٣ی ئایاری ١٧٢٩ز تەهماسب قوولی لەگەڵ تەهماسب میرزا بەهێزێکی سێ چوار هەزار سەربازییەوە بەرەو هەرات پێشڕەوییان کرد، لەنێزیك قەڵای کافر پاش ئەوەی تەهماسب قوولی هێزەکەی تێدا جێگیر کرد لەگەڵ سوپای ئەبدالییەکان لە جەنگێکی سەختدا ڕووبەڕووی یەکدیی بوونەوە[٢٦٦]، تەهماسب قوولی توانی شکست بەهێزی ئەبدالییەکان بهێنێت و پاشەکشەیان پێ بکات، دووبارە لە شەڕێکی دیکە لە نێزیك گوندی ربات ئەبدالییەکان شکستیان خوارد، ئەو شکستەش بووە هۆکارێك کە ئەلاهیاری خان نێردەی تایبەتی خۆی بنێرێتە لای تەهماسب قوولی بەمەبەستی دانوستاندن[٢٦٧]، دوای ئەوەی تەهماسب قوولی رازی بوونی خۆی نیشاندا لەسەر دانوستاندنەکە، جەنگ کۆتایی پێهات و ئەلاهیار خان وەك فەرمانڕەوای هەرات مایەوە[٢٦٨]، بەڵام تەهماسب قوولی پێدانی باجی ساڵانەی کردە مەرج لەسەریان[٢٦٩].

دوای ئەوەی تەواوی خۆراسان کەوتە ژێر دەسەڵاتی تەهماسب میرزا و تەهماسب قوولی، زەنگێکی مەترسیدار بوو لەسەر دەسەڵاتی ئەشرەف شا، بۆیە لەئەسفەهانەوە

---

(٢٦٤) عباس اقبال اشتیانی، باقر عاقلی، منبع پیشین، ص٦١٣.

(٢٦٥) حسن مجید الدجیلی، المصدر السابق، ص٥٨" بۆ زانیاری لەبارەی ململانێی سەرکردە ئەبدالییەکان لەسەر دەسەڵات بگەڕێوە بۆ: میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص٨٨.

(٢٦٦) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص٨٩-٩٠ "محمد حسین میمندی نژاد، منبع پیشین، ص ص١٨٦-١٨٧.

(٢٦٧) لکهارت، نادرشا، ص ٤٨ " محمد حسین قدوسی، منبع پیشین، ص٩٥.

(٢٦٨) لارنس لاکهارت، **انقراض** سلسله...، ص٢٨٥.

(٢٦٩) لکهارت، نادرشا، ص٤٩" میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص ص٩٤-٩٥.

بەهێزێکی سی هەزار سەربازییەوە لەئەیلوولی ١٧٢٩ بەرەو خۆراسان بەڕێکەوت، بەمەبەستی لەناوبردنی دەسەڵاتی تەهماسب میرزا و تەهماسب قوولی[٢٧٠]، بەر لە ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ ئەشرەف (شا)ی ئەفغانی، تەهماسب قوولی توانی لەگەڵ تەهماسب میرزا بگاتە ڕێکەوتنێك، ئەویش پێدانی هەریەکە لەویلایەتەکانی خۆراسان و مازندەران و گورگان بە تەهماسب قوولی دوای ئازادکردنی ئەسفەهان[٢٧١].

هەردوو هێز لەهەمان ساڵ لەنێزیك دامغان لە کەنارەکانی ڕووباری مهماندوست ڕووبەڕووی یەکدیی بوونەوە، کە تێیدا سوپای ئەشرەف شا تووشی شکست هات و بەرەو وەرامین نێزیك تاران پاشەکشەی کرد، بەڵام تەهماسب قوولی بەردەوام نەبوو لە راوەدوونانی، بگرە هەڵسا بەدووبارە ڕێکخستنەوەی سوپاکەی[٢٧٢].

دەکرێت بڵێین جەنگی دامغان جەنگێکی یەکلایکەرەوە بوو، چونکە ئەشرەف شا هەر بەو سوپایە چوارساڵ پێشووتر توانی بووی بەسەر سوپای عوسمانی سەربکەوێت، کەچی بەرامبەر بەتەهماسب قوولی نەیتوانی خۆی رابگرێت، هەروەها ئەم جەنگە بەسەرەتای کۆتایی ئەشرەف شا و ئەفغانەکان لە ئێران هەژماردەکرێت، چونکە ئەشرەف شا نەیتوانی دوای ئەم جەنگە هیچ سەرکەوتنێك بەرامبەر بەسوپای تەهماسب قوولی تۆماربکات.

دوای شکستخواردنی ئەشرەف شا لەمهماندوست لە٢٩ی ئەیلوولی ١٧٢٩ز[٢٧٣]، جارێکی دیکە لەوەرامین هێزەکەی کۆکردەوە پاش ئەوەی داوای لە ئیسلام خان فەرمانڕەوای ئەفغانی لە تاران کرد، هێزی یەدەگی بۆ ڕەوانە بکات[٢٧٤]، بەڵام دووبارە سوپای ئەفغانی تووشی شکست هات و ئەشرەف شا بەناچاری ڕوویکردەوە ئەسفەهان، کەچی تەهماسب قوولی ئەمجارە بەپێچەوانەی جەنگی مهماندوست، سیاسەتی بەردەوام

---

(٢٧٠) **عبالرضا** هوشنگ مهدوی، منبع پیشین، ص١٤٨" **ابراهیم خلیل احمد، خلیل علی مراد، ایران و ترکیا دراسة في التاريخ الحديث والمعاصر، دارالكتب للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٩٢م، ص٤٩** "عبدالله رازی، تاریخ کامل ایران از تأسیس سلسله ماد تا **انقراض** قاجاریه، چاپ شانزدهم، انتشارات اقبال، تهران، ١٣٧٩ ه.ش، ص٤٣٩.

(٢٧١) لکهارت، نادرشا، ص ص٥١-٥٢.

(٢٧٢) عباس اقبال اشتیانی، باقر عاقلی، منبع پیشین، ص٦١٤ " م.ر. ارنوا - ك.ز.اشرافیان، منبع پیشین، ص٦٣.

(273) Pter Avery and Others, Op.Cit, P.28.

(٢٧٤) ئیسلام خان نێزیکەی ٥٠٠٠ سەربازی لە تارانەوە بەڕێکرد بەمەبەستی یارمەتیدانی ئەشرەف شا: محمد جواد مشکور، منبع پیشین، ص٢٩٨" میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص١٠٠.

بوون لەراوەدونانی سوپای ئەفغانی گرتەبەر، چونکە ستراتیژییەتی شەڕەکە وای دەخواست کە گرینگی بەبەردەوام بوون بدات[٢٧٥]، هەروەها دوای شکستخواردنی ئەشرەف شا لەوەرامین، ئیسلام خانی ئەفغانی تارانی چۆڵکرد بەبێ شەڕکردن، پاشان تەهماسب قوولی دەستی بەسەرداگرت و داوای لەتەهماسب میرزا کرد، لە تاران بمێنێتەوە بەبیانووی پاراستنی ژیانی، بەڵام لەراستیدا تەهماسب قوولی دەیویست ئازادکردنی ئەسفەهان بەناوی ئەو تۆماربکرێت و ببێتە رزگارکەری ئێران[٢٧٦].

سەبارەت بەپێشڕەویەکانی تەهماسب قوولی بەئاراستەی ئەسفەهان، خەڵکێکی زۆر چوونە پاڵی و پێوەندییان پێوەکرد، ئەمەش مەترسی زۆری خستە سەر ئەفغانەکان، بەتایبەت دوای ئەوەی تەهماسب قوولی توانی کاشان داگیربکات، بۆیە ئەشرەف شا بڕیاری جەنگێکی چارەنووسازیدا لە دەرەوەی شوراکانی ئەسفەهان[٢٧٧]، بۆ ئەم مەبەستەش ئەشرەف شا بەسوپایەکی سی هەزار کەسییەوە کە پێکهاتبوون لە غلزائی و هازارین و فارس و هەندێك لە سەربازانی عوسمانی کە نێزیکەی پێنچ هەزار سەرباز دەبوون لەسەر راسپاردەی ئەشرەف شا لەلایەن والی بەغدا ئەحمەدپاشا ناردرابوون[٢٧٨]ڕوویانکردە مورچەخورت [٢٧٩]، هۆکاری یارمەتیدانی عوسمانییەکان بۆ ئەشرەف شا دەگەڕێتەوە بۆ دڵەڕاوکێ و مەترسییەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەدەرکەوتن و ئایندەی تەهماسب قوولی[٢٨٠].

دوابەدوای ڕووبەڕووبوونەوەی هەردوو هێز لە مورچەخورت، تەهماسب قوولی توانی سەربکەوێت بەسەر ئەشرەفی ئەفغانی و ناچاری بکات ڕووبکاتەوە ئەسفەهان، پاش ئەوەی نێزیکەی حەوت هەزار کوژراوی لە دوای خۆی جێهێشت، لەگەڵ هەندێك دیل کە

(٢٧٥) مجيد دوامی، منبع پیشین، ص(خ)" میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص١٠١.

(٢٧٦) لكهارت، نادرشا، ص٥٤.

(٢٧٧) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص١٠٢.

(٢٧٨) محمد حسين ميمندی نژاد، منبع پیشین، ص١٩٨.

(٢٧٩) حسن مجيد الدجيلی، المصدر السابق، ص٥٩" حاج میرزا حسن حسینی فسائی منبع پیشین، ص٥١٢"
Fraser. J., Op.Cit, PP.97-98.

(٢٨٠) منوچهر پارسا دوست، منبع پیشین، ص٥٢.

لەناویاندا سەربازی عوسمانی بەدی دەکرا، هەروەها دوای ئەم جەنگە شاری ئەسفەهان لەلایەن سوپای تەهماسب قوولی لە هەموو لایەکەوە گەمارۆدرا[٢٨١].

بێگومان شکستخواردنی ئەشرەف شا لەمورچەخورت وکاریگەرییە دەروونییەکان لەسەری، هۆکار بوون بۆ ئەنجامدانی رەشەکوژیەکی ترسناك لەناوئەسفەهان، وەك وەلآمدانەوەیەك بۆ شکستەکەی بەرامبەر بەتەهماسب قوولی، هەڵسا بەکوشتنی شا حوسێن و هاوکارە دڵسۆزەکانی، بەشێوەیەك لاشەی شاحوسێن بەسەربڕاوی لە یەکێك لە کۆلآنەکەکانی ئەسفەهان فڕێدرا، دوای ئەنجامدانی ئەو کوشتارگەیە ئەشرەف شا توانی خۆی دەرباز بکات و لەشاری ئەسفەهان دەربچێت[٢٨٢].

لە١٦ی تشرینی دووەمی ساڵی **١٧٢٩**ز یەکەمین دەستەی سوپای تەهماسب قوولی توانیان بچنە ناو ئەسفەهان، هەروەها لەلایەن خودی تەهماسب قوولی لە رێگەی نێردەیەکی تایبەتی هەواڵی ئازادکردنی ئەسفەهان گەیاندرایە تەهماسب میرزا و داوای لێکرد بگەڕێتەوە ئەسفەهان بۆ ئەوەی تەختی (شا)یەتی وەربگرێتەوە، بەرئەنجام تەهماسب میرزا لە **٩**ی کانوونی یەکەمی **١٧٢٩**ز گەیشتە ئەسفەهان[٢٨٣]، تەهماسب قوولی کە سەرکردەی گشتیی سوپا بوو لە دوای ئازادکردنی ئەسفەهان لەلایەن تەهماسب میرزا مافی کۆکردنەوەی باجی لە ولآت پێ بەخشرا[٢٨٤]، بەمەش تەهماسب قوولی دەسەلآتی سەربازی و توانا داراییەکانی ولآتی کەوتە دەست، ئەمەش هەنگاوێکی دیکە بوو بۆ نێزیکبوونەوەی لە تەختی فارس.

سەبارەت بەچارەنووسی ئەشرەف شا، تەهماسب قوولی لەسەر راسپاردەی شا تەهماسبی دووەم، بەهێزێکی گەورە بەرەو شیراز بەڕێکەوت، لە ناوچەی زارەغان[٢٨٥] لەگەڵ پاشماوەی هێزی ئەشرەف شا ڕووبەڕووی یەکتربوونەوە، ئەمجارەیان سوپای ئەفغانی

---

(٢٨١) **عبدالعظیم رضائی**، منبع پیشین، ص١٩" نورالله لاروردی، منبع پیشین، ص ص٦٤-٦٥.

(٢٨٢) مەحمود **طلوعی**، منبع پیشین، ص٥٧" **عبدالعظیم رضائی**، منبع پیشین، ص١٩.

(٢٨٣) لارنس لاکهارت، **انقراض** سلسله...، ص٢٩٢ "

Jonas Hanway,Op.Cit, PP.33-34.
(284) Fraser. J., Op.Cit, P.100.

(٢٨٥) ئەم ناوچەیە دەکەوێتە دووری **٣٢**کم لەشیراز.

بەتەواوەتی تێکشکا[٢٨٦]، هەرچەندە ئەشرەفی ئەفغانی هەوڵیدا ئاشتی نامەی ئابڕوپارێز لەگەڵ تەهماسب قوولی ببەستێت، بەڵام ئەنجامەکەی بێهودە بوو، چونکە لەلایەن تەهماسب قوولی ڕەتکرایەوە[٢٨٧].

دوای سەرنەگرتنی هەوڵەکان، ئەشرەف شا لە شیرازەوە بەرەو لار بەڕێکەوت، بەڵام بەرپرسانی شاری لار ڕێگر بوون لە چوونی بۆناو شارەکە، بۆیە بەناچاری ڕوویکردە نرمانشیر و سیستان، لەوێشەوە بەرەو قەندەهار، بەڵام دوژمنکاری نێوان ئەشرەف شا لەگەڵ حوسێن سوڵتانی کوڕی میر مەحمود بووە هۆکارێك ڕوو لە هیرمند بکات، لەوێش لە دەوروبەری گەرمسیران لە ناوچەی گرشك ڕووبەڕووی یەکتربوونەوە[٢٨٨]، پاش ئەو شەڕە زۆرینەی سوپاکەی لێی جیابوونەوە، بۆیە لە ناوچەی بلوچستان لەلایەن کۆمەڵێکی بلوچی لە کانوونی دووەمی ١٧٣٠ز دەستگیردەکرێت [٢٨٩]، پاشان دەکوژرێت و سەرە براوەکەی بۆ شا تەهماسبی دووەم دەهێننەوە ئەسفەهان، بەمەش کۆتایی بەحوکمڕانی حەوت ساڵەی ئەفغانەکان لە ئێران هات[٢٩٠].

---

(٢٨٦) **ذبیح** الله صفا، تاریخ ادبیات ایران، تلخیص:محمد ترابی، جلد چهارم، چاپ چهارم، انتشارات فردوس، تهران، ١٣٨٤ ه.ش، ص٣١.

(٢٨٧) عبدالحسین زرین کوب، منبع پیشین، ص٧٤٣.ئەشرەف شا ئامادەبوو بەگەڕاندنەوەی هەموو ئەو کەلوپەلانەی لەباری سەفەوی کە دەستی بەسەردا گرتبوو، لەگەڵ ئازادکردنی هەموو ئەو ئافرەتانەی کەپێوەست بوون بەبنەماڵەی سەفەوی، تەنها ئەگەر تەهماسب قوولی رازی بێت بەدانوستاندنەکە:Fraser J., Op.Cit, P.101.

(٢٨٨) مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص ص١٢٤-١٢٥.

(٢٨٩) مهدی خان استرابادی، دره نادره...، ص٧٢٩ "
The New Encyclopaedia Britannica,1973-1974,Volume. 1,P.174.

(٢٩٠) **عبدالعظیم رضائی**، منبع پیشین، ص٢٠ " مهدی بامداد، ، منبع پیشین، ص٢٠١.

## تەوەری دووەم:

## هەنگاونانی تەهماسب قوولی بەرەو دەسەڵات ١٧٣٠ – ١٧٣٦

### أ – بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ عوسمانییەکان و دوورخستنەوەی تەهماسب میرزا لەدەسەڵات ١٧٣٠ – ١٧٣٢

### ١ – بەرەنگاربوونەوەی لەگەڵ سوپای عوسمانی

دوابەدوای کۆتایی هێنان بە فەرمانڕەوایەتی ئەفغانەکان لە ئێران، بەتایبەت دوای کوژرانی (ئەشرەف شا)ی ئەفغانی، تەهماسب قوولی لە یەکەمین هەنگاویدا هەڵسا بەڕەتکردنەوەی ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٧٢٧ز نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئەشرەف شا، چونکە تەهماسب قوولی ئەو ڕێککەوتننامەیەی بەشەرمەزاری بۆ مێژووی ئێران هەژمارکرد[٢٩١]، لەهەمان کاتدا کەوتە خۆئامادەکردن بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوپای عوسمانی لە هەمەدان کە بەگوێرەی ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٧٢٧ز دەستیان بەسەر داگرتبوو[٢٩٢].

---

(٢٩١) حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص٨٤.

(292) Jonas Hanway,Op.Cit, P.40.

لەلایەکی دیکەوە شا تەهماسبی دووەم بەهاندانی تەهماسب قوولی هەڵسا بەناردنی شاندێك بەسەرۆکایەتیی رەزا قوولی خان شاملو بۆ دەرباری عوسمانی بەمەبەستی گەڕاندنەوەی ناوچە داگیرکراوەکان بۆ ژێر دەسەڵاتی شاهی ئێران، لەکاتێکیشدا دەوڵەتی عوسمانی داواکارییەکە ڕەتبکاتەوە، ئەوە ئێران ناچاردەبێت بەهێز ناوچە داگیرکراوەکان وەربگرێتەوە، لەو بارودۆخەدا تەهماسب قوولی چاوەڕوانی هەوڵە دیپلۆماتییەکان نەبوو، لە شیرازەوە ڕوویکردە دیزەفول، لەوێشەوە بەرەو نەهاوەند کە حامییەکی عوسمانی تێدابوو وێرانی کرد[٢٩٣].

لەکاتی لەشکرکێشییەکەی تەهماسب قوولی بەئاراستەی هەمەدان، هەریەك لە تەیموور پاشای فەرمانڕەوای وان و خانە پاشا فەرمانڕەوای سنە لە شاری مەلایر بەرەنگاری بوونەوە، دوای شەڕێکی سەخت شکستیانخوارد و بەرەو هەمەدان پاشەکشەیان کرد، هەردوو شاری مەلایر و سنە کەوتە ژێر دەسەڵاتی تەهماسب قوولی[٢٩٤]، هەروەها سوپای شکستخواردوو لە مەلایر، جارێکی دیکە لە هەمەدان خۆیان ڕێکخستەوە بە**سەرکردایەتیی** عوسمان پاشا بەیاوەری تەیموور پاشا، ڕووبەڕووی سوپای تەهماسب قوولی بوونەوە، بەڵام سەرکەوتن یاوەریان نەبوو، بەرئەنجام هەردوو سەرکردەی عوسمانی کوژران و شاری هەمەدان کەوتە ژێر دەسەڵاتی تەهماسب قوولی، لەگەڵ دەستگرتنیان بەسەر ژمارەیەکی زۆری کەلوپەلی سەربازی[٢٩٥].

سوپا تێکشکاوەکەی عوسمانی لە هەمەدانەوە پاشەکشەیان کرد بەرەو کرماشان، بەڵام لەوێش نەیانتوانی ببنە بەربەست لەبەردەم سوپای تەهماسب قوولی، بۆیە بەناچاری شارەکەیان لەدەستدا و گەڕانەوە سەر سنووری کۆن (زەهاب و خانەقین)، ئەم شکستخواردنە سەخت و نالەبارەی سوپای عوسمانی جارێکی دیکە ڕێگەی خۆشکرد بۆ ڕاگەیاندنی جەنگ لەنێوان هەردوو وڵات[٢٩٦].

---

(٢٩٣) حسن مجيد الدجيلي، المصدر السابق، ص٦١؛ ابراهيم خليل احمد، خليل علي مراد، المصدر السابق، ص٥٠.

(٢٩٤) مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص ص١١٩ -١٢٠.

(٢٩٥) حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص٨٤. بۆ زیاتر زانیاریی لەبارەی ڕەوت و پەرەسەندنەکانی جەنگەکە بڕوانە: میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا..، ص ص١١٨ — ١٢٢.

(٢٩٦) محمد امين زكي، خلاصه تاريخ الكرد وكردستان من اقدم العصور التاريخيه، نقله الى العربيه وعلق عليه: محمد علي عوني، شركه نوابغ الفكر، القاهره، ٢٠٠٩م، ص٢١٠.

لە ١٧ی تەمووزی ساڵی ١٧٣٠ز تەهماسب قوولی ڕوویکردە ئازەربایجان، دوای ئازادکردنی هەریەکە لە شارەکانی ساوجبلاغ و مەراغە، تەهماسب قوولی هەڵسا بەکۆچپێکردنی نێزیکەی سێ هەزار کەس لەئەفشارییە کرکلوییەکانی دەوروبەری مەراغە بۆ خۆراسان(٢٩٧)، دواتر لە١٢ئابی هەمان ساڵ لە دوای شەڕێکی سەخت لە دووری دوازدە کیلۆمەتر لە شاری تەبرێز، تەهماسب قوولی توانی شکست بەسوپای عوسمانی بدات و دەست بەسەر شارەکەدا بگرێت(٢٩٨).

دوابەدوای دەستگرتنی بەسەر تەبرێز، تەهماسب قوولی سوپایەکی نارد بۆ داگیرکردنی ئەردەبیل، بەڵام بەر لەگەیشتنی سوپای تەهماسب قوولی، عوسمانییەکان شارەکەیان چۆڵکردبوو، چونکە هەواڵی نێزیك بوونەوەی سوپای (تەهماسب قوولی)یان پێگەیشتبوو(٢٩٩)، دواتر تەهماسب قوولی ڕوویکردە یەریڤان، بەمەبەستی رزگارکردنی، هەرچەندە لەلایەن تەهماسب قوولی شارەکە گەمارۆدرا، بەڵام هەڵگەڕانەوەی ئەبدالییەکان لە هەرات و ئابلۆقەدانیان بۆ شاری مەشهەد، بووە هۆکارێك کە تەهماسب قوولی هێرشەکەی بۆ سەر یەریڤان بەنیوەچڵی جێ بهێڵێت و ڕووبکاتەوە خۆراسان(٣٠٠)، بەر لە رۆیشتنیشی بۆ مەشهەد، بەمەبەستی سەرکوتکردنی ئەبدالییەکان لە هەرات و لابردنی گەمارۆی سەر مەشهەد، هەڵسا بەدەست نیشانکردنی بێستون بیگ ئەفشار وەك فەرمانڕەوای تەبرێز(٣٠١)، بێگومان ئەم سەرکەوتنانەی تەهماسب قوولی بەسەر سوپای عوسمانی کاریگەریی گەورەی دروست کرد لەسەر پێگە و ناوبانگییەکەی لەناو ئێران، هەروەها بووە پاڵنەرێکی سەرەکیش بۆ خودی تەهماسب قوولی بۆ ئەوەی هەنگاوی گەورەتر بهاوێژێت بۆ نێزیکبوونەوە لە دەسەڵاتی ڕەها.

---

(٢٩٧) احمد کاویان پور، تاریخ عمومی **اذربایجان**، **مؤسسه** انتشارات اسیا، بی جایی چاپ، ١٣٤٦ه.ش، ص١٨٣ " **رضا** زاده شفق، المصدر السابق، ص١٠٠.

(٢٩٨) محمد جواد مشکور، منبع پیشین، ص٢٩٩.

(٢٩٩) نورالله لارودی، منبع پیشین، ص٧٤.

(٣٠٠) عباس اقبال اشتیانی، باقر عاقلی، منبع پیشین، ص٦١٦ "محمد جواد مشکور، منبع پیشین، ص٢٩٩" محمد احمد ریاحی، تاریخ خوی، انتشارات توس، بی جایی چاپ، ١٣٧٢ه.ش، ص١٤٥.

(٣٠١) ایرج افشار سیستانی، نگاهی به **اذربایجان** غربی، جلد اول، **مؤسسه** انتشاراتی اموزش نسل دانش، تهران، ١٣٦٩ه.ش، ص١٨٤ " عباس پرویز، منبع پیشین، ص١٠٥.

سوپای عوسمانی لە ئەنجامی ئەو شکستانەی کە لە بەرامبەر تەهماسب قوولی تووشی هاتبوون بەناچاری داوای ئاگربەستیان کرد(٣٠٢)، لەو کاتەشدا دەنگۆی هەڵگەڕانەوەی ئەبدالییەکان لە هەرات و مەترسییەکانیان لەسەر مەشهەد، وای لەت ەهماسب قوولی کرد بەداواکارییەکەی دەوڵەتی عوسمانی رازی بێت(٣٠٣).

سەبارەت بەبارودۆخی دەوڵەتی عوسمانی، دوای سەرکەوتنەکانی تەهماسب قوولی لە بەرەکانی جەنگدا، بەدڵەڕاوکێیەوە هەواڵەکان دەگوازرانەوە بۆ دەرباری عوسمانی کە ئاڵۆزی و پشێوییەکی زۆری بۆ کاربەدەستانی عوسمانی دروستکردبوو، بەتایبەت دوای پێشکێشکردنی یارمەتییەکانی رووسیای تەزاری بۆ تەهماسب قوولی(٣٠٤).

لە ئەنجامی شکستخواردنی سوپای عوسمانی لە بەرەکانی جەنگ بەرامبەر بەتەهماسب قوولی و تێکچوونی بارودۆخی ناوەخۆیی دەوڵەتی عوسمانی رێگە خۆشکەربوون بۆ سەرهەڵدانی **راپەڕین** لە ئیستانبۆل لە٢٨ی ئەیلوولی١٧٣٠ز بە**سەرکردایەتیی** پاترۆنا خەلیل ئەلبانی وەك دەربڕین و ناڕەزایی ڕای گشتیی لەسەر لاوازی سیاسەتی سوڵتان ئەحمەدی سێیەم ١٧٠٣-١٧٣٠ و داماد ئیبراهیم پاشای سەدری ئەعزەم، هەروەها ئەم **راپەڕینە** کاردانەوەی گشتگیری هەبووە لەسەر لادانی سوڵتان و دانانی مەحمودی یەکەم کوڕی سوڵتان مستەفای سێیەم (١٧٣٠-١٧٥٤)(٣٠٥).

یەکێك لە گرینگترین هۆکارەکانی سەرهەڵدانی **راپەڕینە**کەی پاترۆنا خەلیل و دوورخستنەوەی سوڵتان ئەحمەدی سێیەم لە دەسەڵات، بریتی بوو لە واژۆکردنی پەیماننامە لەلایەن سوڵتان ئەحمەدی سێیەم لەگەڵ شا تەهماسبی دووەم، کە بووە هۆی وروژاندنی ڕای گشتیی لەناو دەوڵەتی عوسمانی بەشێوەیەك سوڵتانی عوسمانی بەلاواز وەسفکرا، بەرئەنجام ئینکیشارییەکان دەستیان بەهەڵگەڕانەوە کرد و سوڵتان ئەحمەدی

---

**(٣٠٢) الامير شكيب ارسلان، المصدر السابق، ص٢٤٤.**

**(٣٠٣) الكسندر اداموف، ولاية البصرة في ماضيها وحاضرها، ترجمة: هاشم صالح التكريتي، الجزء الثاني، مطبعة التعليم العالي، البصرة، ١٩٨٩م، ص ص٩٩ – ١٠٠.**

(٣٠٤) حسن مجيد الدجيلي، المصدر السابق، ص٦٢.

(٣٠٥) احمد پناهی سمنانی، منبع پيشين، ص١١٢.

سێیەمیان لە دەسەڵات دوورخستەوە و مەحمودی یەکەمی برازایان کرد بەسوڵتانی عوسمانی[٣٠٦].

**٢ – هەڵگەڕانەوەی ئەبدالییەکان لە هەرات**

سەبارەت بەهەڵگەڕانەوەی ئەبدالییەکان و گەمارۆدانیان بۆ مەشهەد[٣٠٧]، تەهماسب قوولی لە ئابی ١٧٣٠ز لە تەبریزەوە بەرەو مەشهەد بەڕێکەوت، هەر لە ڕێگەدا هەواڵی پاشەکشەی ئەبدالییەکانی پێگەیشت لەدەوروبەری شاری مەشهەد، کە بۆ ماوەی یەك مانگ ئەو گەمارۆیە بەردەوام بوو[٣٠٨].

پاش گەیشتنی تەهماسب قوولی بۆ مەشهەد و مانەوەی نێزیکەی چوار مانگ لەو شارە، توانی لەو ماوەیەدا خۆی ئامادە بکات بۆ هێرشکردنە سەر هەرات، لەو **هەلومەرجەدا**، زولفەقار سەرکردەی ئەبدالی و فەرمانڕەوای فراە داوای لە فەرمانڕەوای قەندەهار کرد، بەمەبەستی یارمەتیدانی لە بەرانبەر هێرشە چاوەڕوانکراوەکەی تەهماسب قوولی، لە بەرانبەردا فەرمانڕەوای قەندەهار هەڵسا بەڕەوانەکردنی نێزیکەی ٢٠٠٠ تا ٣٠٠٠ جەنگاوەر **بەسەرکردایەتیی** محەمەد سیدال خانی غەلزائی[٣٠٩].

تەهماسب قوولی لە ٢٤ی ئازاری ١٧٣١ز بەرەو هەرات لەشکرەکەی بەڕێکرد و لە ناوچەی (نەقرە) سوپاکەی جێگیر کرد، کە نێزیکەی حەوت میل لە هەرات دوورە، دوای ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ هێزی ئەبدالی توانی شکستیان پێ بدات و پاشەکشەیان پێ بکات بەرەو هەرات[٣١٠]، سەرکەوتنی تەهماسب قوولی لە ناوچەی (نەقرە)، بەتایبەت لە ئایاری ١٧٣١ز بڕیاری هێرشێکی بەرفرەوانی دا بەمەبەستی گەمارۆدانی هەرات لە

---

(٣٠٦) دونالد ولبر، المصدر السابق ص ٩٧. بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی بارودۆخی دەوڵەتی عوسمانی لەڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی کاریگەرییەکان و بەرئەنجامەکانی لەسەر ڕاپەڕینەکەی پاترۆنا خەلیل ئەلبانی بڕوانە: روبرت دبليو.اولسن، المصدر السابق، ص ص١٣١-١٥٥" **محمد** فريد بگ المحامي، المصدر السابق، ص٣١٨.

(٣٠٧) محمد **كاظم** مروی وزير مرو، منبع پيشين، ص١٥٢.

(٣٠٨) ميرزا مهدى خان استرابادى، دره نادره...، ص٧٣٠ ؛ لكهارت، نادرشا، ص٧٣.

(٣٠٩) لكهارت، نادرشا، ص٧٤ "

The New Encyclopaedia Britannica,1973-1974, Volume.1,P.174.

(٣١٠) نورالله لارودى، منبع پيشين، ص٥٧.

هەموو لایەکەوە، بۆیە لەسەرەتادا توانی کۆنترۆڵی ڕووباری هاری رود و پردەکەی بکات لە ناوچەی مالان[٣١١].

هەرچەندە سوپای ئێران لەژێر تۆپبارنی توندی ئەفغانەکان بوو، بەڵام نەبووە بەربەست لەبەردەم لەشکرکێشییەکەی تەهماسب قوولی بەرەو هەرات، توانی گوندەکانی (دەنو، ناگهان، کیان) داگیر بکات، دواتر هەڵسا بەناردنی بەشێکی سوپاکەی بۆ داگیرکردنی گرشك و زمینداور، هەروەها بەشێکی دیکە لە سوپاکەی بەمەبەستی داگیرکردنی فراە، بەڵام سەرکەوتن یاوەریان نەبوو، لەو **هەلومەرجە**شدا تەهماسب قوولی توانی هەرات گەمارۆ بدات[٣١٢].

سیدال خانی فەرمانڕەوای فراە لەگەڵ هێزەکانی غەلزائی و ئەبدالی هەوڵیدا گەمارۆکەی سەر هەرات بشکێنێت، پاش ئەوەی لەشار دەرچوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوپای تەهماسب قوولی، بەڵام تووشی شکستی سەخت هات و گەڕایەوە ناو هەرات، ئەم کارەی سیدال خان بووە هۆی ئەوەی کە گەمارۆی سەر شارەکە لەلایەن تەهماسب قوولی توندتر بکرێت [٣١٣]، هەروەها زولفەقار سەرکردەی ئەبدالی بەیاوەری هێزێکی ئەبدالی لە تەموزی ١٧٣١ز لە شار دەرچوون بۆ بەرەنگاربوونەوەی تەهماسب قوولی، لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەیان لەسەر پردی هاری رود شکستیان خوارد، لەو کاتەدا سیدال خان لە هەرات پاشەکشەی کرد بەرەو فراە، بۆیە ئەبدالییەکان بەناچاری داوای دانوستاندنیان کرد بەمەبەستی خۆبەدەستەوەدانیان[٣١٤].

---

(٣١١) ئەم ڕووبارە ئێستە سنووری هەر یەکە لە ئێران و ئەفغانستان لەلایەك و ئێران و کۆماری تورکمانستان لەلایەکی دیکەوە لێك جیا دەکاتەوە، سەرچاوەی ئەم ڕووبارە دەکەوێتە شاخی بابا لە ناوچەی باختری ئەفغانسان و باشووری تورکمانستان، درێژییەکەی لە سەرچاوە تاکو دەرچوونی لە خاکی تورکمنستان نێزیکەی ١١٢٠کم دەبێت، هەروەها سەبارەت بەناوی ڕووبارەکەش بەهۆی ڕەت بوونی لەباکوری هەرات، ئەو ناوەی هەڵگرتووە. عباس جعفری، گیتاشناسی ایران (رودهاو رودنامە ایران)، جلد دوم، **مؤسسە جغرافیایی** وکارتوگرافی گیتاشناسی، تهران، ١٣٧٦هـ.ش، ص٤٧٨.

(٣١٢) میرزا مهدی خان استرابادی، درە نادرە...، ص٧٣٢" لکهارت، نادرشا، ص ص ٧٤-٧٥.

(٣١٣) نوراللە لارودی، منبع پیشین، ص٥٧.

(٣١٤) میرزا مهدی خان استرابادی، درە نادرە...، ص٧٣٢" لکهارت، نادرشا، ص٧٦.

جێگەی ئاماژەپێکردنە ئەبدالییەکان دوای ١٠ مانگ لە گەمارۆدانی شارەکەیان، بەرئەنجام لە شوباتی ١٧٣٢ز فەرمانڕەوای هەرات ئەڵاهیار خان خۆبەدەستەوەدانی خۆی ڕاگەیاند، پاشان تەهماسب قوولی بەیاوەری سوپاکەی چوونە ناو هەرات[٣١٥]، یەکەمین کاردانەوەی تەهماسب قوولی لە هەرات دوای خۆبەدەستەوەدانی خەڵکی شارەکە، هەڵسا بەئاهەنگ گێڕان، دواتر بۆ چاوترساندنی خەڵکەکە سەری زیاتر لە سێ سەد جەنگاوەری کوژراوی ئەبدالی بەسەری رمەکانی جەنگاوەرەکانی سوپای تەهماسب قوولی هەڵواسران، هەروەها ئەڵاهیارخان و دارودەستەکەی دوورخستەوە بۆ مۆلتان و زیاتر لە شەست هەزار ئەبدالی کۆچ پێکران بۆ مەشهەد و نیسابور و دامغان[٣١٦]، لە شوێنی کۆچکەرە ئەبدالییەکان ژمارەیەك لە خانەوادەی فارسی لە شوێنیان نیشتەجێ کرد، مەبەست لەم کارەشی کەمکردنەوەی پێوەندیی هۆزایەتی بوو لەنێوان دانیشتووان هەرات[٣١٧].

دوا بەدوای ئەو ڕووداوانە دەنگۆی شکستەکانی شا تەهماسبی دووەم بەرامبەر بە عوسمانییەکانی پێگەیشت، بۆیە بڕیاری گەڕانەوەیدا بۆ مەشهەد بەمەبەستی خۆئامادەکردن بۆ بەرەنگاربوونەوەیەکی نوێ لەگەڵ عوسمانییەکان[٣١٨].

## ٣ – دوورخستنەوەی تەهماسب میرزا لە دەسەڵات

دوای دەست بەکاربوونی مەحمودی یەکەم وەك سوڵتانی عوسمانی، هەڵسا بەدەرکردنی فەرمانێك بۆ هێرشکردنە سەر ئێران بە**سەرکردایەتیی** ئەحمەد پاشای والی بەغدا، مەبەستیش لەدەرکردنی ئەو فەرمانە ڕەواندنەوەی ئەو گرژی و ئاڵۆزییانە بوو، کە باڵی کێشابوو بەسەر دەوڵەتی عوسمانی[٣١٩].

لەلایەکی دیکەوە سەرقاڵبوونی تەهماسب قوولی بەسەرکوتکردنی ئەبدالییەکان لە هەرات، ڕێگەی خۆشکرد بۆ شا تەهماسب میرزا کە ئەو دەرفەتە بقۆزێتەوە،

---

315(Krusinski., The History of the Late Revolutions of Persia, Volume. II ,P.214 ؛ .میرزا مهدی خان استرابادی، دره نادره...، ص٧٣٢

(٣١٦) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص ص١٦٦-١٦٧ " لکهارت، نادرشا، ص٧٧.

317(Fraser. J., Op. Cit, P.103.

(٣١٨) لکهارت، نادرشا، ص٨٥.

(٣١٩) علی شاکر علی، **تاریخ العراق فی العهد العثمانی (١٦٣٨ – ١٧٥٠م)، منشورات مکتبة ٣٠ تموز، نینوی، ١٩٨٥، ص١٨٢.**

**بەسەرکردایەتییکردنی** سوپایەك لە ئەسفەهانەوە ڕوویکردە تەبرێز و لەوێشەوە بیستون بیگ ئەفشار فەرمانڕەوای شارەکەی لە پۆستەکەی دوورخستەوە و **محەمەد** قوولی خان وەك فەرمانڕەوای نوێی تەبرێز دەست نیشانکرد[٣٢٠]، پاشان بەسوپایەکی زەبەلاحی هەژدە هەزار سەربازی ڕوویکردە نەخچەوان و یەریڤان بەمەبەستی بەرەنگاربوونەوەی سوپای عوسمانی[٣٢١].

دوا بەدوای لەشکرکێشییەکەی تەهماسب میرزا بەرەو یەریڤان توانی بۆ ماوەی هەژدە ڕۆژ گەمارۆی شارەکە بدات، بەمەبەستی داگیرکردنی، بەڵام بەهۆی کەمبوونی ئازووقە بۆ سوپاکەی دەستی لە ئابلۆقەدانەکە هەڵگرت و بەرەو سوڵتانییە گەڕایەوە، کە دەکەوێتە دووری پێنچ فەرسەخ لە شاری هەمەدان [٣٢٢]، لە بەرامبەریشدا سوپای عوسمانی هەر لەدوای دەرچوونی فەرمانەکەی مەحمودی یەکەم لە تەمووزی ١٧٣١ز توانیان کرماشان داگیر بکەن، هەروەها میرنشینی ئەردەڵانیش خرایەوە ژێر قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی دوای ئەو هێرشەی کە لەلایەن خالید پاشای میری بابان ئەنجام درا[٣٢٣]، دوابەدوای بڵاوبوونەوەی هەواڵەکانی لەشکرکێشیی سوپای عوسمانی بەرەو هەمەدان، تەهماسب میرزا لە گوندێك بەناوی کردخان[٣٢٤] لە ١٦ی ئەیلولی ١٧٣١ز ڕووبەڕووی سوپای عوسمانی بۆوە بە**سەرکردایەتیی** ئەحمەد پاشا والی بەغدا [٣٢٥].

---

(٣٢٠) **رضا** شعبانی، تاریخ تحولات سیاسی — اجتماعی ایران در دورەهای افشاریه و زندیه، چاپ چهارم، سازمانی **مطالعة** و تدوین کتب علوم انسانی دانشگاهها(سمت)، تهران، ١٣٨١هـ.ش، ص٢٧.

(٣٢١) **رضا** شعبانی، تاریخ اجتماعی..، جلد اول، ص٦٠.سەبارەت بەهۆکارەکانی هاویشتنی ئەو هەنگاوە لەلایەن شا تەهماسب میرزا، دەگەڕێتەوە بۆ نیشاندانی توانا و لێهاتووی خودی تەهماسب میرزا لەلایەك و ئیرەیی و مەترسییەکانی دەوروبەرانی شا تەهماسب لە سەرکەوتن و ناوبانگییەکانی تەهماسب قوولی، کە بەردەوام تەهماسب میرزایان ئاگەدار دەکردەوە لە مەترسییەکانی تەهماسب قوولی لەسەر دەسەڵاتەکەی. روبرت دبليو.اولسن، المصدر السابق، ص ١٦٦.

(٣٢٢) احمد پناهی سمنانی، منبع پیشین، ص ص١١٥-١١٦ "

Krusinski, Volume.II, Op.Cit , P.212.

(٣٢٣) **سعدى عثمان حسين، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر، منشورات مكتبة سوران، اربيل، ٢٠٠٦م، ص٣٠٢.**

(٣٢٤) ئەم ناوە لەلایەن ابراهیم بگ حلیم بە کوریجان هاتووە. ابراهیم بگ حلیم، **التحفة الحليمية في تاريخ الدولة العلية، الطبعة الاولى، مؤسسة الكتب الثقافية، بيروت، ١٩٨٨م، ص١٦٦.**

(٣٢٥) علی الوردی، المصدر السابق، ص١١٢ " محمد **کاظم** مروی وزیر مرو، منبع پیشین، ص ص٢٢٠-٢٢١.

پاش بەرەنگاربوونەوەی هەردوو سوپا لە کردخان، تەهماسب میرزا و سوپاکەی شکستیان خوارد، بۆیە تەهماسب میرزا بەناچاری پاشەکشەی کرد بەئاراستەی ئەسفەهان، لەراستیدا ئەو شوێنانەی کە تەهماسب قوولی بەگرانی بەدەستی هێنابوو، لە ماوەی یەك مانگدا لەلایەن تەهماسب میرزا لەدەست درا(٣٢٦)، ئەحمەد پاشای والی بەغدا دوای ئەوەی توانی زەبرێکی کوشندە لە سوپای ئێران بدات لە کردخان، هەریەکە لە شارەکانی هەمەدان و کرماشانی داگیرکرد، هەروەها عەلی پاشا فەرماندەی سوپای عوسمانی لە سنووری یەریڤان توانی شاری مەراغە و تەبرێز داگیربکات(٣٢٧).

لەلایەکی دیکەوە دوای تێکچوونی بارودۆخی سوپای ئێران و نێزیکبوونەوەی عوسمانییەکان لە ئەسفەهان، کە ترس و دڵەڕاوکێی زۆری هێنابووە ئاراوە، تەهماسب میرزا بەناچاری لە قوم ڕوویکردە تاران و لەگەڵ ڕاوێژکارانی کۆبوونەوەی ئەنجامدا، دوای گۆڕینەوەی بۆچوونەکان، بڕیاردرا داوای ئاشتی بکەن لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، بۆ ئەم مەبەستە داواکارییەکەی ئێران لەلایەن محەمەد باقر خان و محەمەد ڕەزا قوولی خان گەیاندرانە کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی(٣٢٨).

دوای ڕازیبوونی دەوڵەتی عوسمانی لەسەر داواکارییەکەی ئێران، ئامادەکاری پێویست کرا بۆ ئەنجامدانی گفتوگۆ لەنێوان هەردوو وڵات، کە بەسەرپەرشتی هەر یەکە لە ئەحمەد پاشا والی بەغدا وەك نوێنەری دەوڵەتی عوسمانی و محەمەد ڕەزا قوولی خان ڕێگەپێدراوی ئێرانی ئەنجامدرا، دواتر لەساڵی **١٧٣١**ز ڕێککەوتن لەسەر پەیماننامەیەك کە ناسراوە بەپەیماننامەی ئەحمەد پاشا(٣٢٩)، کە گرینکترین بەندەکانی بریتی بوو لەوەی

---

(٣٢٦) **عبالرضا** هوشنگ مهدوی، منبع پیشین، ص١٥٠ " شاهین مکاریوس، تاریخ ایران، مصر، ١٨٩٨، ص١٩٩.

(٣٢٧) محمد جواد مشكور، منبع پیشین، ص ٣٠٠ " ایرج افشار سیستانی، منبع پیشین، ص ص١٨٤-١٨٥" حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص٨٥.

(٣٢٨) حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص٨٥ " ابراهیم بگ حلیم، المصدر السابق، ص١٦٦.

(٣٢٩) **شاكر صابر الضابط، المصدر السابق، ص٤٣.** لەبارەی هۆکارەکانی ڕازیبوونی دەوڵەتی عوسمانی بە داواکارییەکەی تەهماسب میرزا بگەڕێوە بۆ: ستیڤن هیمسلی لونگریك، المصدر السابق، ص١٦٩.

کە ڕووباری ئاراس(٣٣٠) لە ئازەربایجان و دەرنە و دەرتەنگ لە ڕۆژهەڵاتی بەغدا دەبنە بناخەیەك بۆ سنووری هەردوو دەوڵەت(٣٣١)، هەروەها گەنجە و تەفلیس و ڕوان و هەموو ناوچەکانی شیڕوان و شەماخی و داغستان بەهەموو پاشکۆکانییەوە دەدرێت بەدەوڵەتی عوسمانی، لە بەرانبەریشدا تەبرێز و ئەردەڵان و کرماشان و هەمەدان و حەوێزە و لورستان بۆ ئێران دەمێنێتەوە(٣٣٢).

تەهماسب قوولی پاش ئەوەی هەواڵی شکستەکانی شا تەهماسبی دووەم و بەستنی پەیماننامەی ئاشتی بەرامبەر بە دەوڵەتی عوسمانی پێگەیشت، لە هەراتەوە گەڕایەوە مەشهەد(٣٣٣)، هەر لەوێشەوە نامەی ئاراستەی فەرمانڕەوای هەرێمەکان کرد و پەیماننامەی ئاشتی بۆ ڕوونکردنەوە و داوای لێکردن پێویستە ئەو پەیماننامەیە هەڵبوەشێتەوە، چونکە بەزیانی ئێران تەواو دەبێت و تەهماسب میرزای بەناپاك لە قەڵەمدا(٣٣٤)، هەروەها نێردەی تایبەتی خۆی ناردە دەرباری عوسمانی بۆ ئەوەی پەیامی

---

(٣٣٠) ئەم ڕووبارە برێتییە لە سنوورێکی سروشتی لەنێوان ئێران و کۆماری ئازەربیجان و ئەرمەنستان، سەرچاوەی ئەم ڕووبارە دەکەوێتە شاخی بینگوڵ داغ، لەکۆتایدا دەڕژێتە دەریای خەزەر، درێژیەکەی نێزیکەی ٩١٠کم دەبێت.بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: عباس جعفری،... (رودهاو رودنامه ایران)، جلد دوم، منبع پیشین، ص١٠٤.

(2) Jonas Hanway,Op.Cit, P.64.

(٣٣٢) **شاکر صابر الضابط، المصدر السابق**، ص٤٣.سەبارەت بەبەندەکانی پەیماننامەی ئەحمەد پاشا، (حسن مجید الدجیل)ی باس لە گەڕاندنەوەی کەرەستەی جەنگی دەست بەسەرداگیرا، هەروەها پێشکێشکردنی یارمەتی لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی بۆ زیارەتکەرانی ئێرانی بۆ شوێنە پیرۆزەکان و هەموو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی دەکات، لەگەڵ ئازادکردنی دیلەکانی هەردوولا: حسن مجید الدجیلی، المصدر السابق، ص ص٧٨-٧٩. لەهەمان کاتدا زۆرینەی سەرچاوەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە لە پەیماننامەکەدا باس لە ئاڵوگۆڕکردنی دیلەکان نەکراوە: عباس اقبال اشتیانی، باقر عاقلی، منبع پیشین، ص٦١٧ " حسن کریم جاف، المصدر السابق، ص٨٦. لەلایەکی دیکەوە پرسی باس نەکردنی ئاڵوگۆڕکردنی دیلەکان بەهانەیەکی باش بوو بۆ تەهماسب قوولی بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەو خاڵەوە کە چارەنووسی دیلەکان وەلانراون هێرش بکاتە سەر دەوڵەتی عوسمانی: روبرت دبلیو.اولسن، المصدر السابق، ص١٧١ "

P. SYKES, Op. Cit, P.343.

(٣٣٣) **رضا** شعبانی، تاریخ تحولات...، ص٢٦.

(٣٣٤) **عبالرضا** هوشنگ مهدوی، منبع پیشین، ص١٥٠ "ج.ج. **لوریمر، دلیل الخلیج، القسم التاریخی، الجزء الاول، ترجمة: قسم الترجمة بمکتب امیر دولة قطر، الدوحة، بدون تاریخ، ص١٣٩.**

تەهماسب قوولی بگەیەنێتە سوڵتانی عوسمانی کە سەردارانی سوپای ئێران بەو پەیماننامەیە هەرگیز رازی نابن و لەسەر دەوڵەتی عوسمانی پێویستە هەموو ناوچە داگیرکراوەکان چۆڵ بکات، لە کاتێکیشدا داواکەی ڕەتبکرێتەوە پێویستە سوڵتان و حکوومەتەکەی خۆیان ئامادە بکەن بۆ جەنگ(٣٣٥).

لەو **هەلومەرجەدا** پێوەندییەکانی رووسیا و ئێران پێشوەچوونێکی گەورەی بەخۆیەوە بینی، بەتایبەت دوای ئەوەی رووسیا یارمەتی سەربازی پێشکێش بەئێران کرد لە جەنگەکانی دژ بەدەوڵەتی عوسمانی لە بەرەی قەوقاز، لە هەنگاوێکی دیکەدا بۆ نێزیك بوونەوە لە ئێران، رووسیای تەزاری ئامادەی خۆی نیشاندا لەسەر گرێدانی پەیماننامەی ئاشتی کە لە سەرەتای شوباتی ١٧٣٢ز لە شاری رشت لەنێوان هەردوولا مۆرکرا، دواتر ئەم پەیماننامەیە ناسرا بەپەیماننامەی رشت (٣٣٦)، کە گرنکترین بەند تێیدا بۆ ئێرانییەکان برێتی بوو لە گەڕاندنەوەی شارەکانی گەیلان و مازندەران و ئەستەرئاباد، کە بەگوێرەی پەیماننامەی پترۆسبۆرگ درابوون بەرووسیا، هەروەها پابەند بوونی رووسیا بەپاشەکشە پێکردنی سوپاکەی لەو شارانە بۆ دواوەی ڕووباری کورا کە خاڵی جیاکەرەوەیە لەنێوان موڵکەکانی هەردوو دەوڵەت(٣٣٧).

پاش یەکلاکردنەوەی کێشەکانی لەگەڵ رووسیا، تەهماسب قوولی بەسوپایەکی نێزیکەی ٦٠ هەزار سەربازییەوە لە مەشهەدەوە ڕوویکردە تاران، هەر لەوێشەوە حەسەن عەلی بیگ موعیر ئەلمەمالیك و میرزا کافی خولەفا و مەلا عەلی ئەکبر مەلاباشی و میرزا ئەبولقاسم کاشانی ڕەوانەی ئەسفەهان کرد، بەمەبەستی گەیاندنی پەیامی نارەزایی تەهماسب قوولی بۆ شا تەهماسب میرزا (٣٣٨).

---

(٣٣٥) محمد حسین میمندی نژاد، منبع پیشین، ص ص٣٠٤-٣٠٥ " اصغر جعفر ولدانی، منبع پیشین، ص ١٨ "عبدالله رازی، منبع پیشین، ص٤٤٠.

(٣٣٦) کمال **مظهر** احمد، المصدر السابق، ص٢١" عباس اقبال اشتیانی وحسن بیرینا، **تاریخ ایران بعد الاسلام من بدایة الدولة الطاهریه وحتی نهایة الدولة القاجاریة ٢٥٠هـ/٨٢٠م-١٣٤٣هـ / ١٩٢٥م، ترجمة: محمد علاء الدین منصور، راجحة: السباعی محمد السباعی، دار الثقافة للنشر والتوزیع، القاهرة، ١٩٩٠، ص ص٧٠٠-٧٠١.**

(٣٣٧) بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی پەیماننامەکە بگەڕێوە بۆ: J.C. Hurewitz, Op.Cit ,PP.45-47.

(٣٣٨) **رضا** شعبانی، تاریخ تحولات...، ص٢٩.

لە پەیامەکەیدا تەهماسب قوولی داوایکردبوو پێویستە شا تەهماسب میرزا پەیماننامەکەی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی هەڵبوەشێنێتەوە، چونکە بەهیچ شێوەیەك بەو پەیماننامەیە رازی نابێت و ڕەتیدەکاتەوە، هەروەها داوای لە شا تەهماسب میرزا کردبوو ڕووبکاتە تاران یاخود قوم بەمەبەستی شەڕکردن لەگەڵ سوپای عوسمانی[٣٣٩]، کەچی داواکارییەکەی تەهماسب قوولی لەلایەن شا تەهماسب میرزا ڕەتکرایەوە و داوای لێکرد بگەڕێتەوە ئەسفەهان[٣٤٠].

تەهماسب قوولی داواکەی شا تەهماسب میرزای قبوولکرد و رێگەی ئەسفەهانی گرتەبەر، بەڵام لە دەوروبەری ئەسفهان لە باغی هەزار جریب سوپاکەی جێگیر کرد، دواتر هەڵسا بەئەنجامدانی کۆبوونەوەیەك لەگەڵ گەورە فەرماندارەکانی سوپا، بۆی ڕوونکردنەوە کە مەرامی شا تەهماسب لەو ئاشتییەی کە ئەنجامی داوە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی کۆتایی هێنانە بەسوپا و هەڵوەشاندنەوەی، هەروەها جەختی کردەوە لەوەی ئەگەر بتانەوێ خۆتان لەو کێشەیە رزگاربکەن پێویستە شا تەهماسب دووربخرێتەوە لە دەسەڵات و کوڕە هەشت مانگییەکەی لە جێگەی بکرێتە شا، ئەو کاتەش رێگە خۆش دەبێت بۆ بڕینی پێوەندیی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی و ڕەتکردنەوەی پەیماننامەی ئەحمەد پاشا، ئەم بۆچوونەش لەلایەن فەرماندارەکانەوە قبوولکرا[٣٤١].

دوابەدوای ئەو هەنگاوانە، تەهماسب قوولی لە ٤ی ئەیلوولی ١٧٣٢ز شا تەهماسب میرزای لە دەسەڵات دوورخستەوە و (عەباسی سێیەم)ی کوڕە هەشت مانگییەکەی شا تەهماسبی وەك (شا)ی ئێران دانا و خۆشی وەك جێنشین[٣٤٢]، دواتر هەڵسا بەلێدانی

---

(٣٣٩) عبدالحسین صنعتی زاده کرمانی، نادر فاتح دهلی، چاپ اول، دنیای کتاب، تهران، ١٣٨٦هـ.ش، ص٢٨ " **رضا** زاده شفق، المصدر السابق، ص١٠٤.

(٣٤٠) مهدی بامداد، منبع پیشین، ص٢٠٥.

(6) Fraser. J, Op.Cit ,PP.105-106 "

حاج میرزا حسن حسینی فسائی منبع پیشین، ص٥١٨-٥١٩" شوالیه شاردن، منبع پسشین، ص ص١٧٨٧-١٧٨٨.

(٣٤٢) عەلی حەرب، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣٢.

سکە(پارە) و خوێندنەوەی وتار بەناوی (شا)ی نوێ، پاشان تەهماسب میرزای دوورخستەوە بۆ خۆراسان[٣٤٣].

لە یەکەم هەنگاویدا دوای ئەوەی کە وەك جێنشین دەست بەکاربوو، هەڵسا بەدەست نیشانکردنی ژمارەیەك لەلایەنگرە دڵسۆزەکانی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات، بەتایبەت گۆڕینی فەرمانڕەوای هەرێمەکان بەکەسانی نێزیك و دڵسۆز لە خۆی[٣٤٤]، لێرەدا تەنیا هەنگاوێك دەمێنێت بۆ گەیشتنی بەبەرزترین پایەی دەسەڵات، ئەمەش هەرکاتێك خۆی خوازیار بێت دەتوانێت دەستەبەری بکات، چونکە هیچ بەربەستێکی لەبەردەم نەماوە ڕێگری لێ بکات.

## ب – لەشکرکێشییەکانی بەئاراستەی عێراق و نێزیکبوونەوەی لە دەسەڵاتی ڕەها (١٧٣٢ – ١٧٣٦ز)

### ١- هەڵمەتەکانی تەهماسب قوولی بەئاراستەی عێراق ١٧٣٢ -١٧٣٣:

ڕێککەوتننامەکەی تەهماسب میرزا بیانوێکی باشی دایە تەهماسب قوولی بۆ ئەوەی لە دەسەڵات دووری بخاتەوە و خۆشی وەك جێنشینی شا کاروباری وڵات بگرێتە دەست، پاشان هەڵسا بەهاندانی سەرکردە ئێرانییەکان بۆ گەڕاندنەوەی موڵکەکانیان کە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی داگیرکرابوون، پاش ئەنجامدانی ئەو کارانەشی هەنگاوەکانی لەشکرکێشیی بەئاراستەی بەغدا خستە بواری جێبەجێکردن[٣٤٥]، لە سەرەتادا تەهماسب قوولی نامەیەکی هەڕەشەئامێزی ئاراستەی (ئەحمەد پاشا)ی والی بەغدا کرد و تێیدا بەڵێنی پێدا لەشکرکێشیی بەرەو بەغدا دەکات بەمەبەستی ئازادکردنی[٣٤٦].

---

(٣٤٣) سەبارەت بەچۆنییەتی کرداری دورخستنەوەی تەهماسب میرزا لە دەسەڵات بڕوانە: میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص ص٢٤٦-٢٤٨ " احمد پناهی سمنانی، منبع پیشین، ص ص١١٧-١٢١" السید عبدالله بن السید نورالدین بن السید نعمت الله الجزائری، منبع پیشین، ص١١٥ "

Peter Avery and Others, Op.Cit, P.31.

(3) Krusinski, Op.Cit, Volume. II, PP.217-218.

(٣٤٥) شوکرەڵای بابان، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٢ " ستیڤن هیمسلی لونگریك، المصدر السابق، ص١٦٩.

(٣٤٦) **جعفر الخیاط، صور من تاریخ العراق في العصور المظلمة، الجزء الأول، الطبعة الاولى، بغداد، ١٩٧١م، ص١٣١**" سەبارەت بەناوەڕۆکی نامەکە بگەڕێوە هەمان سەرچاوە، ص١٣١.

تەهماسب قوولی لە یەکەمین هەنگاویدا لە ساڵی ١٧٣٢ز شارە گرینگەکانی ئێران وەك هەمەدان و کرماشان و ئەردەڵان لەژێر چنگی دەوڵەتی عوسمانی دەرهێنا، بەشێوەیەك ئەم سەرکەوتنانە هانی تەهماسب قوولی دا سیاسەتی دوژمنکارانەی بەرامبەر بەعێراق لەبەرچاو بگرێت وبەهێزیکی (١٠٠) هەزارسەربازییەوە رێگە بگرێتەبەر بەمەبەستی داگیرکردنی شاری بەغدا[٣٤٧]، لە ٢٨ی تشرینی دووەم ١٧٣٢ تەهماسب قوولی توانی دەست بەسەر زەهاب دابگرێت، پاش ئەوەی دەستی بەتاڵان و کاولکاری کرد لە ناوچەکە، هەڵسا بەگواستنەوەی ئەحمەد بەگ فەرمانڕەوای شارەکە بۆ خۆراسان، دواتر بەرەو بەغدا هەنگاوی هەڵهێنا و لە ڕێگەدا دەستی گرت بەسەر کفری و دوزخورماتوو، ژمارەیەکی زۆری خەڵکەکەی کۆچپێکرد بەرەو خۆراسان بەتایبەت خێڵی بەیات[٣٤٨].

لەلایەکی دیکەوە تەهماسب قوولی لە دوزخورماتوو بەشێك لە سوپاکەی نارد بۆ داگیرکردنی کەرکوك و موسڵ بەمەبەستی بڕینی رێگەکانی پێوەندیی لە بەغدا، لەگەڵ گەیشتنی سوپای تەهماسب قوولی بۆ کەرکوك و هەوڵدانی زۆریان بۆ گرتنی شارەکە، بەڵام بێهودە بوو، چونکە بەرگرییەکانی خەڵکی شارەکە بەربەستبوون لەبەردەم داگیرکاری شارەکە لەلایەن سوپای ئێرانی، بۆیە ئەم سوپایە جگە لەوەی ژمارەیەکی زۆری خەڵکیان کوشت و دەوروبەری شارەکەیان وێرانکرد، زیانی گەورەشیان بەبەروبوومی کشتوکاڵی ناوچەکە گەیاند[٣٤٩].

---

(٣٤٧) **عماد عبدالسلام، صمود البصرة اثناء حصار نادر شا سنتة ١٧٤٣، مجلة(المورد)، مجلد(١٤)، العدد(٣)، (١٩٨٥)، ص٢١**. هەندێك لە سەرچاوە فارسییەکان پێیان وایە ژمارەی سوپای تەهماسب میرزا (٦٥هەزار) سەرباز بوونە: **محمد** حسین قدوسی، منبع پیشین، ص ٢٢٩" نوراللە لارودی، منبع پیشین، ص٧٩.

(٣٤٨) نرسیس صائغیان، صفحه منسیه من تاریخ نادر شا، **مجله** (لغه العرب)، **الجزء** الخامس، السنه السابعه، العدد(٧١)، ایار ١٩٢٩م، ص٣٨٠ " حسین حزنی موکریانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٢. لەو بارەیەوە **محمد** حسین میمندی نژاد پێی وایە خەڵکەکە خۆیان داوایان لە تەهماسب قوولی کردووە بیانگوازێتەوە بۆ خۆراسان: **محمد** حسین میمندی نژاد، منبع پیشین، ص٣٦٥.

(٣٤٩) ستیڤن هیمسلی لونگریك، المصدر السابق، ص١٧٠" **سعدی عثمان حسین، المصدر السابق، ص ص٣٠٤-٣٠٥"عماد عبدالسلام، دراسات وثائقیة في تاریخ الکرد الحدیث، مطبعة الثقافة، اربیل، ٢٠٠٨م، ص٨٠-٨١**. بۆ زانیاریی پتر لەبارەی هێرشەکەی سوپای ئێران بۆ سەر کەرکوك بڕوانە: **سهیل قاشا، حملات**

جەنگ لە کەرکووك نێزیکەی دە ڕۆژ بەردەوام بوو، بەڵام سوپاکەی تەهماسب قوولی دوای بەرەنگاربوونەوەیان لەلایەن خەڵکی شارەکە بەناچاری پاشەکشەیان کرد بەرەو دوزخورماتوو، بەمەبەستی پێوەندیکردن بەسوپای سەرەکیی کە لەخۆئامادەکردن دابوون بە**سەرکردایەتیی** تەهماسب قوولی بۆ داگیرکردنی شاری بەغدا(٣٥٠)، هەروەها ئەو هێزەی بەڕێکەوتبوو بەمەبەستی داگیرکردنی شاری موسڵ، توانیان پەلاماری قەڵای هەولێر بدەن، هەرچەندە لۆنگریك باس لەو ڕووداوە ناکات، بەڵام شتێکی سرووشتیە، چونکە هەولێر دەکەوێتە سەر ڕێگەی موسڵ(٣٥١).

سوپای ئێران بە**سەرکردایەتیی** نەرگز خان لە **٣١**ی ئازاری **١٧٣٣**ز گەیشتنە گردەڵۆکەکانی غەزلانی لە باشووری موسڵ، پاش تێکدان و کرداری کاولکاری چەندین دێهات لەسەر ڕێگەیان بەتایبەت دێر مارئیلیا لە دووری پێنج کیلۆمەتر لە باشووری موسڵ(٣٥٢)، پاشان لە دەوروبەری کۆشکی (عەلی قدوم)(٣٥٣) سوپاکەی جێگیر کرد(٣٥٤)، دوابەدوای بەگژیەکداچوونی هەردوو هێز، سوپای ئێرانی بەهۆی بەرگری و بەرپەچدانەوەی توندی خەڵکی موسڵ بە**سەرکردایەتیی** حوسێن پاشا جەلیلی والی موسڵ، تووشی شکست هاتن و پاشەکشەیان کرد، بەتایبەت دوای کوژرانی نەرگز خانی

---

**نادر شا على العراق في الوثائق السريانيية، مجلة (كاروان)، القسم الاول، العدد(٧٤)، اربيل، نيسان(١٩٨٩م)، ص١٥٦" بطرس حداد، حملة نادرشا على العراق سنة ١١٤٥ه في وثيقة السريانيية، مجلة (بين النهرين)، العدد(٣٣)، بغداد، ١٩٨١م، ص ص٩١-٩٩.**

(٣٥٠) نرسيس صائغيان، المصدر السابق، ص٣٨١.

(٣٥١) ستيڤن هيمسلي لونگريك، المصدر السابق، ص١٧٠" سعدى **عثمان** حسين، المصدر السابق، ص٣٠٥.

(٣٥٢) **روبرت دبليو.اولسن، المصدر السابق، ص ١٧٦.**

(٣٥٣) ئەم کۆشکە لە ساڵی ١٠٩٨ لەلایەن والی عەلی قدوم دروستکراوە، ئەم کەسایەتییە دووجار وەك والی موسڵ دەستنیشانکراوە، لەلایەن باب ئەلعالی بە (عارەب عەلی پاشا) ناسراوە، سەبارەت بەکۆشکی عەلی قدوم زیاتر بە ئیوان ناوبانگی دەرکردووە، کە دەکەوێتە ناوچەی غەزلانی لە بەرەی باشووری شاری موسڵ. **سيار الجميل، حصار الموصل الصراع الاقليمي واندحار نادرشاة(صفحة لامعة في تكوين العراق الحديث)، الطبعة الاولى، بيت الموصل، الموصل، ١٩٩٠م، ص١٢٧.**

(٣٥٤) **سهيل قاشا، الموصل فى العهد الجليلى، الطبعة الاولى، التنوير، بيروت، ٢٠١٠م، ص٥٦" سليمان صائغ، تاريخ الموصل، الجزء الأول، المطبعة السلفية، مصر، ١٩٢٣م، ص ص٢٧٥-٢٧٦.**

سەرکردەی هێزەکە[٣٥٥]، پاشان جەنگاوەرانی موسڵ سەری نەرگزخانیان بەسەری رمێکەوە هەڵواسی، وەك دەربڕینێکی خۆشی بۆ سەرکەوتنەکەیان[٣٥٦].

تەهماسب قوولی بەیاوەری سوپاکەی لە دوزخورماتوو بەئاراستەی بەغدا هەڵمەتەکەی دەستپێکرد، دوای تێپەڕبوونیان لە شاخی حەمرین لە نێزیك شارەبان بەرەنگاری هێزێکی دە هەزار سەربازی عوسمانی بوونەوە توانیان بەسەریاندا زاڵ بن و شکستیان پێ بدەن[٣٥٧]، دوای ئەو سەرکەوتنە بەسەر سوپای عوسمانی، تەهماسب قوولی لە بەهروز توانی ڕووباری سیروان ببڕێت و لە بەغدا نێزیك بێتەوە، هەرچەندە ئەحمەد پاشای میری کۆیە و هەریر هەولێدا لەنێزیك کەرکووك سوپای هێرشبەر تێکبشکێنێ، بەڵام نەك هەر سەرکەوتوو نەبوو، بگرە لە شەڕەکەدا گیانی لەدەستدا و ژمارەیەکی زۆریش لە سەربازانی بەدیل گیران[٣٥٨]، سەبارەت بەهەڵوێستی میرنشینی بابانیش لە هەڵمەتی یەکەمی تەهماسب قوولی بۆ بەغدا، بریتی بوو لە هەڵوێستی بێ لایەنی، چونکە خالید پاشای میری بابان بەرژەوەندیی میرنشینەکەی لە سەرووی هەموو شتێکی دیکە دانابوو، هەرچەندە بۆچوونی دیکەش هەیە کە گوایە میری بابان سەرەڕای هەڵوێستی بێ لایەنی هەر زوو هەولێداوە هەڵوێستی بگۆڕێت و ڕوو بکاتە تەهماسب قوولی[٣٥٩].

لە ناوەڕاستی کانوونی دووەمی ساڵی **١٧٣٣**ز سوپای ئێران گەیشتە بەری رۆژهەڵاتی بەغدا، دوای شەڕێکی خوێناوی لەگەڵ هێزی بەغدا تەهماسب قوولی توانی سوپاکەی بگوازێتەوە بۆ بەری رۆژئاوا، پاش ئەوەی سەرکەوتووبوون لە دروستکردنی پردێك لە باکووری بەغدا لەسەر ڕووباری دیجلە، دواتر توانیان خۆیان بگەیەنن

(٣٥٥) سليمان صائغ، المصدر السابق، ص٢٧٧.

(٣٥٦) سعيد الديوەچي، صمود الموصل امام غزو نادر شا سنه ١١٥٦هـ، (المورد)، مجلد(١٥)، العدد(٣)، (١٩٨٦)، ص ص٤٤-٤٥" عماد عبدالسلام **رؤوف**، الموصل في العهد **العثماني** فتره الحكم المحلي، **مطبعة** اداب، النجف، ١٩٧٥م، ص١٠٠.

(٣٥٧) نورالله لارودی، منبع پيشين، ص٨٩" لكهارت، نادرشا، ص٩٥.

(٣٥٨) محمد امين زكي، المصدر السابق، ص٢١١.

(٣٥٩) بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی هەڵوێستی میرنشینی بابان لە هەڵمەتەکانی تەهماسب قوولی بۆ بەغدا بڕوانە : **سعدى عثمان حسين، امارة بابان في النصف الاول من القرن الثامن عشر(دراسة في علاقاتها السياسيةمع السلطات العثمانيية)، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٠م، ص ص٤٥-٤٦.**

بەشوراکانی بەغدا و لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی بدەن [٣٦٠]، بەگەمارۆدانی بەغدا لەلایەن سوپای تەهماسب قوولی، بارودۆخی خەڵکی لەناو شارەکەدا ناهەموار و دژوار کرد، بەتایبەت دوای ئەوەی تەهماسب قوولی گەیشتە ئەو بڕوایەی کە بەهێرشی راستەخۆ ناتوانێت بەغدا داگیر بکات، هەڵسا بەپێڕەوکردنی گەمارۆدانی درێژخایەن، لە راستیدا لەو رێگەیەوە توانی تاڕادەیەك سەرکەوتن بەدەست بهێنێت[٣٦١].

کاریگەریی گەمارۆدانەکە، کاردانەوەیەکی زۆری کردبووە سەر خەڵکی بەغدا، هەروەها نەگەیشتنی یارمەتیی سەربازی لە ئیستانبۆڵەوە کەمێکی مابوو بەرگرییەکانی بەغدا تووشی دارمان بێت، بەڵام رۆڵی ئەحمەد پاشا لەپێڕەوکردنی سیاسەتێکی ژیرانە لەو ماوەیەدا توانی تاڕادەیەك ورەی خەڵك لە بەغدا بەرزبکاتەوە و دوژمنەکەشی چەواشە بکات[٣٦٢]، هەروەها لەکاتێکدا دانیشتووان بەغدا دەیانناڵاند بەدەست برسێتی و قاتووقڕی، سەربازانی ئێرانی لە خۆشگوزەرانیدا بوون، چونکە رێگەی بەدەست هێنانی

---

(٣٦٠) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص ص١٩٦-١٩٨" **سعدی عثمان حسین، کوردستان الجنوبية..، المصدر السابق، ص٣٠٦-٣٠٧**" محمد **كاظم** مروى وزير مرو، منبع پيشين، ص ص٢٦٥-٢٦٦. ئەندازیارێکی ئەوروپی یاوەری تەهماسب قوولی لە هەڵمەتەکەی بۆ سەر بەغدا، سەرکەوتووانە توانی پردێك دروست بکات بۆ پەڕینەوەی سوپای ئێران: ريجارد كوك، بغداد مدينه السلام، ترجمە:**مصطفى جواد، فؤاد جميل، الجزء الثاني، بغداد، ١٩٦٧م، ص٧٢** " **علاء** موسى **كاظم** نورس **(الصراع العثمانی – الفارسي واثره في العراق حتى اواخر القرن الثامن عشر) في، نزار عبدالطيف الحديثى و اخرون، الحدود الشرقية للوطن العربى، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨١م، ص٥٦" عبدالهادى حائرى**، نخستين رويارووييهاى انديشەگران ايران، چاپ دوم، مؤسسە انتشارات امير كبير، تهران، ١٣٧٢ ه.ش، ص ص١٩٢-١٩٣. دەربارەی هەنگاوەکانی تەهماسب قوولی لە گەمارۆدانی بەغدا بڕوانە: محمد حسين ميمندى نژاد، منبع پيشين، ص ص٣٦٩-٣٧٠.

(٣٦١) علي الوردی، المصدر السابق، ص١١٤. سەبارەت بەبارودۆخی خەڵکی بەغدا لە کاتی گەمارۆدانەکەی تەهماسب قوولی بڕوانە: **علاء** موسى **كاظم نورس**، العراق فى العهد **العثمانى...، ص١٥٩" بطرس حداد، المصدر السابق، ص٩٧.**

(٣٦٢) محمد جواد مشكور، منبع پيشين، ص٣٥١" **علاء** موسى **كاظم** نورس، العراق فى العهد **العثمانى**...، ص١٥٩" ستيڤن هيمسلى لونگريك، المصدر السابق، ص١٧٣.

خواردەمەنی لە هەموو ناوچەکانی عێراق بۆیان ئاوالا بوو، لەگەڵ ئەوەش بازاڕی سەربازگەکەیان پڕبوو لە کاڵای هەرزان و جۆراوجۆر[٣٦٣].

لە سەرەتای حوزەیرانی **١٧٣٣**ز یارمەتییە سەربازییەکانی عوسمانی گەیشتە شاری موسڵ بە**سەرکردایەتیی** توبال عوسمان پاشا[٣٦٤]، کەبریتی بوو لە هێزێکی هەشتا هەزار سەربازی[٣٦٥] لەوێشەوە ڕوویکردە شاری کەرکووك و نامەیەکی ئاراستەی ئەحمەد پاشا کرد، تێیدا دڵنیای کردەوە لە گەیشتنی سوپای عوسمانی بۆ یارمەتی دانیان لەلابردنی گەمارۆی سەر شارەکەیان[٣٦٦]، بۆ ئەم مەبەستەش سوپای عوسمانی پێشڕەوی کرد بەرەو بەغدا، لەو ماوەیەدا چەندین نامەی هەڕەشەئامێز لەلایەن تەهماسب قوولی ئاراستەی توبال عوسمان پاشا کرا، تێیدا جەختی لەوە دەکردەوە کە زۆر ئارەزوومەند دەبێت گەشتەکەی توبال پاشا کەمێك خێرا بێت بۆ ئەوەی کۆتایی پێ بهێنێت[٣٦٧]، هەروەها لەکاتی نێزیکبوونەوەی توبال عوسمان پاشا لەسامەڕا نامەیەکی دیکەی تەهماسب قوولی پێگەیشت، داوای لێکرد ئامادەیە بۆ بەرەنگاربوونەوەی لە هەر سات و شوێنێك کە خودی توبال عوسمان پاشا ئارەزووی دەکات[٣٦٨].

لە ١٩ی تەمووزی **١٧٣٣**ز هەردوو هێز لە نێزیك سامەڕا بەرەنگاری یەکتربوونەوە، لەمیانەی جەنگەکەدا سوپای ئێران تووشی شکستێکی سەخت بۆوە، کە زیانەکانیان بە

---

(٣٦٣) ستيڤن هيمسلی لونگريك، المصدر السابق، ص١٧٢.

(٣٦٤) یەکێکە لە سەرکردە دیارەکانی دەوڵەتی عوسمانی، لە ساڵی ١٦٢٩ز لە مورە لەدایکبووە، خوێندنی لە قوتابخانەی سرايلی خوێندووە لە ئەستانە، لە تەمەنی ٢٦ساڵیدا گەیشتە پلەی بەگلەربەگی، چەندین پایەی وەرگرتووە لە بۆسنەوە و رۆم ئیلی، لە ساڵی ١٧٣١گەیشتە پایەی سەدری ئەعزەم، دوای ساڵێك لە کارەکەی دوورخرایەوە و کرایە والی تەرابزۆن و تەفلیس، دواتر خانەنشین کرا، لە ساڵی ١٧٣٢ز لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی راسپێردرا بۆ سەرکردایەتیی سوپای عوسمانی دژ بەتەهماسب قوولی: علی شاكر علی، المصدر السابق، ص١٨٧.

**(٣٦٥) ازهار قاسم حسونی، المقاومة العربية للغزو الفارسي في عهد نادرشاه (١٧٣٦-١٧٤٧)، رسالَة ماجستير مقدمة الى مجلس معهد التاريخ العربي والتراث العلمي للدراسات العليا، ١٩٩٩م، ص٥١.**

(٣٦٦) ستيڤن هيمسلی لونگريك، المصدر السابق، ص١٧٤.

**(٣٦٧) سيار الجميل، المصدر السابق، ص١١٠.**

(٣٦٨) جعفر **الخياط**، المصدر السابق، ص١٣٥.

سی هەزار کوژراو سێ هەزار دیل مەزندە کراوە، لەگەڵ لەدەستدانی چەندین تۆپی قورس و کەلوپەلی جەنگی، بەرئەنجام تەهماسب قوولی لەگەڵ هێزە شکستخواردووەکەی لە ڕێگەی بەهروز پاشەکشەی کرد بۆ ناو خاکی ئێران[٣٦٩]، هەر لەهەمان ڕۆژدا والی بەغدا هێرشی کردە سەر ئەو هێزە ئێرانییەی گەمارۆی شاری بەغدایان دابوو، لە شەڕێکی سەختدا توانی شکستیان پێ بدات و ناچاریان بکات بەپاشەکشەکردن بەرەو خاکی ئێران، ژمارەی ئەو هێزە ئێرانییە نێزیکەی دوازدە هەزار سەرباز دەبوو، کە بەبڕیاری تەهماسب قوولی بەر لە ڕۆیشتنی بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوپای عوسمانی لەوێ جێگیری کردبوون بۆ بەردەوامیدان بەگەمارۆدانی شاری بەغدا[٣٧٠].

هەرچەندە تەهماسب قوولی دوای شکستخواردنی لە ١٩ی تەمووزی ١٧٣٣ز بەرامبەر بەتوبال عوسمان پاشا و سەرنەکەوتنی هەوڵەکانی بۆ داگیرکردنی بەغدا، پاش گەمارۆدانی بۆ ماوەی حەوت مانگ، بەڵام ملکەچی ئەو دۆڕاندنە نەبوو، هەر دوای سێ مانگ لە خۆڕێکخستنەوە دووبارە هەڵمەتەکانی دەست پێکردەوە بەمەبەستی داگیرکردنی شاری بەغدا[٣٧١]، بەتایبەت لە ١٢ی تشرینی یەکەمی ١٧٣٣ز لە هەمەدانەوە بە**سەرکردایەتیی** هێزێکی چل هەزار سەربازییەوە ڕوویکردە کەرکووك بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی توبال عوسمان پاشا کە ئەو کات لە دەوروبەری ئەو شارە بوو بەمەبەستی گەڕانەوەی بۆ ئیستانبوڵ، چونکە تەهماسب قوولی پێی وابوو تاکو بەسەر توبال عوسمان پاشا سەرنەکەوێت داگیرکردنی بەغدا بەئەنجام ناگات[٣٧٢].

تەهماسب قوولی لەمیانەی لەشکرکێشییەکەی ڕوویکردە سووورداش لەوێشەوە بەشێك لە سوپاکەی بەئاراستەی ئاق دەربەند بەڕێکرد، وەك هەوڵدانێك بۆ ڕاکێشانی توبال عوسمان

---

(٣٦٩) نورالله لاوردی، منبع پیشین، ص٨٠" سعدی **عثمان** حسین، المصدر السابق، ص ص٣٠٧- ٣٠٨" **عبدالجبار محمود السامرائی، انماط من الحصار علی العراق(١١٥٦ه – ١٧٤٣م)، مجلة (المورد)، العدد(٩٠)،** (١٣٧٤ه.ش/١٩٩٦م)، ص٢٣. سەبارەت بەهۆکارەکانی شکستی تەهماسب قوولی بڕوانە:**محمد** جواد مشکور، منبع پیشین، ص٣٥١.

(٣٧٠) **الکسندر اداموف،** المصدر السابق، ص١٠١"محمد امین زکی، المصدر السابق، ص٢١١ "
Jonas Hanway,Op.Cit, P.88.

(٣٧١) ابراهیم خلیل احمد، خلیل علی مراد، المصدر السابق، ص٥٠.

(٣٧٢) ستیڤن هیمسلی لونگریك، المصدر السابق، ص١٧٨.

پاشا و دەرهێنانی لە کەرکووك، لەهەمان کاتدا بەشێکی سوپاکەی بە**سەرکردایەتیی** محەمەد خان قاجار بەئاراستەی بەغدا ڕەوانە کرد بەمەبەستی گەمارۆدانی[٣٧٣]، لەو هەلومەرجەدا سوپای عوسمانی بە**سەرکردایەتیی** ممش پاشا لەدەربەندی ئاق دەربەند ڕووبەڕووی سوپای ئێران بۆوە، پاش شەڕێکی توند سوپای عوسمانی کە نێزیکەی بیست هەزار سەرباز دەبوون، شکستیان خوارد بەرامبەر بەسوپای ئێران[٣٧٤].

شیاوی باسکردنە میرنشینە کوردییەکان (سۆران، بادینان، بابان) یارمەتی سەربازییان نارد بۆ لەشکری عوسمانی، بەڵام بێ سوود بوو، جارێکی دیکە کوردستان بۆوە گۆڕەپانی جەنگ لەنێوان هەردوو دەوڵەت، بەتایبەت دوای ئەوەی تەهماسب قوولی توانی بەسەر ئەو هێزەدا سەرکەوێت لە زەهاب کە بەربەست بوو لەبەردەم هەڵمەتەکەی بەرەو کەرکووك، دواتریش دەستگرتنی بەسەر سووورداش کە مەڵبەندێکی دەوڵەمەندە بەخۆراك و داهات، تەهماسب قوولی سوودی زۆری لەو ناوچە بینی بۆ دابینکردنی خۆراك بۆ سوپاکەی، لەگەڵ ئەوەشدا بەتوندترین شێوە کەوتە گیانی هۆزە کوردییەکان و سەرکوتکردنیان بەتایبەت هۆزی بلباس[٣٧٥].

جەنگی یەکلاکەرەوە لە **٢٦**ی تشرینی یەکەمی ساڵی **١٧٣٣**ز ڕوویدا لەنێوان هەردوو هێز لە دەشتی لەیلانی باشووری ڕۆژهەڵاتی کەرکووك[٣٧٦]، سەرەڕای کەمی سوپای عوسمانی لەچاو سوپای ئێران، لە سەرەتادا چەند سەرکەوتنێکیان بەدەست هێنا، بەڵام دواتر هاوکێشەکە پێچەوانە دەبێتەوە، دوای ئەوەی سوارەی (خەیالەی) ئێرانی توانی ناوەڕاستی سوپای عوسمانی ببڕێت، لە ئەنجامدا سوپای عوسمانی تووشی شکستێکی توند بۆوە پاش کوژرانی توبال عوسمان پاشا[٣٧٧]، بەمەش جەنگی لەیلان لە

---

(٣٧٣) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص ص٢١٩-٢٢٠.

(٣٧٤) **سعدی عثمان حسین، کوردستان الجنوبیة**..، المصدر السابق، ص ص٣٠٩-٣١٠" عباس اقبال اشتیانی، باقر عاقلی، منبع پیشین، ص٦١٩.

(٣٧٥) سعدی **عثمان** حسین، کوردستان الجنوبیه..، ص٣٠٩.

(٣٧٦) **سیار الجمیل، المصدر السابق، ص١١٢.**

(٣٧٧)**محمد کاظم** مروی وزیر مرو، منبع پیشین، ص ص٣٣٠-٣٣١ "

Peter Avery and Others, Op.Cit, P.32.

سەبارەت بەهۆکارەکانی شکستخواردنی توبال عوسمان پاشا بگەڕێوە بۆ: علی شاکر علی، المصدر السابق، ص١٩٢.

بەرژەوەندیی تەهماسب قوولی کۆتایی پێهات، سەرەڕای زیانی گیانی لە هەردوولا کە مەزندە دەکرێت لایەنی ئێرانی نێزیکەی (١٠) هەزار کوژراوی هەبێت و لایەنی عوسمانی نێزیکەی (٢٠) هەزار کوژراو بەدیل گیرانی ژمارەیەکی زۆری سەربازانی عوسمانی، سەرەڕای لەدەستدانی نۆ سەرکردەی سەربازی یاوەر لەگەڵ توبال عوسمان پاشا و تەواوی کەلوپەلی جەنگی عوسمانی[٣٧٨].

تەهماسب قوولی دوای سەرکەوتنەکەی لە لەیلان درێژەی بەهەڵمەتەکەیدا لە رێگەی خالّس بەئاراستەی بەغدا، هەروەها لە ناوچەی قەرەتەپە بەشێکی سوپاکەی بە**سەرکردایەتیی** باباخان شاملو راسپارد بۆ کۆنترۆڵکردنی حله و نەجەف و کەربەلا بەمەبەستی بڕینی رێگەکانی گەیاندنی کۆمەکی و یارمەتییەکان بۆ شاری بەغدا[٣٧٩]، لەو بارودۆخەشدا دانیشتووان بەغدا، لەبەر کەمی خواردەمەنی و کەمی هێزی بەرگرییکاریەوە دەیانناڵاند، سەرەڕای زیادبوونی ترس و دڵەڕاوکێ دوای بڵاوبوونەوەی دەنگۆی کوژرانی توبال عوسمان پاشا و نێزیك بوونەوەی تەهماسب قوولی لە بەغدا، بۆیە والی بەغدا لەو **هەلومەرجەدا** بڕیاریدا ئەوەی ناتوانێت لە شار بمێنێتەوە بۆی هەیە شار جێ بهێڵێت، بەمەش خەڵکێکی زۆر شاری بەغدایان جێهێشت[٣٨٠].

سوپای ئێران بە**سەرکردایەتیی** تەهماسب قوولی لە ١٥ی تشرینی دووەمی **١٧٣٣**ز دەستیکرد بەگەمارۆدانی شاری بەغدا، هەروەها زۆر بەتوندی جەختی دەکردەوە لەسەر داگیرکردنی، بەڵام هەڵگەڕانەوەی محەمەد خان بلوج[٣٨١]، چونکە لە دوای ئەو هەواڵە

---

(٣٧٨) **محمد حسين قدوسى**، منبع پيشين، ص٢٣٩. سەبارەت بەناشتنی تەرمی تۆبال عوسمان پاشا راوبۆچوونی جیاواز هەیە لەوانە شاکر سابیر پێی وایە لەکەرکوك نێژرابێت، لەلایەکی دیکەوە علی شاکر عەلی لە پەراوێزەکەیدا هەرچەندە جەخت لەوە دەکاتەوە کە سەرچاوە فارسییەکان باس لە گەڕانەوەی تەرمەکە دەکەن بۆ بەغدا و لە گۆڕستانی ئەبوحەنیفە نێژراوە، بەڵام خۆی باس لەبوونی گۆڕێك دەکات لە گۆڕستانی کەرکوك کە گوایە گۆڕی توبال پاشا بێت: شاکر صابر **الضابط**، المصدر السابق، ص٤٤" علی شاکر علی، المصدر السابق، ص١٩١.

(٣٧٩) ستيڤن هيمسلی لونگريك، المصدر السابق، ص١٨٠ " عباس العزاوی، المصدر السابق، **الجزء** الخامس، ص٢٤٣.

(٣٨٠) علی الوردی، المصدر السابق، ص١١٧.

(٣٨١) لە سەردەمی فەرمانڕەوای ئەفغانەکان لە ئێران نوێنەری ئەفغانەکان بوو لە دەوڵەتی عوسمانی، لە ساڵی ١٧٢٩ز دوای رووخانی دەسەڵاتی ئەفغانەکان، لە ئیستانبۆل دەگەڕێتەوە، یەکەمین کاری کە ئەنجامیدا پێشکێشکردنی هەموو دیارییەکانی سوڵتانی عوسمانی بەتەهماسب قوولی کە وەك دیاری ناردرابوون بۆ

تەهماسب قوولی داوای ڕێکەوتنی لەگەڵ والی بەغدا کرد[٣٨٢]، گرینگترین مەرج بۆ ڕێکەوتنی ئاشتی کەتەهماسب قوولی پێشنیازی کرد بۆ والی بەغدا برێتی بوو لەگەڕاندنەوەی هەموو تۆپە ئاگرینەکانی سوپای ئێران کەلەلایەن دەوڵەتی عوسمانی دەستی بەسەردا گیرابوو لەهەمەدان[٣٨٣].

دوا بەدوای ڕازی بوونی والی بەغدا بەپێشنیازەکەی تەهماسب قوولی، دانوستاندن دەستیپێکرد، کەبۆ ماوەی حەوت ڕۆژ بەردەوام بوو، دواتر لە ١٩ی کانوونی یەکەم ١٧٣٣ز گەیشتنە بەستنی ڕێککەوتننامەی ئاشتی، لە گرینگترین خاڵەکانی جەخت کرایەوە لەسەر سنووری هەردوو دەوڵەت، هەروەها دەسبەرداربوونی دەوڵەتی عوسمانی لە هەموو ناوچەکانی کە دەستی بەسەرداگرتبوو، لەگەڵ پرسی ئاڵوگۆڕکردنی دیلەکان و پێشکێشکردنی ئاسانکاریی پێویست لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی بۆ زیارەتکەرانی ئێرانی بۆ مەزارگە پیرۆزەکان[٣٨٤]، پاش ڕێککەوتننامەی ئاشتی، تەهماسب قوولی لە بەغدا دەستیکرد بەپاشەکشەکردن کە بۆ ماوەی بیست ڕۆژ لەژێر ئابلۆقە و گەمارۆی سوپای ئێراندا بوو [٣٨٥]، پاشان ڕوویکردە کازمییە و کەربەلاو نەجەف بەمەبەستی سەردانی مەزراگە پیرۆزەکان[٣٨٦].

لە ٢٢ی کانوونی یەکەمی١٧٣٣ز تەهماسب قوولی لە ڕێگەی کرماشان چووە ناو تەبرێز، چەندین گۆڕانکاریی کارگێڕی و سەربازی ئەنجامدا، لەوانە دەست نیشانکردنی پروبگ ئەفشار وەك سەرکردەی هێزی سەربازی ئازەربایجان، هەروەها عاشوور خان پاپاڵوی

---

ئەشرەف شا، لەو کاتەوە لەلایەن تەهماسب قوولی کرایە فەرمانڕەوای کوهگیلویە، هەروەها لە هەڵمەتی یەکەمی تەهماسب قوولی بۆ بەغدا بەشداریکرد، بەڵام لە هەڵمەتی دووەمدا بەهاوکاری حاکمی شوشتەر هەڵگەڕانەوەی خۆیان ڕاگەیاند: سید **مصطفى** تقوی مقدم، تاریخ سیاسی کهگیلویە، چاپ اول، **مؤسسە مطالعات** تاریخ معاصر ایران، تهران، ١٣٧٧هـ.ش، ص ص٧٥-٧٦.

(٣٨٢) محمد **كاظم** مروی وزیر مرو، منبع پیشین، ص٣٣٧ " عباس اقبال اشتیانی وحسن بیرینا، المصدر السابق، ص٧٠٦" محمد امين زكي، المصدر السابق، ص٢١٢.

(٣٨٣) شاكر صابر **الضابط**، المصدر السابق، ص٤٤.

(٣٨٤) **رضا** شعبانی، تاریخ اجتماعی..جلد اول، ص٦٤" ستيڤن هيمسلي لونگريك، المصدر السابق، ص١٨٠.

(٣٨٥) **باقر امين الورد، حوادث بغداد في ١٢ قرن، مكتبة النهضة، بغداد، ١٩٨٩م، ص٢١٩.**

(٣٨٦) محمد **كاظم** مروی وزیر مرو، منبع پیشین، ص٣٣٧.

ئەفشار وەك فەرمانڕەوای ئورمیە دەستنیشانکرد[٣٨٧]، دواتر داوای لە عاشوور خان پاپاڵوی ئەفشار کرد، ئامادەکاری تەواو بکات بۆ گەڕاندنەوەی نێزیکەی سێ هەزار خانەوادەی ئەفشاری لەو ناوچەیە بۆ ناوچەی ئەبیوەرد، مەبەستی نادرشا لەو کارە زیاتر قایمکردنی سنوورەکانی رۆژهەلاتی ئێران بوو[٣٨٨]، هەروەها خۆشی دوای جێبەجێکردنی ئەو کارانە ڕوویکردە خوزستان، بەمەبەستی سەرکوتکردنی هەڵگەڕانەوەکەی محەمەد خان بلوج[٣٨٩].

**٢- رەوت و پەرەسەندنەکانی ساڵانی ١٧٣٣ز — ١٧٣٥ز**

تەهماسب قوولی دوای گەڕانەوەی لە بەغدا، ڕوویکردە خوزستان و توانی بەسەر هەڵگەڕانەوەکەی محەمەد خان بلوج زاڵ بێت و دەستگیری بکات، پاشان بەفەرمانی تەهماسب قوولی کوێر دەکرێت و دەکوژرێت[٣٩٠] و هەردوو شاری شوشتەر و شیراز دەخاتەوە ژێر دەسەلاتی[٣٩١]، دواتر تەهماسب خان جەلایری بەفەرمانی تەهماسب قوولی پاش لەنێوبردنی هەڵگەڕانەوەکەی خان بلوج، هەڵمەتێکی دەست پێکرد بۆ سەر ئەو هۆزە عارەبیانەی کە یارمەتیدەری محەمەد خان بلوج بوون، ژمارەیەکی زۆریانی لێ دەستگیر کرد و ڕەوانەی خۆراسان و ئەسترئابادی کردن، هەروەها هەندێك لە سەرۆك هۆزەکانیش ناچار کران بەدانی بڕی (١٠) هەزار تومان وەك سزایەك بەرامبەر بەپاڵپشتی کردنیان لەم حەمەد خان بلوج[٣٩٢].

---

(٣٨٧) ایرج افشار سیستانی، منبع پیشین، ص١٨٥.

(٣٨٨) علی کریمیان، بازخوانی چند فرمان نادرشاه افشار، گنجینه اسناد(فصلنامه تحقیقات تاریخی)، چاپ سهند، شماره(٢٥، ٢٦)، تهران، بهار و تابستان١٣٧٦هـ.ش، ص١٣. سەبارەت بە فەرمانەکەی نادرشا بۆ کۆچپێکردنی سێ هەزار خانەوادەی ئەفشاری بۆ ئەبیوەرد بگەڕێوە بۆ پاشکۆی ژمارە (٣).

(٣٨٩) عباس اقبال اشتیانی، باقر عاقلی، منبع پیشین، ص٦١٩.

(٣٩٠) سید **مصطفی** تقوی مقدم، منبع پیشین، ص٧٧. لەبارەی هۆکار و بەرئەنجامەکانی هەڵگەڕانەوەی محەمەد خان بلوچ بڕوانە:حمید حاجیان پور، علی کامران مقدم، شورش محمد خان بلوچ در سالهای ١١٤٢هـ.ق تا ١١٤٦هـ.ق:علل و پیامدها، فصلنامه پژوهش های تاریخی (دانشگاه اصفهان)، شماره(٥)، اصفهان، بهار(١٣٨٩هـ.ش)، ص ص٣٤-٤٤.

(٣٩١) شوکرەڵا بابان، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٢.

(٣٩٢) محمد حسین میمندی نژاد، منبع پیشین، ص٣٦٨ " السید عبدالله بن السید نورالدین بن السید نعمت الله الجزائری، منبع پیشین، ص١١٩-١٢٠.

دوای هێورکردنەوەی بارودۆخی شیراز لە نیسانی ١٧٣٤ز تەهماسب قوولی ڕوویکردەوە ئەسفەهان[٣٩٣]، لە کاتی مانەوەی لەو شارەدا لە ٢٧ی کانوونی یەکەمی ١٧٣٤ز ئیمپراتۆر ئان[٣٩٤] لە ڕێگەی گۆلتزن[٣٩٥]نامەیەکی بۆ ڕەوانە کرد، تێیدا رازیبوونی رووسیای تەزاری دەرخست بوو بەگەڕاندنەوەی شارە فارسییەکانی ژێر دەسەڵاتی رووسیا، بەمەرجێك ئێران واز لەو شارانە نەهێنێت بۆ دەوڵەتی عوسمانی، هەروەها پێویستە لەسەر تەهماسب قوولی دوژمنی رووسیا بەدوژمنی خۆی بزانێت[٣٩٦]، تەهماسب قوولی رەزامەندی نیشاندا لەسەر پێشنیازەکەی ئیمپراتۆری رووسیا کە ئاکامەکەی بەبەستنی پەیماننامەی گەنجە کە لەساڵی ١٧٣٥ز بەسترا کۆتایی هات، تێیدا رووسیا باکۆ و دەربەندی گەڕاندەوە بۆ ئێران، لە بەرامبەریشدا پێوست کرا لەسەر ئێران هاوپەیمانی بەردەوامی رووسیا بێت[٣٩٧].

سەبارەت بەڕێککەوتننامەی بەغدا (١٩ی کانوونی یەکەم ١٧٣٣ز)، سوڵتانی عوسمانی ڕەزامەندی تەواوی نیشان نەدا لەسەر خاڵەکانی رێککەوتننامەکە، چونکە تەهامسب قوولی لە یەکێك لە مەرجەکانی بۆ ئاشتەوایی داوای گەڕاندنەوەی ناوچەکانی

---

(٣٩٣) **محمد حسين قدوسي**، منبع پيشين، ص٢٤٢.

(٣٩٤) لەساڵی ١٧٣٠-١٧٤٠دەسەڵاتی ڕووسیای گرتە دەست، کچی برای پەترۆسی گەورەیە، لە ماوەی حوکمڕانی ئەو ئیمپراتۆرە، حکومەتێکی ئۆتۆکراتی وڵاتی بەڕێوەدەبرد، کە چەند ڕاوێژکارێك وەك یوهان بیرن و دوق کورلاند، رۆڵی سەرەکیان تێدا بینیوە. توانیان لە ڕێگەی دەستوورێکی نووسراو دەسەڵاتی ئیمپراتۆر ئانا کەم بکەنەوە.**ماتيو اندرسون، تاريخ القرن الثامن عشر في اوروبة، ترجمة: نورالدين حاطوم، دارالفكر، دمشق، ١٩٩٦م، ص٢٥٤.**

(٣٩٥) شارەزا و دیپلۆماتییەکی ڕووسی بووە، وەك باڵیۆزی ڕووسیا کاری کردووە لە ئیسپانیا و بڕووسیا، دواتر وەك سەرۆکی شاندی ڕووسیا ڕەوانەی ئەسفەهان کراوە بۆ چاوەدێریکردنی بارودۆخی ئێران و هاندانی تەهماسب قوولی لە کۆتایی هێنان بەئاگربەست لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی. لکهارت، نادرشا، ص١١٦.

(٣٩٦. لکهارت، نادرشا، ص ص١١٦-١١٧.چەندین هۆکار هەبوون کە وای لە ڕووسیا کرد پابەند بێت بەدانەوەی شارەکان بەئێران و خۆنێزیك کردنەوەیان لە تەهماسب قوولی لەوانە هەڕەشەکانی تەهماسب قوولی لەبەستنی هاوپەیمانی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی دژ بەڕووسیا: علی اكبر بینا، منبع پيشين، ص٢٦.

(٣٩٧) لکهارت، نادرشا، ص١٢٢" سەبارەت بەبەندەکانی ڕێککەوتننامەی گەنجە بڕوانە: J.C. Hurewitz, Op.Cit ,P.46.

لای راستی کەناراوەکانی ڕووباری ئاراسی دەکرد، بەڵام میر سەرخای خانی شێروان بەو مەرجە رازی نەبوو، پێی باش بوو سەر بەدەوڵەتی عوسمانی بێت، هەروەها ئەو ناوچەیە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە لە ڕێگەی جەنگەوە دەستی بەسەرداگیرابوو، بۆیە جارێکی دیکە جەنگێکی مەترسیدار لەنێوان هەردوو وڵات هەڵگیرساوە[٣٩٨].

سوپای عوسمانی بە**سەرکردایەتیی** عەبدوڵا کوپرلو لە ١٨ی حوزەیرانی **١٧٣٥**ز لە ناوچەی بەغاوەند لەنێزیك قارس ڕووبەڕووی سوپای تەهماسب قوولی بوونەوە، هەرچەندە سوپای عوسمانی لە ڕووی ژمارە و چەکەوە باشتربوون لە سوپای ئێران، بەڵام تووشی شکست هاتن و هەریەکە لە عەبدوڵا کوپرلوی سەرکردەی سوپا و مستەفا سارو والی دیاربەکر کوژران، بەم سەرکەوتنە سوپای ئێران توانی هەر یەکە لە شارەکانی تەفلیس و یەریڤان و گەنجە بخاتەوە ژێر دەسەڵاتی[٣٩٩]، دوای ئەو ڕووداوە سوڵتانی عوسمانی ڕەزامەندی تەوای نیشاندا لەسەر ڕێککەوتننامەی بەغدا، بۆ ئەم مەبەستەش دەسەڵاتی تەواو درا بەوالی بەغدا بۆ دەستپێکردنەوەی گفتوگۆ، کە چەند مانگێکی خایاند، بەڵام ئەنجامێکی یەکلاکەرەوەی نەبوو[٤٠٠].

دەکرێت بڵێین دوای ئەو سەرکەوتنانەی تەهماسب قوولی بەدەستی هێنا، هەرچەندە وەك جێنشینی شا بوو، بەڵام ئامانجەکانی بۆ گەیشتن بەدەسەڵاتی راستەقینە لەناخی تەهماسب قوولی هەر بە زیندوویی مابۆوە، بگرە لە کارە سەرەکییەکانی بوو کە چەندین ساڵ کاری بۆ کردبوو، بۆ بەجێگەیاندنی ئەو خەونە تەنیا قۆناخێك لەبەردەمی مابوو ئەویش لە ڕێگەی گردبوونەوەی موغان توانی ئەو بەربەستە ببڕێت و خەونەکانی بەدی بهێنێت.

---

(٣٩٨) حسن مجيد الجيلي، المصدر السابق، ص٨٠.

(٣٩٩) حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص ٩٠. بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی جەنگەکە و لەدەستدانی (تەفلیس و گەنجە و یەریڤان) لەلایەن سوپای عوسمانی بڕوانە: میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای..، منبع پیشین، ص ص ٢٥٤-٢٥٩.

(٤٠٠) **سيار الجميل، المصدر السابق، ص١١٤**. سەبارەت بە داواکردنی ئاشتی لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ نادرشا پاش کوژرانی عەبدوڵا کوپرلوی دەگەڕێتەوە بۆ هەڵگیرساندنەوەی جەنگ لەگەڵ ڕووسیای تەزاری. **الامير شكيب ارسلان، المصدر السابق، ص٢٤٦.**

## ٣- کۆنگرەی موغان[٤٠١] و مەراسیمی تاجگوزاری نادرشا

تەهماسب قوولی دوای سەرکوتکردنی هەڵگەڕانەوەکانی داغستان[٤٠٢] بەتایبەت گیلان گرای سەرکردەی لەزگی لایەنگری دەوڵەتی عوسمانی و فەرمانڕەوای کریمە، ڕوویکردە دەشتی موغان لە نێزیك ئەردەبیل، داوای لە سەرکردە و پیاو ماقولان و پیاوانی ئاینی کرد بۆ گرێدانی کۆبوونەوەیەك بەمەبەستی هەڵبژاردنی (شا)یەکی نوێ بۆ وڵات[٤٠٣]، هەر لە دەشتی موغان تەهماسب قوولی لە وتارێکدا جەختی لەسەر کارەکانی ساڵانی ڕابردووی کردەوە وەك هەوڵدان بۆ ڕێکەوتنی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی و وەرگرتنەوەی شارەکان لە رووسیای تەزاری و گەڕاندنەوەی قەندەهار بۆ ژێر رکێفی ئێران[٤٠٤]، هەروەها داوای لە ئامادەبووان کرد (شا)یەك بۆ وڵات دابنێن، لەهەمان

---

(٤٠١) موغان برێتییە لەو دەشتەی کە دەکەوێتە ئەوپەڕی باکوری ڕۆژئاوای دەریای مازندەران و باکوری ڕۆژهەڵاتی ئازەربیجان، ڕووباری ئاراس ئەم دەشتەی کردۆتە دووبەش، ئەو بەشەی کە ناسراوە بەمیل موغان دەکەوێتە ڕووسیا و بەشەکەی لەناو خاکی ئێرانە، هەروەها ڕووبەری گشتیی ئەو دەشتە نێزیکەی (٣٠٠ تا ٣٥٠) هەزار هیکتار دەبێت. رحیم هویدا، موقع جغرافیائی دشت مغان و چند رویداد تاریخی در ان، فصلنامە دانشکدە ادبیات و علوم انسانی تبریز، شمارە(٩٧ تا ١٠٠)، تبریز، ١٣٥٠هـ.ش، ، ص٧٩.

(٤٠٢) بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی هەڵگەڕانەوەکانی داغستان بگەڕێوە بۆ: میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای..، ص ص٢٦١-٢٦٥.

(٤٠٣) محمد جواد مشکور، منبع پیشین، ص٣٣٥" محمد امین ریاحی، منبع پیشین، ص١٤٦ " شاهین مکاریوس، المصدر السابق، ص٢٠٢. سەبارەت بەدیارکردنی ژمارەی ئامادەبووان لە کۆنگرەی موغان لەنێوان **مێژوونووساندا** جیاوازی بەدی دەکرێت، لەوانە سرجان ملکم و محمد حسین میمندی هاوڕان لەگەڵ میرزا مهدی خان کە ژمارەکەیان بەسەد هەزارکەس داناوە، لە بەرامبەردا هانوی ژمارەی ئامادەبووانی بە دە هەزار کەس داناوە، کەچی فریزەر تەنها شەش هەزار کەسی داناوە، سرجان مالکم پێی وایە ئەو ژمارەیە برێتییە لە ژمارەی سوپای نادر و ئەو کەسایەتییانەی بانگهێشت کراون: میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای..، ص٢٦٨ " سرجان ملکم، جلد دوم، منبع پیشین، ص٢٣ "محمد حسین میمندی نژاد، منبع پیشین، ص ٤٧٤ "
Fraser. J., Op. Cit, P114 " Jonas Hanway,Op.Cit, P.124.

(404) Michael axworthy, Op.Cit, P.637.

کاتدا پێشنیازی کرد بەگەڕانەوەی تەهماسب میرزا بۆ دەسەڵات ئەگەر ئەوان پێیان باش بێت، یاخود دانانی هەر کەسێکی دیکە کە خاوەن توانا و لێهاتوو بێت[٤٠٥].

لەمیانەی کۆبوونەوەکە تەهماسب قوولی ماوەی سێ رۆژی دیارکرد بۆ وەڵامدانەوەی داواکەی، لەهەمان کاتدا زۆر بە وردی چاوەدێری بارودۆخەکەی دەکرد لە رێگەی لایەنگرانییەوە، پاش گفتوگۆی بەردەوام لەو ماوەیەدا ئامادەبووان گەیشتنە بڕیاری کۆتایی جگە لە تەهماسب قوولی هیچ کەسێکی دیکە وەك شا قبووڵ ناکەن، هەرچەندە یەکسەر تەهماسب قوولی بەداواکەی ئامادەبووان رازی نەبوو، بگرە دوای یەك مانگ هەر سووربوونی خۆی راگەیاند لەسەر قبووڵ نەکردنی داواکارییەکە، بەڵام دواتر رازی دەبێت بەچەند مەرجێك کە بووە مایەی سەرسووڕمانی ئامادەبووان[٤٠٦]، گرینگترین ئەو مەرجانەی کە خستییە بەردەم ئامادەبووان برێتی بوون لە فەرمانڕەوایکردنی پشتاوپشتی بۆ بنەماڵەکەی، هەروەها خۆ دوورگرتن لە گەڕانەوەی بنەماڵەی سەفەوی بۆ دەسەڵات و لەهەمان کاتدا هیچ پەناگە و شوێن نەدرێت بەئەندامانی بنەماڵەی سەفەوی لە کاتێکدا بیەوێت دەسەڵات بۆ خۆی قۆرخ بکات، لەگەڵ دوورکەوتنەوەی پێڕەوکەرانی ئاینزای شیعە لەنەفرەتکردنی هەر سێ خەلیفەی موسڵمانان ئەبوبەکری سدیق، عومەری کوڕی خەتاب و عوسمانی کوڕی عەفان(ر.خ)[٤٠٧].

لەلایەکی دیکەوە پێشنیازی دانانی ئاینزاێکی نوێی بۆ کردن کە ئاینزای جەعفەرییە، لە جیاتی ئاینزای دوازدە ئیمامی[٤٠٨]، هەروەها بەتوندی رەخنەی لەو ئاینزایە گرت، کە لەلایەن شا ئیسماعیلی سەفەوی بەسەر گەلانی ئێراندا سەپێندرابوو، کە بۆتە هۆی ئەوەی ئێران تووشی شەڕ و کاولکاری بکات لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ، سەرەڕای ئەوەش بۆتە هۆکار بۆ دروستبوونی ئاڵۆزی و پشێوی و ململانێ لەنێوان نەتەوە جیاوازەکانی ئێران[٤٠٩]، هەرچەندە گۆڕینی ئاینزا لەلایەن مەلاباشی عەبدول

---

(405) P. SYKES, Op. Cit, P.343 "

میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای..، ص٢٦٨.

(406) Fraser. J., Op. Cit, PP.115-116"

حسن کریم جاف، المصدر السابق، ص٩١-٩٢" **علی الوردی، المصدر السابق**، ص١٢٢.

(٤٠٧) السید عبدالله بن السید نورالدین بن السید نعمت الله الجزائری، منبع پیشین، ص ص ١٢٠-١٢١.

(٤٠٨) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای..، ص ٢٧٠.

(٤٠٩) حسن کریم جاف، المصدر السابق، ص٩٢.

حوسێن گەورە مەرجەعی شیعە لە ئێران بەتوندی ڕەتکرایەوە، بەشێوەیەك پێی وابوو کە ئەم کارە مافی تەهماسب قوولی نییە و واباشترە خۆی لە کاروباری ئاینی هەڵنەقورتێنێت، ئەم کارەی مەلاباشی بووە هۆی ئەوەی کەبەفەرمانی تەهماسب قوولی لەناو ببردرێت بۆ ئەوەی نەتوانێت کاریگەریی لەسەر خەڵکانی دیکە چێ بکات و دژی ئەو مەرجە بوەستنەوە(٤١٠).

شیاوی باسکردنە جگە لە مەلاباشی عەبدول حوسێن گەورە مەرجەعی شیعە لەئێران، کەسێکی دیکە بەناوی ئوغزلو خان قاجار سەرکردەی قزلباش و فەرمانڕەوای قەرەباغ بەئاشکرا نارەزایەتی خۆی ڕاگەیاند و داوای کرد، کە پێویستە دەست نیشانکردنی (شا)ی ئێران لەبنەماڵەی سەفەوی بێت، هەرچەندە ئوغزلو خان کەوتە بەر تووڕەیی نادرشا، بەڵام چارەنووسی وەك گەورە مەرجەعی شیعە نەبوو، بگرە تەنیا سێ بەشی موڵکەکانی لەدەستدا و لەلایەن نادر شا دەستی بەسەردا گیرا(٤١١).

لەنێو مێژوونووساندا هۆکار و پاڵنەرەکانی گۆڕینی ئاینزای دوازدە ئیمامی و دانانی ئاینزای جەعفەری لەلایەن نادرشا، چەندین راڤەی جیاوازی بۆ کراوە، هەندێك پێیان وایە گۆڕینی ئاینزا زیاتر بۆ یەککگرتنی جیهانی ئیسلامییە لەژێر فەرمانڕەوایەتی خودی نادرشا، یاخود لە ڕێگەی ئەو ئاینزاوە بەهانەیەکی باشی بەدەستەوە بێت بۆ ئەوەی بتوانێت بەرەنگاری دەوڵەتی عوسمانی و ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی هیندی ببێتەوە(٤١٢)، هەروەها لەو ڕێگەیەوە دەتوانێت شوێنەوار و دیاردەکانی دەوڵەتی سەفەوی لە هزری خەڵکی بسڕێتەوە(٤١٣)، لەگەڵ ئەوەش نادرشا پێی وابوو لە ڕێگەی ئەو ئاینزایەوە دەتوانێت ڕیزەکانی سوپا یەکبخات کە لە تورکمان و کورد و ئەفغانی پێك دەهات و جۆرە هاوسەنگییەك چێ بکات لەگەڵ رەگەزی شیعە کە مەیلیان زیاتر دەشکایەوە بەلای بنەماڵەی سەفەوی (٤١٤).

---

(410) Fraser. J., Op. Cit, P118 " P. SYKES, Op. Cit, P.347"

**علی الوردی، المصدر السابق**، ص١٢٢ .

(٤١١) حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص٩٢.

(٤١٢) ابراهيم خليل احمد، خليل علی مراد، المصدر السابق، ص٥٢.

(٤١٣) شاهين مكاريوس، تاريخ ايران، مصر، ١٨٩٨، ص٢٠٢ " **رضا** زاده **شفق، المصدر السابق، ص١٨٥.**

(٤١٤) ستيڤن هيمسلی لونگريك، المصدر السابق، ص١٨١.

مەبەستەکانی نادرشا لە گۆڕینی ئاینزا زیاتر گرینگییەکی سیاسی لەپشت بووە، چونکە توندڕۆیی ئاینزای کە لە سەردەمی دەوڵەتی سەفەوی گرینگی پێدرابوو، هۆکار و بەهانەیەکی باش بوو بۆ **راپەرینە**کانی کوردستان و ئازەربایجان و ئاران و داغستان و ئەفغانستان، هەروەها رێگەخۆشکەربوو بۆ دەستێوەردانی دەرەکیی بەتایبەت دەوڵەتی عوسمانی و ئوزبەکەکان لە کاروباری ئێران[٤١٥]، هەروەها نادرشا ویستی لە رێگەی ئەو کارەی گەورەکانی ئەفغان و نەتەوەکانی دیکە بەلای خۆیدا رابکێشێت، لە هەمان کاتدا زەبرێکی کوشندەش ئاراستەی دەسەڵاتی فرەوانی پیاوانی ئاینزای شیعە بدات، کە هێز و دەسەڵاتی بنەماڵەی سەفەوی بوون[٤١٦].

نادرشا هەر لەموغانەوە بیرۆکە و نەخشەی فرەوانخوازییەکانی دارشتبوو، کە هەر یەکە لە ناوچەکانی قەندەهار و هیندستان و موسڵ و چەندین ناوچەی دیکەی دەگرتەوە، بەشێوەیەکی گشتیی ئەو ناوچانە زیاتر **سونە** ئاینزان، بۆیە گەیشتە ئەو باوەڕەی ئەگەر وڵاتەکەی لەسەر ئەو ئاینزا توندڕۆیە بمێنێتەوە ئەوە دەبێتە بەربەستێکی گەورە لەبەردەم هەوڵە فرەوانخوازییەکانی، چونکە دوژمنایەتی خەڵکی **سونە** لەگەڵ شیعە لە رێگەی پیادەکردنی ئەو توندڕۆییە ئاینزایەوە لەلایەن (شا)یەکانی سەفەوییەوە سەرچاوەی گرتبوو[٤١٧].

شیاوی باسکردنە نادرشا کەسێکی توندڕۆ نەبووە بۆ هیچ ئاینزاێك، هەرچەندە لە ژینگەیەکی **سونە** ئاینزا چاوی بەدنیا هەڵهێناوە، لە بەرامبەریشدا لەگەڵ شیعە ئاینزاکان بەردەوامی بەکارەکانی داوە، بۆیە ئەو کەسایتییە لە زانستی کۆمەڵناسیدا بە(کەسایەتی حەدی) دەناسرێت، هەندێ لە نیشانەکان ئاماژە بەوە دەکەن ،کە هەوڵی ئەوەی داوە خۆی بەئەکبەر (شا)ی مەغۆلی هیندی بشوبهێنێت، کە ئاینێکی نوێی داهێنا بەمەبەستی یەکخستنی هیند لەیەك بیروباوەڕدا[٤١٨]، ڕەنگە هەر ئەو هۆکارەش رۆڵی بینیبێت لەسەر بیرکردنەوەکانی نادرشا کە هەوڵەکانی چڕبکاتەوە لە رێگەی دانانی ئەو ئاینزایەوە عێراق بخاتە ناو چوارچێوەی ئەو ئیمپراتۆریەتەی کە نادرشا لە

---

(٤١٥) ن.و.بیکولوسکایا و اخرون، منبع پیشین، ص ٦٠٢.

(٤١٦) همان منبع، ص ٦٠٢.

(٤١٧) سرجان ملکم، جلد دوم، منبع پیشین، ص ص٢٣-٢٤ " ابراهیم خلیل احمد، خلیل علی مراد، المصدر السابق، ص٥٢.

(٤١٨) **علی الوردی، المصدر السابق**، ص١٢٣.

هزری خۆیدا نەخشەی بۆ کێشابوو، دواتریش جیهانی ئیسلامی یەك بخات و خۆشی لە کۆتایدا **سەرکردایەتیی** بکات[٤١٩].

دوا بەدوای پەسندکردنی مەرجەکان لەلایەن ئامادەبووان، لە ڕێگەی ئاهەنگێکی فەرمی گەورە لە ١٩ی ئازاری **١٧٣٦**ز تەهماسب قوولی وەك یەکەمین شا لە بنەماڵەی ئەفشاری دەسەڵاتی ئێرانی گرتەدەست[٤٢٠]، پاش ئەوەی وەك (شا)ی ئێران دەست بەکار بوو هەڵسا بەدەرکردنی چەندین فەرمان لەوانە لە ڕێگەی فەرمانێکەوە لە هەموو دانیشتووان ئێران داوایکرد خۆیان دووربگرن لە نەفرەتکردنی هەر سێ خەلیفەی موسڵمانان ئەبوبەکری سدیق، عومەری کوڕی خەتاب و عوسمانی کوڕی عەفان (ر.خ) باسکردنیان بەڕێزەوە، کە بەدرێژایی دوو سەدەی فەرمانڕەوایی سەفەوییەکان ئەم کارە بەردەوامی هەبووە و لەنێو سیاسەتی (شا)یەکانی سەفەوی ڕەنگی دابۆوە[٤٢١].

لەلایەکی دیکەوە یەکەمین هەنگاوی لە ڕووی کارگێڕییەوە هەڵسا بەگۆڕینی فەرمانڕەوای هەرێمەکان، بۆ ئەم مەبەستە رەزا قوولی کوڕی بەیاوەری تەهماسب قوولی جەلایری وەك فەرمانڕەوای خۆراسان دەست نیشانکرد، ئیبراهیم خان زەهیر ئەلدەولەی برای وەك فەرمانڕەوای ئازەربایجان[٤٢٢]، سەبارەت بەهەرێمەکانی دیکەی ئێران، خەواجەخان کوڕی شاهوێردی خان کوردی کەیوانلۆ وەك فەرمانڕەوای شوشتەر و دانانی باباخان چاپوشلو وەك فەرمانڕەوای هەرات لە جێگەی پیر محەمەد، هەروەها محەمەد تەقی خان[٤٢٣] وەك فەرمانڕەوای فارس و مەهدی بیگ خۆراسانی بەفەرمانڕەوای شێروان دەست نیشانکران[٤٢٤].

---

(٤١٩) **علاء** موسى **كاظم** نورس، العراق في العهد **العثماني**...، ص ص١٨١-١٨٢.

(٤٢٠) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای..، ص٢٧١ " حبیب الله شاملوئی، منبع پیشین، ص٧٠٤. سەبارەت بەڕێورەسمی کۆنگرەی موغان بگەڕێوە بۆ: محمد حسین میمندی نژاد، منبع پیشین، ص ص٤٥٩-٤٧٤.

(٤٢١) **علاء** موسى **كاظم** نورس، العراق في العهد **العثماني**...، ص١٨١ " السيد عبدالله بن السيد نورالدين بن السيد نعمت الله الجزائري، منبع پیشین، ص١٢١.

(٤٢٢) **عبدالعظیم رضائی**، منبع پیشین، ص ص٢٥-٢٦.

(٤٢٣) محەمەد تەقی خان کوڕی حاجی محەمەد عەلی مستوفی شیرازییە، بەگوێرەی گێڕانەوەکانی فسائی، ئەم بنەماڵەیە لە شیراز پۆستی میرئاویان هەبووە بەتایبەت ئەرکی دابینکردن و دابەشکردنی ئاو لە ڕووباری

نادرشا هەر لەمیانەی کۆنگرەی موغان نەخشەی هەوڵە فرەوانخوازییەکانی خستە بواری جێبەجێکردن، بۆ ئەم مەبەستە محەمەد تەقی خان فەرمانڕەوای فارسی راسپارد بەداگیرکردنی بەحرێن، هەروەها لەگەڵ سەرکردەکانی کەوتە پرس و ڕاکردن و گفتوگۆکردن لەبارەی بارودۆخی قەندەهار سەبارەت بەدانانی ڕێوشوێنی تایبەت بۆ دەستپێکردنی هەڵمەتە فرەوانخوازییەکەی بەرەو ئەو ناوچەیە[٤٢٥]، هەروەها پاش ئەنجامدانی ڕێورەسمی تاجگوزاری و هەنگاوە کارگێڕییەکان، نادرشا لەنیسانی ١٧٣٦ز لە دەشتی موغانەوە ڕوویکردە شاری قەزوین، لەلایەن خەڵکەوە پێشوازی گەرمی لێکرا، چونکە ئەو ناوچەیە لە سەردەمی فەرمانڕەوای ئەفغانەکان لە ئێران دەردەسەریی زۆریان بینی بوو بەدەست دەسەڵاتدارانی ئەفغانی لە ناوچەکە[٤٢٦]، لەکاتی مانەوەی لەو شارە بۆ ماوەی سێ مانگ فەرمانێکی ئاراستەی سەرجەم فەرمانڕەوای هەرێمەکان کرد، جەختی کردەوە لە نێزیك بوونی ئاینزای جەعفەری لە هەردوو ئاینزای حەنەفی و مالیکی، چونکە پێی وابوو کەسایەتیی ئیمام جەعفەر سونبولی نێزیك بوونەوەیە لەنێوان سونە و شیعەیە[٤٢٧].

---

گەورەی شیراز و ئاوی قەسر قەمیشە، بۆ خەڵکی ناوچەکە، بەڵام لە کۆتاییەکانی فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی سەفەوی باوکی محەمەد تەقی خان لە پۆستەکەی بەرزکرایەوە بۆ ئیستیفای دیوانی، سەبارەت بەمحەمەد تەقی خان لە سەردەمی باوکی وەك فەرمانبەرێك لەو دەزگەیە کاری کردووە، دواتر لە سەردەمی نادرشا لە شیراز محەمەد تەقی خان دەبێتە جێگەی باوەڕی نادرشا، هەمان پۆستی باوکی پێ دەبەخشێت، دواتر وەك فەرمانڕەوای فارس دەست نیشانی دەکات. بۆ زانیاریی زیاتر بگەڕێوە بۆ: حاج میرزا حسن حسینی فسائی منبع پیشین، ص١٧٥ " **رضا** شعبانی، میرزا محمد تقی خان شیرازی، مجله بررسیهای تاریخی، شماره (٧٢)، ، نشریه ستاد بزرگ ارتشتاران – کمیته تاریخ **نظامی**، تهران، مهروابان ١٣٥٦هـ.ش، ص ص٢١٧ – ٢٢٢.

(٤٢٤) السيد عبدالله بن السيد نورالدين بن السيد نعمت الله الجزائري، منبع پیشین، ص١٢١.

(٤٢٥) محمد جواد مشكور، منبع پیشین، ص٢٥٣ " میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای..، ص٢٧٥.

(٤٢٦) محمد حسین میمندی نژاد، منبع پیشین، ص٤٧٧.

(٤٢٧) ئیمام جەعفەر لەو سەردەمە ژیاوە، کە هەردوو ئیمام ئەبو حەنیفەی نوعمانی کوڕی سابت و ئەبو عەبدوڵا مالیك کوڕی ئەنەس تێیدا ژیاون، ئەوەی ئاشکرایە ئیمام جەعفەر ڕێزێکی گەورەی هەبووە لەلایەن ئەو دوو ئیمامە. حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص١٠٥.

لەلایەکی دیکەوە داوای لە خەڵك کرد ڕێز بۆ هەر سێ خەلیفەی راشدین (ئەبوبەکری سەدیق، عومەری کوڕی خەتاب و عوسمانی کوڕی عەفان) دابنێن لە گردبوونەوە ئاینییەکان[٤٢٨]، سەرەڕای ئەوەش بەتوندی رەخنەی لە فەرمانڕەوای هەرێمەکان گرت، کە بەشداری هەر مەراسیمێکی ئاینزای بکەن، چونکە باوەڕی وابوو کاری فەرمانڕەواکان برێتی نییە لەدەست نیشانکردنی پەرستنی مرۆڤەکان لەسەر زەوی، چونکە ئەم کارە لای خودا نەخوازراوە [٤٢٩]، هەر لەمیانەی ئامادەبوونی لە قەزوین بڕیاری قەدخەکردنی مەراسیمی ئاینزای دەرکرد، چونکە پێی وابوو ئەم کارە خزمەت بە**بەرژەوەندییە**کانی وڵات ناکات، هەروەها جەختی لەسەر ئەوە کردەوە لە هەموو وتارەکانی هەینی و دوای هەموو نوێژێکیش ناوی بهێندرێت[٤٣٠].

نادرشا توانی زەبرێکی کوشندە ئاراستەی پیاوانی ئاینزایی شیعە بکات، بەتایبەت دوای ئەوەی دەستیگرت بەسەر بڕبڕەی ئابووری دەزگەی ئاینی کە داهاتەکەی دەگەڕایەوە بۆ پیاوانی ئاینی[٤٣١]، چونکە نادرشا گەیشتە ئەو بڕوایەی کە پێویستە ماف و جیاوکی پتر بدرێت بەسەربازان نەوەك پیاوانی ئاینی، ئەو بیرکردنەوەشی لەوە سەرچاوەی گرتبوو کە هەر لە رێگەی ئەو سەرباز و جەنگاوەرانەیە دەتوانێ پارێزگاری لە وڵات بکات و فرەوانخوازییەکانی جێبەجێ بکات نەوەك لە رێگەی پیاوانی ئاینییەوە[٤٣٢].

سەبارەت بەسیاسەتی نادرشا بەرامبەر بەپیاوانی ئاینزایی شیعە لە ئێران، شێخ رەسوول کەرکووکلی بەوردی هەنگاوەکانی نادرشا لە پێڕەوکردنی سیاسەتەکەی دەخاتە ڕوو دەڵێت((... بڕیاریدا برێك لە ماڵەکەی بدات بە زانایانی ئێرانی و داوای ئامادەبوونی لێکردن، چاوتێبڕینەکەیان وای لێکردن کێبەرکێ و گردبوونەوەی زۆر چێ بکەن، کۆکرانەوە لە ناوچەیەکی فرەوان، دواتر هەریەکەیان کاغەزێکی داواکاری پێدرا و داوایان لێکردن ناوی خۆیان و ئەدرەس و ئەو برە پارەیەی پێویستیانە بینووسن، لە

---

(٤٢٨) **رضا** شعبانی، تاریخ اجتماعی ایران درعصر افشاری، جلد دوم، چاپ دوم، نشر قومس، تهران، ١٣٧٥هـ.ش، ص١١٤.

(429) Jonas Hanway,Op.Cit, PP.128-129.

(٤٣٠) بهرام افراسیابی، منبع پیشین، ص٣٥٠ " **رضا** شعبانی، تاریخی اجتماعی.. جلد دوم، ص١١٤.

(٤٣١) ادوارد براون، منبع پیشین، ص١٤٢.

(432) Fraser. J., Op.Cit, PP.121-122.

جیاتی ئەوەی کە لە کاغەزەکە نووسراوە بیاندەنێ، فەرمانی دا ئەو بڕە پارەیە بەزۆر لێیان وەربگیرێت و لە پێناو بەرژەوەندیی وڵات خەرج بکرێت...هەڵسان بەکۆکردنەوەی ئەو بڕە پارەیە، ئەوەی نەیتوانی بیدات ناچاربوو کەلوپەلەکانی و پەڕتووکەکانی لە بازاڕ بفرۆشێت))[٤٣٣].

دەکرێت بڵێین نادرشا لەسەرەتای بەهێزبوونی دەسەڵاتییەوە توانیویەتی تا ڕادەیەك دەسەڵاتی پیاوانی ئاینزای شیعە کەم بکاتەوە، نەوەك بەو شێوەیە کە شێخ رەسوول کەرکووکلی باسی لێوە دەکات کە زەلیلی دەستی نادرشا بوونە، چونکە مەنتق ئەوە قبووڵ ناکات، دەزگەیەك بۆ ماوەی دوو سەدە خۆی تێکەڵاوی هەست و هزری تاکی ئێرانی بکات، بەم شێوەیە ملکەچی ئیرادەی نادرشا بێت، ئەگەر بەراوردێك بکەین لەگەڵ سەردەمی پەهلەوی، بەهەمان شێوە رەزاشا لە رێگەی سیاسەتی ئاینی توانی تاڕادەیەك دەسەڵاتیان کەم بکاتەوە، بەڵام بەرئەنجامەکەی هەر ئەو دەزگەیە رۆڵی سەرەکیی بینی لە ڕووخانی دەسەڵاتی پەهلەوی، بەیارمەتیدەری ئەو بارودۆخە نێودەوڵەتییەی کە ئەو کات لە ئارادابوو.

نادرشا بۆ خۆجیاکردنەوە لە هەموو دیاردەکانی دەوڵەتی سەفەوی بڕیاری لێدانی سکەی دا بەناوی خۆی، کە لە ڕوویەکی (الخير فی ما وقع) نەخشێندرابوو، لە ڕووەکەی دی (سکە بر زرکرد نام **سلطنت** را در جهان نادر ایران زمین و خسرو گیتی ستان)[٤٣٤]، لەگەڵ ئەوەش دروشمێکی تایبەت بەخۆی دانا کە لەسەر ئەنگوستیلەکەی نەخشێندرابوو ((ئەگەر گەوهەر لە ئەنگوستیلە بکەوێتە خوارەوە، خوای گەورە دەیگەڕێنێتەوە بەناوی نادر))[٤٣٥].

---

(٤٣٣) الشيخ رسول الكركوكلي، المصدر السابق، ص٤٧. سەبارەت بەم ڕووداوە لە سەرچاوە فارسییەکان ئاماژەی پێ نەکراوە.

(٤٣٤) بهرام افراسیابی، منبع پیشین، ص٣٤٦.

(435) Jonas Hanway,Op.Cit, P.128.

# بەشی دووەم

## سیاسەتە فرەوانخوازییەکانی
## نادر شا بەرامبەر بە هیندستان و ئاسیای ناوەڕاست

## تەوەری یەکەم
## قەڵەمڕەویی نادر شا بەرەو هیندستان

## تەوەری دووەم
## ڕەوت و پەرەسەندنەکانی ساڵی ١٧٣٩ و داگیرکردنی دەلهی

## تەوەری سێیەم
## ڕاپەڕینی دەلهی و بەرئەنجامەکانی

## تەوەری یەکەم:

## قەڵەمڕەویی نادر شا بەرەو هیندستان

پێوەندییەکانی ئێران و ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی هیندی بەدرێژایی ماوەی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی سەفەوی ، بەتایبەت لەدوای مردنی شا ئیسماعیلی یەکەم بەبەردەوامی ناجێگیر بووە، چونکە ناوچەی قەندەهار ببووە خاڵی دەستپێکی ململانێیەکانی هەردوو دەوڵەت، بەشێوەیەك هەر لایەکیان هەوڵی ئەوەی داوە قەڵەمڕەوی خۆی لەوناوچەیە بسەپێنێت، بۆ ئەم مەبەستە ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی هیندی چەندین بار (قەندەهار)یان خستۆتە ژێر شکۆ و دەسەڵاتی خۆیان[٤٣٦] .

هەمایۆن کوڕی بابەر لە ساڵی ١٥٣١ز لە شوێنی باوکی دەسەڵاتی دەلهی گرتە دەست، لە یەکەمین هەنگاویدا هەوڵیدا هەردوو میرنشینی گجرات و مالوە یەکبخات، بەڵام هەوڵەکانی سەری نەگرت[٤٣٧]، لەبەرامبەریشدا شیرخان کە فەرمانڕەوایەتی ئەفغانستانی دەکرد، بەدەسەڵاتی هەمایۆن ڕازی نەبوو، بۆیە هەردوولا لە کەنارەکانی ڕووباری گنگ لە ساڵی ١٥٤٠ز بەرەنگاری یەکتربوونەوە، پاش شەڕێکی سەخت،

---

(٤٣٦) راجر سیوری، منبع پیشین،ص٦٤.

(٤٣٧) امیر محمود خواندامیر،منبع پیشین، ص ص٢٥٧-٢٥٨.

سوپای هەمایۆن شکستی خوارد[٤٣٨]، بەو شکستەش هەمایۆن تووشی سەرگەردانی و ئاوارەیی هات، بۆیە سەرەتا ڕوویکردە سند لەوێشەوە بەرەو ئێران کەوتە ڕێگە، تەواوی هیندستانیش کەوتە ژێر دەسەڵاتی شێرخان[٤٣٩].

دوابەدوای گەیشتنی محەمەد کوڕی هەمایۆن بەدەرباری سەفەوی، داوای لەشا تەهماسبی یەکەم کرد یارمەتی بدات لەگەڕاندنەوەی دەسەڵاتی[٤٤٠] هەرچەندە لەلایەن شا تەهماسبی یەکەم پێشوازی لێکرا، پاشان ڕەزامەندیی لەسەر داواکارییەکەی محەمەد کوڕی هەمایۆن نیشاندا، بەمەرجێك قەندەهار بەشێك بێت لە قەڵەمڕەوی دەوڵەتی سەفەوی، چونکە ئەو ناوچەیە کێشەی زۆری لەسەر بوو لەنێوان هەردوولا[٤٤١]، دیارە محەمەد کوڕی هەمایۆن بەئامۆژگاری پیرمحەمەدی ڕاوێژکاری بەداواکارییەکەی شا تەهماسبی یەکەم ڕازی دەبێت، هۆکاریش بۆ قبوولکردنی داواکارییەکە زیاتر بۆ ئەوەی تەهماسبی یەکەم نەرمی بنوێنێت لەیارمەتیدانی بۆ گەڕاندنەوەی دەسەڵاتە زەوتکراوەکەی لەلایەن شێرخان[٤٤٢].

محەمەد کوڕی هەمایۆن دوای مانەوەی ١٥ ساڵ لە دەرباری سەفەوی، لەو ماوەیەدا زۆر بە وردی چاوەدێری بارودۆخی هیندستان و ئەفغانستانی دەکرد، هەر لەدوای مردنی شێرخان لەساڵی ١٥٥٦ز بارودۆخ رەخسا بۆ هەمایۆن بەیارمەتی سوپای سەفەوی سەرەتا ئەفغانستان، دواتر دەسەڵاتی بۆ دەلهی گەڕاندەوە، چونکە لە دوای مردنی شێرخان ململانێ و ڕکابەری توند لەنێوان جێنشینەکانی لەسەر دەسەڵات هاتە ئاراوە[٤٤٣].

ئەفغانستان بەدرێژایی فەرمانڕەوایی شا تەهماسبی یەکەم لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی سەفەوی بوو، بەڵام بەمردنی تەهماسبی یەکەم لە ساڵی ١٥٧٤ز و چێبوونی تەنگژەیەکی سیاسیی لە دەرباری سەفەوی، دەرفەتێکی باش بوو بۆ هەمایۆن جارێکی دیکە شکۆی

(٤٣٨) عبدالحسین نوایی، عباسقلی غفاری فرد، منبع پیشین، ص١٢٨.

(٤٣٩) خورشاه بن قباد الحسینی،منبع پیشین،ص ص١٤٧-١٤٨.

(٤٤٠) راجر سیوری، منبع پیشین،ص٦٤.

(٤٤١) بهنام محمد پناه، منبع پیشین، ص ص٦٩-٧٠.

(٤٤٢) مەحەمەد سهێل تەققوش،سەرچاوەی پێشوو،ل١٣٤.

(٤٤٣) امیر محمود خواندامیر، منبع پیشین، ص ص٢٥٧-٢٥٨.

ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی هیندی بەسەر ئەفغانستان بسەپێنێتەوە[٤٤٤]، کەچی ئەم بارودۆخە بۆ هەمایۆن تا سەر نەبوو، چونکە بەدەرکەوتنی شا عەباسی گەورە وەك (شا)ی ئێران، بەهیچ شێوەیەك دانی بەفەرمانڕەوایەتی هەمایۆن دانەنا لەسەر قەندەهار، بۆیە لە ڕێگەی جەنگەوە توانی داگیری بکات و بیخاتەوە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی سەفەوی[٤٤٥].

دوای مردنی شا عەباسی گەورە لە ساڵی ١٦٢٩ز باردۆخی سیاسیی دەوڵەتی سەفەوی تووشی نالەباری سیاسی بۆوە بەهۆی هاتنی چەند (شا)یەکی لاواز، لەو بارودۆخەدا شا جیهانی پادشای مەغۆلی هیندی ١٥٩٢ – ١٦٦٦ توانی دەست بگرێت بەسەر قەندەهار، کە ئەو کات شا عەباسی دووەم فەرمانڕەوایەتی ئێرانی دەکرد، بۆیە لە ساڵی ١٦٣٨ز لە شەڕێکی سەختدا بە**سەرکردایەتیی** مورتەزا قلیخان قاجار توانرا جارێکی دیکە قەندەهار بخرێتەوە ژێر دەسەڵاتی ئێران[٤٤٦]، هەرچەندە شا جیهان و کوڕەکەی ئەورنگ زیب ١٦٥٨- ١٧٠٧ لەو ماوەیەدا هەوڵی زۆریاندا قەندەهار داگیر بکەنەوە، بەڵام هەوڵەکانیان بێ سوود بوو[٤٤٧].

سەبارەت بەئەفغانستان کە ڕۆڵی سەرەکیی دەبینێت لە دیارکردنی پێوەندییەکانی هەردوو دەوڵەت بەدرێژایی فەرمانڕەوای سەفەوییەکان، هەرچەندە بەر لە ئاوابوونی خۆری دەوڵەتی سەفەوی بەدەستی ئەفغانەکان لە ساڵی ١٧٢٢ئەو ناوچەیە بەشێوەیەکی فەرمی لەژێر شکۆی ئێراندا بووە[٤٤٨]، بەڵام ئەوە ناگەیەنێت لەو ماوەیەدا حکوومەتی هیندی هیچ هەوڵێکی نەبووبێت بۆ گەڕاندنەوەی ئەو ناوچەیە بۆ ژێر ڕکێفی خۆی، یەکێك لە گرینگترین دەست تێوەردانەکانیان برێتی بوو لە هاندانی میر وەیس بۆ **ڕاپەڕین** و هەڵگەڕانەوە لە دەسەڵاتی سەفەوی[٤٤٩].

---

(٤٤٤) عبدالحسین زرین کوب، منبع پیشین، ص٧٠٤.

(٤٤٥) همان منبع، ص٧٠٤.

(٤٤٦) عباس قدیانی، منبع پیشین، ص٨١.

(٤٤٧) حبیب الله شاملوئی، منبع پیشین، ص٦٥٥.

(٤٤٨) عبدالله رازی، منبع پیشین،ص٤٢٩.

(٤٤٩) میر وەیس لە ڕێگەی بازرگانی بۆ هیندستان لەلایەن کاربەدەستانی هیندەوە پێشنیازی شۆڕشیان لێکردووە لە دژی دەوڵەتی سەفەوی. بۆ زانیاریی پتر بگەڕێوە بۆ: **عبدالرضا** هوشنگ مهدوی، منبع پیشین، ص١٣٣

دەکرێت بڵێین داگیرکردنی ئێران لەلایەن ئەفغانەکان، هەروەها تێکچوونی بارودۆخی سیاسی ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی هیندی لە دوای مردنی ئەورنگ زیب، تاڕادەیەك پێوەندیی هەردوو وڵات دەپچڕێت، بەڵام بەدەرکەوتنی نادرشا لە شانۆی ڕووداوەکانی ئێران و کۆتایی هێنان بەدەسەڵاتی ئەفغانەکان لە وڵات، دووبارە وەچەرخانێك لە پێوەندییەکانی هەردوو وڵات دەست پێدەکاتەوە.

### أ – هۆکارەکانی لەشکرکێشی نادرشا بۆ هیندستان

لەراستیدا جیاوازییەکی زۆر لەدەست نیشانکردنی هۆکارەکانی لەشکرکێشی نادرشا بۆ هیندستان لەنێو مێژوونووسان بەدی دەکرێت، بەڵام سەبارەت بەهێڵی گشتیی ئەو بابەتە هاوڕان. دەکرێت ئەو هۆکارانەی بوونەتە مایەی ئەو لەشکرکێشییە بۆ دوو جۆر پۆلێن بکرێن: سەرەکییەکان و ناسەرەکییەکان.

#### ١- هۆکارە سەرەکییەکان

تەهماسب قوولی هەوڵیداوە لە ڕێگەی هەوڵە دیپلۆماتییەکان کێشەی ئەفغانەکان لەگەڵ دەسەڵاتدارانی هیندی یەکلابکاتەوە، بەتایبەت ئەو کاتەی توانی بەسەر ئەشرەف شا زاڵ بێت و کۆتایی بەفەرمانڕەوای ئەفغانەکان بێنێت لە ئێران، هەڵسا بەدەست نیشانکردنی عەلی مەردان خان وەك باڵیۆزی ئێران لە هیندستان[٤٥٠]، هەروەها لە ڕێگەی ئەو باڵیۆزە داوا لەدەسەڵاتدارانی دەهلی کرا، بەدالّدەنەدانی ئەفغانە هەڵاتووەکان و ڕێگە نەدانیان بەچوونە ناو خاکی هیندستان[٤٥١].

لەلایەکی دیکەوە تەهماسب قوولی لەماوەی جێنشینیدا، دوای ئەوەی **ڕاپەڕینی** ئەبدالییەکان بنبڕ دەکات، جارێکی دیکە نێردەی تایبەتی خۆی بەناوی **محەمەد** عەلی خان قوللر ئاقاسی ڕەوانەی دەهلی کرد، بەمەبەستی جەختکردنەوە لە گرتنەبەری ڕێوشوێنی توند لەلایەن حکوومەتی هیندی بەرانبەر بەئەفغانەکان، هەرچەندە لەلایەن **محەمەد** شا گورگانی ئیمپراتۆری هیندی مەغۆلی ١٧٠٢ – ١٧٤٨بەڵێن درا بۆ

---

(٤٥٠) بیژن بیگلری، ماجرای سفیران نادرشاه در دربار هند، **مجله** بررسیهای تاریخی، شماره ٧٨،نشریه ستاد بزرگ ارتشتاران – کمیته تاریخ **نظامی**، تهران، مهر و ابان ١٣٧٥ه.ش،ص١٧٩

(٤٥١) حاج میرزا حسن حسینی فسائی،منبع پیشین، ص١٨٣.

چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە، بەڵام نەکەوتە بواری جێبەجێکردن[٤٥٢]. لەوانەیە وەڵام نەدانەوەی داواکەی ئێران لەلایەن دەسەڵاتدارانی هیندی بگەڕێتەوە بۆ دان پێدانەنان بەو دەسەڵاتەی کە لە دوای دەرکردنی ئەفغانەکان لەئێران فەرمانڕەوایەتی دەکات.

زۆرینەی سەرچاوەکان لەسەر ئەوە هاوڕان، کە وەڵام نەدانەوەی محەمەدشا بەداواکارییەکانی تەهماسب قوولی لە ڕێگە گرتن و دالْدە نەدانی ئەفغانە هەڵاتووەکان لەلایەن دەسەڵاتدارانی هیندیەوە، ڕێگەی خۆشکرد بۆ تەهماسب قوولی لە دوای کۆنگرەی موغان کە وەك (شا)ی نوێی ئێران دەست نیشانکرا، پەلاماردانی هیندستان بخاتە ناو پرۆژە فرەوانخوازییەکانی، چونکە ئەفغانەکانی نیشتەجێی هیندستان، لە ڕێگەی چالاکییەکانیان مەترسی گەورەیان دروست کردبوو بۆ سوپای ئێرانی[٤٥٣]، هەر بۆیەش نادرشا لەکاتی گەمارۆدانی قەندەهار لە ساڵی ١٧٣٧ز بۆ جاری سێیەم نێردەی تایبەتی خۆی بەناوی محەمەد خان تورکمان ڕەوانەی دەلهی کرد، بەمەبەستی گەیاندنی پەیامێکی توندی نارەزایی، چونکە تا ئەوکات حکوومەتی هیندی پابەند نەبوو بەبەڵێنەکانی، لەهەمان کاتدا وادەی چل ڕۆژی دیاریکرد بۆ گەڕانەوەی نێردە تایبەتییەکەی[٤٥٤]، کەچی بەر لە گەڕانەوەی نێردەکە بەهۆی دەست بەسەرکردنی لەلایەن دەسەڵاتدارانی هیندییەوە، پاشان کوژرانی بووە هۆکارێك بۆ پەستکردنی نادرشا و ناردنی هەڕەشەی توند بۆ دەسەڵاتدارانی هیندی[٤٥٥].

## ٢- هۆكارە ناسەرەكییەكان

لەشکرکێشیی نادرشا بۆ هیندستان وەك هەر ڕووداویکی دیکە لە مێژووی مرۆڤایەتی بەرئەنجامی چەندین هۆکار بووە، هەندێك لەو هۆکارانە هەرچەندە شاراوەن، بەڵام کاریگەریی گەورەیان هەبووە لەسەر ڕووداوەکە، چونکە بوونەتە ئامرازێکی ڕێگە خۆشکەر بۆ ئەنجامدانی لەشکرکێشییەکە و داگیرکردنی هیندستان.

---

(٤٥٢) بیژن بیگلری، منبع پیشین،ص ص١٧٩-١٨٠.

(٤٥٣) محمد علی مهمید،،تاریخ دیبلماسی ایران (قبل از هخامنشیان تا پایان قاجاریه)، چاب اول،تهران، ١٣٢١هـ.ش،ص٢٠.

(٤٥٤) **ریاض** الاسلام، تاریخ **روابط** ایران و هند، ترجمه: محمد باقر ارام، عباسقلی غفاری فرد،چاپ اول، **مؤسسه** انتشارات امیر کبیر، تهران، ١٣٧٣ه.ش،ص ص٢١٧-٢١٨.

(455) P. SYKES, Op. Cit,P.352 .

زۆرینەی ئەو هۆکارە شاراوانە پێوەندیی دوور و نێزیکیان بەخودی بیرکردنەوەکانی نادرشا هەبووە، ئەگەر لە ڕووی سەربازی و ئابورییەوە بابەتەکە بخەینە بەر شرۆڤەکردن، ئەوە گومانی تێدا نییە، کە نادرشا پێویستی بەسوپایەکی بەهێز و تۆکمە هەبووە بۆ ئەوەی مەرامە فرەوانخوازییەکانی پێ جێبەجێ بکات(٤٥٦)، بێگومان ئامادەکردنی ئەو سوپایە پێوستی بەداهاتێکی زۆر هەبوو، کە ئەو کات بەهۆی داگیرکاری ئەفغانی و جەنگەکانی ئازادکردنی بەشە داگیرکراوەکانی خاکی ئێران لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی، ئابووری ئێرانی تووشی داڕمان کردبوو(٤٥٧)، بەم شێوەیە نادرشا نەیدەتوانی نیازەکەی جێبەجێ بکات، بۆیە لەو کاتەی لەرێگەی سیخوڕەکانی ئاگاداری بارودۆخی هیندستان کرایەوە کە وڵاتێکی دەوڵەمەندە، گەیشتە ئەو بڕوایە بەداگیردنی ئەو وڵاتە دەتوانێت ئارەزووەکانی خۆی بەئەنجام بگەیەنێت(٤٥٨).

لەلایەکی دیکەوە خراپی بارودۆخی سیاسی و ئابووری و کارگێڕی هیندستان لە سەردەمی محەمەد شا دەرگەی والآ کرد بۆ زیادبوونی گەندەڵییەکان و ململانێی توندی نێوان کاربەدەستانی دەوڵەت بۆ دەستەبەرکردنی جیاوکی زیاتر، سەرەڕای لاوازی کەسایەتی محەمەد شا، لە بەڕێوەبردنی وڵات و کەوتنە دوای خۆشییەکانی ژیان و دوورکەوتنەوەی لە بارودۆخی وڵات(٤٥٩)، لەگەڵ بوونی ئەو ڕکابەرییە توندەی کە لەنێوان نیزام ئەلمولك فەرمانڕەوای دەکەن، لەگەڵ سەعادەت خان والی یەکێك لە هەرێمەکانی هیندستان، کاریگەریی گەورەیان دروست کرد لەسەر پێگە و دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی لە هیندستان، هەروەها ڕێگەشیان خۆشکرد بۆ نادرشا کە لەشکرکێشییەکەی ئەنجام بدات و بەبێ دوودڵی هیندستان داگیر بکات(٤٦٠).

---

(456) David O. Allen , India Ancient And Modern, London , 1856, P.142.

(٤٥٧) پ.ی . پتروف، نادر شا در هند، ترجمە: **رضا** شعبانی، مجلە کیهان فرهنگی، شمارە ٢٣٣، اسفند١٣٨٤ ه.ش،،ص٢٤.

(٤٥٨) **ریاض** الاسلام، منبع پیشین،ص٢٢١ " **رضا** زادە **شفق، المصدر السابق،ص٨٦.**

(٤٥٩) سرجان ملکم،جلد دوم،منبع پیشین،ص٢٧.

(460) G . S . Chhabar , Advance Study in the History of modern India (1707 – 1803), Volume. I , Delhi , 1971 , P.8 " Fraser. J., Op.Cit, P.129.

سەبارەت بەڕۆڵی سەرکردە هیندییەکان لە هاندانی نادرشا بۆ داگیرکردنی هیندستان، کە زۆرینەی سەرچاوەکان جەختی لەسەر دەکەنەوە، بەڵام پلانە فرەوانخوازیەکانی نادرشا کە لە هزریدا گەلآڵەی کردبوو، لەگەڵ

لەلایەکی دیکەوە هەڵگیرساندنی جەنگ لەنێوان رووسیای تەزاری و دەوڵەتی عوسمانی[٤٦١] دڵنیای بەخشییە نادرشا کە لەلایەن عوسمانییەکان هێرش ناکرێتە سەریان، هەروەها دوای سەرکوتکردنی بەختیارییەکان[٤٦٢] هەڵسا بەجێبەجێکردنی پلانە گەورەکەی، کەبرێتی بوو لەداگیرکردنی قەندەهار وەك هەنگاوێکی بەرایی بۆ داگیرکردنی هیندستان[٤٦٣].

---

شارەزابوونی تەواو لە بارودۆخی ناوخۆیی دەسەڵاتی هیندی زۆر گەورەترە لـەوەی پشـت ببەسـتێت بـەناپاکی ناوخۆیی. لکهارت، نادرشا، ص ص ١٦٩-١٧٠.

(٤٦١) بەهۆی ئەو ئاڵۆزیە ناوخۆییەی کە باڵی کێشا بوو بەسەر دەوڵەتی عوسمـانی لـە سـاڵی ١٧٣٦ز هـەر یەکە لە ڕووسیا و نەمسا توانیان ئەو دەرفەتە بقۆزنەوە و پـەلاماری موڵکـەکانی دەوڵـەتی عوسمـانی بـدەن، ڕووسەکان قەرمیان داگیر کرد، لەبەرامبەریشدا نەمساییەکان توانیان سرب و ئەفلاق و بەغدان داگـیر بکـەن، بەڵام دوای ئەوەی سوڵتان مەحمودی یەکـەم تـوانی زاڵ بێـت بەسـەر ئاشـوب و ئاڵۆزییـەکان بەتایبـەت دوای دوورخستنەوەی سەدری ئەعزەم عوسمان پاشا و دانای محەمەد پاشا، توانیان بەربەستێك لەبـەردەم هەوڵـەکانی ڕووسیا دابنێن و نەمساییەکانیش پاشەکشە پێبکەن بۆ ئەوبەری ڕووباری دانوب لەسـاڵی ١٧٣٩ز، هـەروەها لەسەر ڕووسەکانیش چەند مەرجێك سەپێندرا وەك ڕووخاندنی قایمکارییەکانی ئازاق و چـێ نـەکردنی کەشـتی جەنگی و بازرگانی لە دەریای رەش. بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: **محمود علی عـامر، الدولـة العثمانيـة ( تـاريخ ووثائق)، الطبعة الأولى، دارالرحاب، دمشق، ٢٠٠١م، ص ص١٧٧-١٧٨.**

(٤٦٢) بەر لەدەستپێکی هێرشـەکانی نادرشـا بـۆ قەنـدەهار، عـەلی مـوراد سـەرۆك هـۆزی چـەهارلەنگی بەختیاریی یاخیبوونی خۆی ڕاگەیاند لەدەسەڵاتی (شا)ی نوێ، بۆ ئەم مەبەستە نێزیکەی ٢٠ هەزار سـەربازی لـە هـۆزی لـوڕ خـورەم ئابـاد و هـەفت لـەنگ لـە دەورەی کۆبوونـەوە، ئامـانجی سـەرەکیی لـەم کـارەی فەرمانڕەوایکردنی بەشێکی خاکی ئێران و ڕزگارکردنی شا تەهماسب لە زیندان و گەڕاندنەوەی بـۆ دەسـەڵات، بەڵام لە هەوڵەکانی سەرکەوتوو نەبوو، چـونکە دوای بەرەنگاربوونـەوەی لەگـەڵ نادرشـا شکسـت دەخـوات و دەستگیر دەکرێت، دواتر بەفەرمانی نادرشا دەست و قاچی دەبڕدرێت و دەکوژرێت. بۆ زانیاریی پـتر بگـەڕێوە بۆ: لکهارت، نادرشا، ص ص١٥١-١٥٤.

(٤٦٣) همان منبع، ص١٥٥.

**ب – داگیرکردنی قەندەهار وەك هەنگاوێکی بەرایی بۆ داگیرکردنی هیندستان (ئازار ١٧٣٨ز)**

نادرشا بەگوێرەی ئەونەخشەیەی کەلەهزریدا گەڵاڵەی کردبوو، دەبوایە هەموو هەرێمەکانی ئێران بگەڕێنێتەوە ژێر شکۆ ودەسەڵاتی ئێران ، هەروەك ئەو سنوورەی کەلەسەردەمی شا عەباسی دووەم هەبوو[٤٦٤]، چونکە نادرشا لەدەستدانی هەر پارچە زەویەك لەخاکی ئێرانی بەشەرمەزاری بۆ مێژووی ئێران هەژمار دەکرد[٤٦٥].

جێگەی ئاماژەپێکردنە تەهماسب قوولی لەساڵی ١٧٣٢ز هەوڵیدا قەندەهار بخاتەوە ژێر ڕکێفی خۆی، بەڵام چەند ڕووداوێکی وەك لەشکرکێشییەکەی شا تەهماسب میرزا بۆ ئارزەربیجان و شکستخواردنی بەرامبەر بەدەوڵەتی عوسمانی لەجەنگی کردخان ولەدەستدانی بەشێکی زۆری خاکی ئێران بەهۆی ڕێککەوتننامەی ئەحمەد پاشا کەلەساڵی ١٧٣١ز گرێ درا، تەهماسب قوولی نەیتوانی مەرامەکەی جێبەجێ بکات[٤٦٦].

دوا بەدوای کۆنگرەی موغان، نادرشا بۆ جێبەجێکردنی هەوڵە فرەوانخوازییەکانی لە٢١ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٧٣٦ز پاش کۆکردنەوەی سوپا و ئامادەکارییەکان بەسوپایەکی ٨٠ تا ١٠٠ هەزار سەرباز لەئەسفەهانەوە لە ڕێگەی ئەبرقو و کرمان و سیستان ڕێگەی گرتەبەر بەرەو قەندەهار[٤٦٧]، هەروەها لەبەر سەختی ئەو ناوچەیە کە زیاتر بیابانە بۆیە بڕیاری دانانی چەند وێستگەیەکی دا لەسەر ڕێگەکەی بۆ وەستان و وەرگرتنی پشوو بۆ سوپاکەی، هەروەها بۆ گواستنەوەی کەلوپەلە سەربازییەکانی بۆ قەندەهار سوودی وەرگرت لە هۆکارەکانی گواستنەوەی تایبەت بەکۆمپانیای هیندی

---

(٤٦٤) **عبدالعظیم رضائی**، منبع پیشین، ص٢٦.

(٤٦٥) حسن کریم جاف، المصدر السابق، ص٨٤.

(٤٦٦) محمد حسین میمندی نژاد،منبع پیشین، ص٥٠٩. سەبارەت بەلەشکرکێشییەکانی تەهماسب میرزا بەئاراستەی یەریڤان و ڕێککەوتننامەی ئەحمەدپاشا بگەڕێوە بۆ: بەشی یەکەم، تەوەری دووەم.

(٤٦٧) **رضا** شعبانی، تاریخ اجتماعی ..،جلد اول، ص٧٠ "

Joseph Pierrer Ferrier, History of Afghans, London, 1858, P.65"

سەبارەت بەهەنگاوەکانی لەشکرکێشی نادرشا بۆ قەندەهار بگەڕێوە پاشکۆی ژمارە ( ٩).

ڕۆژهەڵاتی، لەگەڵ دەستگرتنی بەسەر پێداویستیی و هۆکارەکانی گواستنەوەی کاروانە بازرگانییەکانی ناوچەکە [٤٦٨].

نادرشا بەر لە دەرچوونی لە ئەسفەهان هەڵسا بەخەڵاتکردن و پلە بەرزکردنەوەی ئەفسەرانی سوپاکەی بەگوێرەی پلەکانیان[٤٦٩]، دواتر داوای لە فەرمانڕەوای هەموو هەرێمەکان کرد، سەرباز و ئازووقەی پێویست بۆ هەڵمەتە چاوەڕوانکراوەکەی ئامادە بکەن، بۆ ئەم مەبەستە فەرمانەکەی نادرشا لەلایەن فەرمانڕەوای هەرێمەکان جێبەجێ کرا، بەشێوەیەك لە کرمان بڕێکی زۆر ئازووقە بۆ سوپا کۆکرایەوە، کە بۆ ماوەی هەشت ساڵ کاریگەریی جێهێشت لەسەر دانیشتووان کرمان[٤٧٠]. هەروەها بەشێك لەسوپاکەی بە**سەرکردایەتیی** هەریەکە لە پیر**محە**مەدخان فەرمانڕەوای هەرات و ئەسلمش خان فەرمانڕەوای پێشووی تەفلیس ڕەوانەی بلوجستان کرد، بەمەبەستی ڕێگەگرتن لە هەڵگەڕانەوەکانی مەحەبەت خان برای ئەلیاس خان کوڕی عەبدو**ڵا** خانی بلوجی کە ئامادە نەبوو دەسەڵات و شکۆی نادرشا لە ناوچەی فەرمانڕەوایەتی خۆی قبووڵ بکات[٤٧١].

نادرشا پاش گەیشتنی بەشاری کرمان نامەیەکی ئاراستەی فەتح عەلیخان کوڕی مەلیك مەحمود سیستانی کرد، بەمەبەستی پێوەندیکردن بەسوپای ئێران لەکرمان[٤٧٢]، دواتر لەپاش بڕینی سنووری سیستان لە١٨ی شوباتی ١٧٣٧ز سوپای ئێران گەیشتنە دەوروبەری گرشك، لەوێش لە بەرەنگاربوونەوەیەکی ماوە کورت لەگەڵ هێزێکی

---

(٤٦٨) لکهارت، نادرشا، ص١٥٦.

(٤٦٩) محمد **کاظم** مروی وزیر مرو، جلد دوم،منبع پیشین،ص٤٨٦.

(٤٧٠) محمد حسین میمندی نژاد،منبع پیشین، ص ص٥٠٩-٥١٠.

(٤٧١) محمد **کاظم** مروی وزیر مرو، جلد دوم،منبع پیشین،ص٤٨٤. سەبارەت بە مەحەبەت خان دوای شکست خواردنی بەرانبەر بەسوپای ئێرانی پاشەکشە دەکات، بۆ لای براکەی بەناوی ئەلیاس خان کوڕی عەبدولاخانی بلوچی، لەو بارودۆخەدا ئەلیاس خان ڕوودەکاتە نادرئاباد،لەوێش دەتوانێت باوەڕ بەنادر شا بێنێت بۆ ئەوەی لێخۆش بوون دەربکات بۆ براکەی لەگەڵ فەرمانێك بەمانەوەی مەحەبەت خان وەك فەرمانڕەوای بلوچستان. بۆ زانیاریی پتر بگەڕێوە بۆ: محمد حسین میمندی نژاد،منبع پیشین، ص ص٥٢٣-٥٢٨.

(٤٧٢) لکهارت، نادرشا، ص١٥٧.

غەلزائی جێگیر لە قەڵای گرشك دوای بۆردومانکردنێکی سەخت لەلایەن سوپای نادرشا ملکەچبوونی خۆیان ڕاگەیاند[٤٧٣].

دوای داگیرکردنی قەڵای گرشك، هێزێکی ئێرانی بە**سەرکردایەتیی** گەلبعەلی خان کوڕی بابا عەلی بیك کوسە ئەحمەد لوی بەفەرمانی نادرشا ئەرکی داگیرکردنی ناوچەکانی هەزارجات و داوەر زەمینی پێ ڕاسپێردرا، ئەویش توانی لە ماوەیەکی کورتدا ئەو ناوچانە بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی[٤٧٤]، دواتر لە**٢٢**ی شوباتی **١٧٣٧**ز نادرشا بەیاوەری سوپاکەی پاش مانەوەی لەگرشك بۆ ماوەی سێ ڕۆژ، لە ڕووباری هیرمند (هلمند) پەڕییەوە و بەردەوامیدا بەپێشڕەوییەکانی بەئاراستەی قەندەهار[٤٧٥]، بێ ئەوەی تووشی هیچ بەربەستێك ببێتەوە لەلایەن هێزەکانی غەلزائی کە شایەنی باسکردن بێت[٤٧٦].

پێشڕەوییەکانی نادرشا بەئاراستەی قەندەهار زەنگێکی مەترسیدار بوو بۆ حوسێن سوڵتانی فەرمانڕەوای قەندەهار، بۆیە لە یەکەم هەنگاویدا بڕیاری پتەوکردنی قەڵا و قایمکارییەکانی شارەکەیدا، پاش ئەوەی گەیشتە ئەو بڕوایەی ناتوانێ ڕووبەڕووی هێزێکی ٨٠ هەزار سەربازی ئێرانی ببێتەوە[٤٧٧]، هەروەها داوای لە فەرماندەی سوپاکەی کرد، هەرچی خۆراك و ئازووقە هەیە لە دەوروبەری قەندەهار بیگوازنەوە بۆ ناو قەڵاکە[٤٧٨].

دوا بەدوای ئەو هەنگاوانە فەرمانڕەوای قەندەهار سیاسەتی سوتاندنی زەوی پێڕەو کرد، بۆ ئەوەی سوپای ئێرانی سوود وەرنەگرێت لەو پاشماوە خۆراکەی کە لەدوایان جێ دەمێنێت[٤٧٩]، هەروەها حوسێن سوڵتان پێی وابوو گەمارۆدانەکەی قەندەهار لەلایەن نادرشاوە ماوەیەکی کورت دەخایەنێت، چونکە گەیشتبووە ئەو باوەڕەی کە سوپای ئێرانی ناتوانێت بەردەوامی بەگەمارۆدانی قەندەهار بدات بەهۆی کەمی ئازووقەیان[٤٨٠].

---

(٤٧٣) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص ص٢٨٥-٢٨٦.

(٤٧٤) **محمد علی بن محمد التبریزی، تاریخ نادر،** بی جایی چاپ، **١٢١٤ه، ص١٧٠.**

(٤٧٥) لکهارت، نادرشا، ص١٥٧" محمد حسین میمندی نژاد،منبع پیشین، ص٥١٢.

(٤٧٦) سرجان ملکم،جلد دوم،منبع پیشین،ص٢٤.

(477) P. SYKES, Op. Cit, P.350.

(٤٧٨) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص٢٨٦.

(٤٧٩) همان منبع، ص٢٨٦.

(٤٨٠) محمد حسین میمندی نژاد،منبع پیشین، ص٥١٢.

نادرشا لە پێشڕەوییەکانی بەردەوام بوو بەرەو قەندەهار، لە رێگەدا لە کەنارەکانی ڕووباری ئەرغەنداب سوپاکەی جێگیر کرد بەمەبەستی پشوودان[٤٨١]، سوڵتان حوسێن لەکاتی جێگیربوونی سوپای ئێران لە ئەرغەنداب، هێزێکی ئەفغانی بە**سەرکردایەتیی** هەر یەکە لە سیدال خان و یونس خان قلیچی ڕاسپارد لە نیوەی شەودا هێرش بکەنە سەر سەربازگەی ئێرانی[٤٨٢]، بەمەبەستی نانەوەی ئاژاوە لەناو ڕیزەکانی سوپای نادرشا، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون لە ئەرکەکەیان بەهۆی بەرپەچدانەوەیان بەشێوەیەکی توند لەلایەن سوپای ئێرانی، بەهۆیەوە ژمارەیەکی کەمی سەربازانی ئەفغانی توانیان پاشەکشە بکەن بەرەو قەندەهار[٤٨٣]، دیارە پێشووتر نادرشا لە نەخشە و پلانی ئەو هێرشە ئاگەدار کراوەتەوە[٤٨٤].

هەرەس هێنانی شالآوە شەوانەکەی هێزی غەلزائی بووە هۆکارێك کە فەرمانڕەوای قەندەهار قایمکارییەکان توندتر بکات و چاوەڕوانی گەمارۆدانێکی سەخت ببێتەوە لەلایەن نادرشا[٤٨٥]، لە بەرامبەریشدا هێزەکانی ئێران لە کەنارەکانی ڕووباری ئەغەندابەوە ڕوویانکردە کۆکران کە دەکەوێتە دووری **١٥**کم لە ڕۆژهەڵاتی قەندەهار لە دوای شەڕێکی سەخت توانیان داگیری بکەن[٤٨٦].

دوای داگیرکردنی کوکران لە نیسانی **١٧٣٧**ز، گەمارۆدانی قەندەهار لەلایەن سوپای ئێرانەوە کەوتە بواری جێبەجێکردن، پاش ئەوەی نادرشا گەیشتە ئەو بڕوایەی کە داگیرکردنی

---

(٤٨١) لکهارت، نادرشا، ص١٥٧.

(٤٨٢) محمد **کاظم** مروی وزیر مرو، جلد دوم،منبع پیشین،ص٤٨٦.

(٤٨٣) محمد حسین میمندی نژاد،منبع پیشین، ص ص٥١٣-٥١٤ "**محمد علی بن محمد التبریزی،** منبع پیشین،ص١٧٣.

(٤٨٤) سەبارەت بەئاشکرا بوونی نەخشەوپلانی هێرشە شەوانەکەی هێزی غلیزایی،نوراللە لارودی باس لەڕاکردنی سەربازێکی ئەفغانی دەکات بۆ ناو سەربازگەی ئێرانی،بەر لەئەنجامدانی شالآوەکە،لەوێش نەخشەوپلانی هێرشەکەی بەنادرشا ڕاگەیاندووە. نوراللە لارودی، منبع پیشین، ص١٠٢. هەروەها دەربارەی هێرشە شەوانەکەی هێزی غلیزای و ڕۆڵی عەبدولغەنی خان ئەبدالی لەڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو هێزە وشکست پێدانیان بگەڕێوە بۆ: لکهارت، نادرشا، ص١٥٨.

(٤٨٥) **رضا** شعبانی، تاریخ اجتماعی ..،جلد اول، ص٧٠.

(٤٨٦) محمد حسین میمندی نژاد،منبع پیشین، ص ص٥١٤.

قەندەهار كارێكی ئاسان نابێت بەهۆی ئەو قایمكارییە بەهێزانەی كە هەر چوار دەورەی شارەكەیان دابوو لەگەڵ بوونی چەندین تاوەری بەرز(٤٨٧)، كە لەنێوانیادا بەربەستی بچووك هەبوو، كە چەندین سەربازی ئامادەكراو پڕ چەكی تێدا بڵاوكرابۆوە(٤٨٨).

لەو هەلومەرجەدا نادرشا سەربازگەكەی لە كۆكرانەوە بۆ سەرخ شیر لە باشووری ڕۆژهەڵاتی قەندەهار گواستەوە، لەوێش بڕیاری دروستكردنی شارێكی نوێیدا بەناوی نادرئاباد كە پێكهاتبوو لە شورایەكی بەهێز لەگەڵ بوونی كاروانسەرا و گەرما و چەندین دوكان(٤٨٩)، بەم كارە نادرشا توانی قەندەهار لە دەوروبەرەكەی داببڕێت(٤٩٠) و سەربازەكانیشی دووربخاتەوە لە بێزاربوون بەهۆی درێژبوونەوەی ماوەی گەمارۆدانی شاری قەندەهار(٤٩١).

نادرشا لە ماوەی گەمارۆدانی قەندەهار(٤٩٢)، لە ڕێگەی چەند كردەیەكی سەربازی توانی دەست بگرێت بەسەر چەند گوند و قەڵایەكی دەوروبەری قەندەهار، وەك بست وسافی(٤٩٣)، هەروەها دوای ئاگەداركردنەوەی نادرشا لە دەرچوونی هەر یەكە لەم حەمەد كوڕی حوسێن سوڵتان و سیدال خان لە قەندەهار بەمەبەستی كۆكردنەوەی هێز لە قەڵای غەلزائی، لە بڕیارێكی بەپەلە ئیمام وەردی بیگ قیرقلوی دەست نیشانكرد بۆ هێرشكردنە سەر ئەو قەڵایە

---

(487) Joseph Pierrer Ferrier, Op.Cit, P.66.

(٤٨٨) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص٢٨٩. لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی گورگین خان ئەم شارە خاوەن حەوت حەسار و پێنج دەروازە و سێ تاوەر بووە. **رضا** شعبانی، تاریخ اجتماعی ..،جلد اول، ص٧١.

(٤٨٩) میرزا مهدی خان استرابادی، دره نادره...، ص٧٤١.

(٤٩٠) سرجان ملكم،جلد دوم،منبع پیشین،ص٢٤.

(٤٩١) حبیب الله شاملوئی، منبع پیشین، ص٧٠٥.

(٤٩٢) ماوەی تەواوی گەمارۆدانە،كە برێتییە لە نێزیكەی ساڵێك، چونكە لە نیسانی ١٧٣٧ نادرشا گەیشتە دەوروبەری قەندەهار،لە ئازاری ١٧٣٨ قەندەهار كەوتە دەست سوپای ئێران. **ریاض** الاسلام، منبع پیشین،ص ص٢١٧،٢٢٠. لە بەرامبەریشدا میرزا مەهدی خان ئەستەرئابادی لە جهانگشا( ١٠) مانگی داناوە، بەڵام لە درە نادرە ماوەكەی بەساڵێك دەست نیشانكردووە، هەروەها **رضا** شعبانی ماوەی( ١٥) مانگ و فرێزەر ماوەی ١٨ مانگی دیاریكردووە: میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص٢٩٧" میرزا مهدی خان استرابادی، دره نادره...، ص٧٤٢ " **رضا** شعبانی، تاریخ اجتماعی ..، جلد اول، ص٧١ "
Fraser. J., Op.Cit, P.129.

(٤٩٣) **رضا** شعبانی، تاریخ اجتماعی ..،جلد اول، ص٧١.

و دەستگیرکردنی ناوبراوان، دیارە دوای ڕووبەڕووبوونەوەیەکی سەخت هێزەکانی ئێران نەیانتوانی قەڵاکە داگیر بکەن، بەڵام توانیان لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی قەڵاکە بدەن، کە ماوەی دوو مانگی خایاند، پاشان لە شەڕێکی سەخت توانیان دەست بگرن بەسەر قەڵاکە و هەر یەکە لە محەمەد کوڕی حوسێن سوڵتان و سیدال خان دەستگیر بکەن[٤٩٤].

دوابەدوای ئەوەی نادرشا بەتەواوەتی دەسەڵاتی خۆی سەپاند بەسەر بست وسافی و قەڵای غەلزائی و بلوجستان، لە هەنگاوێکی کتوپردا لە٣٠ حوزەیرانی ساڵی ١٧٣٨ز هێرشەکانی چڕکردەوە بۆ قایمکاری و بەرگرییەکانی قەندەهار[٤٩٥]، لە سەرەتادا هێزێکی بەختیاریی کە پێك دەهات لە ٩٠٠ سەرباز بەیاوەری چەند یەکەیەك لە هێزەکانی ئەبدالی و کوردەکانی چەمشگزەك بەفەرمانی نادرشا هێرشیان کردە سەر بەرگرییەکانی قەندەهار، بەڵام بەهۆی بەرپەچدانەوەیان بەشێوەیەکی توند لەلایەن بەرگرییکارانی غەلزائی، دووچاری شکستخواردنێکی سەخت بوونەوەو نێزیکەی ٢٠٠ سەربازیش بوونە قوربانی ئەو کردە سەربازییە[٤٩٦].

لەو بارودۆخەدا یەکێك لەو کەسانەی کە ئەرکی پارێزگاریکردنی حوسێن سوڵتانی لە ئەستۆ دابوو ناسراو بەزادخان، توانی لە ڕێگەی یەکێك لە سەرکردەکانی سوپای ئێران بەناوی ئیمام وەردی خان ڕەزامەندی نادرشا وەربگرێت بۆ چاوپێکەوتن، لە بەرامبەریشدا توانی حوسێن سوڵتان فریو بدات بەوەی کە هەڵدەستێت بەکوشتنی نادرشا، بۆیە لەو ڕێگەیەوە توانی خۆی بگەیەنێتە نادرشا، لەمیانەی چاوپێکەوتنەکەشی لەگەڵ (شا)ی ئێران، خاڵی لاوازی تاوەرەکان و کاتی چۆڵکردنیان لەکاتی نوێژی هەینی زۆر بەڕوونی شیکردەوە[٤٩٧].

---

(٤٩٤) **محمد علی بن محمد التبریزی،** منبع پیشین،ص ص١٧٣-١٧٤. سەبارەت بەچارەنووسی هەریەکە لەمحەمەد کوڕی حوسێن سوڵتان و سیدال خان دوای داگیرکردنی قەڵای غلیزایی ڕەوانەی نادرئاباد کران، لەوێش بەفەرمانی نادرشا چاوی سیدال خان دەرهێنرا،بەهۆی کردەوە گەمژە و نەفامەکانی. میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص٢٩١.

(٤٩٥) لکهارت، نادرشا، ص١٦٢.

(٤٩٦) محمد حسین میمندی نژاد،منبع پیشین، ص ص٥٣٤-٥٣٥.

(٤٩٧) محمد **کاظم** مروی وزیر مرو، جلد دوم،منبع پیشین،ص٥٤٠-٥٤٢.

نادرشا لەسەر بنچینەی ئەو زانیاریانەی کە لەزادخانی وەرگرت، لە**٢٣**ی ئازاری **١٧٣٨**ز بڕیاری هێرشکردنیدا بۆ سەر تاوەری (دەدە) کە لاوازترین تاوەر بوو لەنێو تاوەرەکانی دیکەی قەندەهار[٤٩٨]، هەروەها لەو هێرشەدا هێزەکانی بەختیاریی کە پێك دەهاتن لە چوار هەزار جەنگاوەر بوونە پێشەنگی هێزە هێرشبەرەکەی ئێران، پاش شەڕێکی سەخت و خوێناوی لەنێوان هەردوولا، سوپای ئێران توانی دەست بگرێت بەسەر تاوەری دەدە [٤٩٩].

سوپای ئێران دوای داگیرکردنی تاوەری (دەدە)، بەردەوامیدا بەهێرشەکانی هەرچەندە لەگەڵ ئەفغانەکان تووشی شەڕی دەستەویەخە بوونەوە، لە کۆتایدا سوپای ئێران توانیان یەك لەدوای یەك دەست بگرن بەسەر هەموو تاوەرەکان[٥٠٠] ، بۆیە لەو هەلومەرجەدا فەرمانڕەوای قەندەهار ناچاربوو لەگەڵ خانەوادەکەی ڕووبکاتە قایمکاری قیتول، بەڵام بەهۆی بۆردومانکردنی ئەو ناوچەیە بەسەختی لەلایەن سوپای ئێران ناچار بوو ملکەچبوونی خۆی ڕابگەیەنێت[٥٠١].

پاشان هەر یەکە لە زەینەب خاتوونی خوشکی و چەند کەسایەتییەکی غەلزائی نادرە لای نادرشا بەمەبەستی داواکردنی لێخۆش بوون بۆی [٥٠٢]، دیارە نادرشا لەکاتی چاوپێکەوتنەکە ڕەزامەندی نیشاندا لەسەر لێخۆش بوونی، بەڵام دواتر لە بڕیارێکدا هەر یەکە لە حوسێن سوڵتان و خانەوادەکەی لەگەڵ چەند سەرکردەیەکی غەلزائی دوورخستەوە بۆ مازندەران[٥٠٣].

لەلایەکی دیکەوە دانیشتووان ئەبدالی کەلەساڵی **١٧٣٢**ز بەفەرمانی تەهماسب قوولی بۆ خۆراسان کۆچ پێکرابوون، گواسترانەوە بۆ نادرئاباد، لە بەرامبەریشدا

---

(٤٩٨) لکهارت، نادرشا، ص١٦٣.

(٤٩٩) حاج میرزا حسن حسینی فسائی،منبع پیشین، ص١٨٢. یەکێك لە گرینگترین ئەو کەسایەتییانەی ڕۆڵی سەرەکیی گێڕا لەگرتنی تاوەری دەدە برێتی بوو لە کەسایەتییەکی هۆزی بەختیاریی ناسراو بەمەلا ئادینە. بهرام افراسیابی، عقاب کلات و **خاطرات طبیب** مخصوص نادر، چاپ دوم، انتشارات سخن، بی جایی چاپ، ١٣٧٠هـ.ش، ص٤١٤.

(٥٠٠) محمد حسین میمندی نژاد،منبع پیشین، ص٥٣٨.

(٥٠١) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص٣٠١.

(٥٠٢) لکهارت، نادرشا، ص١٦٤.

(٥٠٣) عبدالحسین زرین کوب، منبع پیشین، ص٧٤٨ " **رضا** زاده **شفق، المصدر السابق، ص١١٥.**

ئەفغانییە غەلزائییەکانی قەندەهار کۆچ پێکران بۆ نیشاپوور و خۆراسان[٥٠٤]، پاشان فەرمانی دەرکرد بەرووخاندنی شورا و قایمکارییەکانی قەندەهار[٥٠٥].

نادرشا دوای ئەنجامدانی ئەو کارانە هەڵسا بەدەست نیشانکردنی عەبدولغەنی خانی ئەبدالی وەك فەرمانڕەوای نوێی نادرئاباد (قەندەهاری نوێ )، لەگەڵ ئازادکردنی هەر یەکە لە زولفەقار خانی ئەبدالی و ئەحمەد خانی برای کە لەلایەن حوسێن سوڵتان زیندانی کرابوون، لەبری ئەو کارەی نادرشا هەردووکیان بوون بەبەشێك لە سوپای ئێران[٥٠٦].

---

)504( S. R . SHARMA, Mughal Empire in India: Asystematic study including source material , Volume. 3 , Delhi , 1999 , P.725.

(٥٠٥) حبیب الله شاملوئی، منبع پیشین، ص٧٠٥.

)506( S. R . SHARMA, Op.Cit, P.725.

لەو بارەیەوە (**رضا** زادە **شفق**) پێی وایە دوای ئازادکردنی زولفەقار خانی ئەبدالی ئەویش دوورخرایەوە بۆ مازندەران. **رضا** زادە **شفق، المصدر السابق، ص١١٥.**

## تەوەری دووەم:

## ڕەوت و پەرەسەندنەکانی ساڵی ١٧٣٩ز و داگیرکردنی دەلهی

### أ- هەڵمەتە فرەوانخوازییەکانی نادرشا لە قەندەهار تاکو کەرنال[٥٠٧]

دوابەدوای داگیرکردنی قەندەهار، نادرشا دەستیکرد بەئامادەکارییەکان بەمەبەستی هێرشکردنە سەر شکۆ و دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی مەغۆڵی هیندی، لە هەمان کاتدا نادرشا لە ڕێگەی فریودانێکی سیاسی توانی باوەڕ بهێنێت بەمحەمەد شا گورگانی کە ئامانج لەو لەشکرکێشییە بۆ ناو خاکی هیندستان تەنیا بۆ سەرکوتکردن و لەنێوبردنی ئەفغانە هەڵاتووەکانە، بەهیچ شێوەیەك بڕینی ئەو سنوورە لەلایەن سوپای ئێران بۆ داگیرکردنی خاکی هیندستان نییە[٥٠٨].

نادرشا بەر لەوەی لە نادرئاباد (قەندەهاری نوێ) بەڕێکەوێت بەئاراستەی کابوڵ، نێردەی تایبەتی خۆی ڕەوانەی دەلهی کرد، بەمەبەستی جەختکردنەوە لەسەر داواکارییەکانی، بەڵام لەلایەن کاربەدەستانی هیندی سەرەڕای وەڵام نەدانەوەی داواکارییەکانی هەڵسان

(٥٠٧) برێتییە لە دەشتاییەك دەکەوێتە دووری ١٣٥کم لە باکوری ڕۆژئاوای دەلهی پایتەختی ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی هیندی. **عبدالعظیم رضائی**، منبع پیشین، ص٢٨.

(٥٠٨) لکهارت، نادرشا،ص ص١٦٨-١٦٩ .

بەدەستگیرکردنی نێردەکەی[٥٠٩]، ئەم ڕووداوە بووە هۆکارێك کە نادرشا هەڵمەتەکەی بەئاراستەی کابوڵ دەست پێ بکات[٥١٠]، سەرەتا لە ناوچەی قەرەباغ نێزیك غەزنە نامەیەکی ئاراستەی فەرمانڕەوای ئەو شارە کرد، بەمەبەستی خۆبەدەستەوەدان[٥١١].

هەرچەندە لە سەرەتادا موساخانی فەرمانڕەوای غەزنە داواکارییەکانی نادرشای بەهەند وەرنەگرت و بڕیاری جەنگ کردنیدا دژ بەسوپای ئێران، بەڵام دواتر بەهۆی نەبوونی هاوسەنگی هێز لەنێوان هەردوولا، شاری غەزنەی بەرەو کابوڵ جێ هێشت[٥١٢]، لەو بارودۆخەدا خەڵکی شارەکە دوای گفتوگۆکردن لەسەر ئایندەی شارەکەیان بڕیاری ملکەچی و ڕادەستکردنی شارەکەیاندا بەسوپای ئێران[٥١٣]، هەر لەوێش نادرشا بڕیاری داگیرکردنی کابوڵی خستە بواری جێبەجێکردن، چونکە داگیرکردنی کابوڵ دەبێتە کلیلی سەرەکیی بۆ بڕینی گەرووی خەیبەر کە دەروازەی سەرەکییە بۆ چوونە ناو خاکی هیندستان[٥١٤].

دوای بڵاوبوونەوەی دەنگۆی نێزیك بوونەوەی نادرشا لە شاری کابوڵ، ناسر خانی فەرمانڕەوای شارەکە، ڕوویکردە شاری پیشاوەر بەمەبەستی بەدەست هێنانی کۆمەك و یارمەتی لەدەلهی[٥١٥]، بەڵام داواکارییەکەی لەلایەن دەسەڵاتدارانی دەلهی ڕەتکرایەوە بەهۆی ململانێ و ئاڵۆزییەکانی ناو دەربار[٥١٦]، هەرچەندە لە سەرەتادا کەسایەتی و ڕیش سپیانی شارەکە توانیان خۆیان بگەیەننە نادرشا، کە لە دەوروبەری کابوڵ سەربازگەکەی جێگیر کردبوو بەمەبەستی دانوستاندن، بەڵام شیرزەخانی فەرماندەی سوپای شارەکە بێ گوێ دانە بۆچوونی خەڵك بڕیاری بەرگریکردنیدا دژ بەسوپای ئێران و

---

(٥٠٩) **عبدالعظیم رضائی**، منبع پیشین، ص٢٧.

(٥١٠) سەبارەت بە ژمارەی هێزەکانی ئێران کە لە نادرئاباد بەسەرکردایەتیی نادرشا بەرێکەوتن بەرەو کابوڵ بەگوێرەی بۆچوونی فرێزەر نێزیکەی ١٢٥ هەزار سەرباز دەبوون: Fraser. J., Op.Cit, P.130.

(٥١١) بهرام افراسیابی، منبع پیشین، ص ص٤٣٨-٤٣٩. سەبارەت بەلەشکرکێشییەکەی نادرشا بۆ هیندستان بگەڕێوە بۆ پاشکۆی ژمارە ( ٩).

(٥١٢) همان منبع، ص٤٣٩.

(٥١٣) محمد حسین میمندی نژاد،منبع پیشین، ص ص٥٦١-٥٦٢.

(514) P. SYKES, Op. Cit, P.352.

(515) William Irvine, Later Mughals (1719 – 1739) , Volume.II , LONDON, LUZAC, 1922, P.324.

(٥١٦) **ریاض** الاسلام، منبع پیشین،ص٢٢٠.

خۆی لە قەڵای عەقابین توند کرد(٥١٧)، هەڵکەوتەی جوگرافی شاری کابوڵیش نادرشای ناچار کرد تەنیا لە رێگەی ئەو قەڵایەوە بچێتە ناو شارەکە، چونکە سرووشتی جوگرافی ئەم شارە وابوو لە سێ لاوە بەشاخ دەورە درابوو، تاکە دەروازەش بۆ دەستگرتن بەسەر ئەو شارەدا داگیرکردنی قەڵای عەقابین بوو(٥١٨).

شیرزەخان توانی بۆ ماوەی شەش هەفتە هێرشەکانی سوپای ئێران بوەستێنێت، بەڵام دواتر لە شەڕێکی سەختدا لەگەڵ کوڕەکەیدا دەکوژرێت(٥١٩)، پاش ئەم ڕووداوە سوپای ئێران چوونە ناو شاری کابوڵ، ئەم سەرکەوتنە بۆ نادرشا هەلێکی زێڕین بوو، چونکە لە رێگەی ئەو دەسکەوتانەی کە لە شاری کابوڵ بەدەستی هێنا مووچەی سەربازانی فەراهەم بکات(٥٢٠)، هەروەها توانی زاڵ بێت بەسەر کەمی خۆراك و ئازووقە، چونکە لە رێگەی دەستگرتنی بەسەر کابوڵ و دەوروبەری توانی ئەو کەمییەی کە لە ئازوقەدا هەبوو پڕی بکاتەوە(٥٢١).

داگیرکردنی کابوڵ لەلایەن سوپای ئێران زەنگێکی مەترسیدار بوو بۆ دەسەڵاتدارانی دەلهی، بۆیە هەڵسان بەبەستنی کۆبوونەوەیەکی فرەوان بە**سەرکردایەتیی** محەمەد شا بۆ گفتوگۆکردن لەبارەی ئەو مەترسییە چاوەڕوانکراوەی کە وڵاتەکەیان لە ماوەیەکی کورتدا ڕووبەڕووی دەبێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە دیڤران خان سەرکردەی سوپا لەمیانەی کۆبوونەوەکەدا پێشنیازی کرد سوپایەك بە**سەرکردایەتیی** ئیمپراتۆر ئامادە بکرێت و ڕووبکاتە لاهوور، لەوێش لەگەڵ سوپای زەکەریا خانی فەرمانڕەوای شارەکە، سوپایەك ڕێك بخرێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوپای ئێران(٥٢٢).

لەو بارودۆخەدا نادرشا دوای ڕێکخستنی کاروباری کابوڵ، بڕیاری هێرشکردنیدا بۆ سەر شاری پیشاوەر(٥٢٣)، هەروەها بەر لە دەرچوونیشی لە شاری کابوڵ بەئاراستەی پیشاوەر نامەیەکی ئاراستەی ناسرخانی فەرمانڕەوای شاری پیشاوەر کرد، بۆ

(517) Fraser. J., Op.Cit,P.132.

(٥١٨) نوراللە لارودی، منبع پیشین، ص ص١١٨-١١٩.

(519) Fraser. J., Op.Cit, P.132.
(520) P.SYKES, Op. Cit,P.353.

(٥٢١) لکهارت، نادرشا،ص١٧١.

(522) Jonas Hanway,Op.Cit,P.153.
(523) Fraser. J., Op.Cit, P.135.

ملکەچبوون و ڕادەستکردنی شارەکە بەسوپای ئێران، بەڵام داواکارییەکەی نادرشا ڕەتکرایەوە، بۆ ئەم مەبەستە ناسرخان هەڵسا بەئامادەکارییەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێرشە چاوەڕوانکراوەکەی سوپای ئێران[٥٢٤]، هەرچەندە سەرکردە هیندییەکان لە کۆبوونەوەیەکان لە دەڵهی ڕەزامەندییان نیشاندا لەسەر پێشنیازەکەی دیڤران خان، بەڵام بەهۆی چێبوونی ناکۆکیی لەنێوان سەرکردەکان لەسەر دەستنیشانکردنی سەرکردەی گشتیی سوپا هەرەس بە ئامادەکارییەکان هات[٥٢٥].

لەو هەلومەرجەدا هەواڵی کوژرانی نێردە تایبەتییەکەی (شا)ی ئێران بۆ دەڵهی گەیاندرایە نادرشا، کەلەلایەن وەلەد میر عەباس فەرمانڕەوای شاری جەلال ئاباد[٥٢٦] کە نێزیکەی ١١٥ کیلۆمەتر دوورە لە کابوڵ، ئەنجام درابوو، بۆیە ئەم ڕووداوە نادر (شا)ی ناچار کرد بەشێك لە سوپاکەی بە**سەرکردایەتیی** حاجی خان لە کابوڵەوە ڕەوانەی جەلال ئاباد بکات، بەمەبەستی دەستگیرکردنی بکوژانی نێردەکەی، بەڵام هەر بەنێزیك بوونەوەی سوپای ئێران میر عەباس شاری جەلال ئابادی جێهێشت، لەبەرامبەردا دانیشتووان شارەکە ملکەچبوونی خۆیان بۆ سوپای ئێران ڕاگەیاند[٥٢٧].

حاجی خان لە ڕێگەی هەڕەشەکردن لە دانیشتووان شارەکە توانی شوێنی خۆشاردنەوەی میر عەباس دەستنیشان بکات، چونکە پێی ڕاگەیاندن ئەگەر بکوژانی نێردەکەی نادرشا ئاشکرا نەکرێت، ئەوە سزادانی گشتیی بەسەر هەموویان جێبەجێ دەکرێت، بۆیە خەڵکی جەلال ئاباد کەوتنە خۆیان، لە دوای دۆزینەوەی شوێنی میر عەباس لە شەڕێکی سەختدا توانیان بیکوژن و سەرە بڕاوەکەی بۆ حاجی خان بهێننەوە جەلال ئاباد[٥٢٨]، پاش ئەم ڕووداوە نادرشا لە ١٨ی ئەیلوولی ١٧٣٨ز گەیشتە جەلال ئاباد، لەهەمان کاتدا مورتەزا قولیخانی کوڕی گەیشتە ئەو شارە، پاش ئەوەی توانی دەست بگرێت بەسەر قەڵای غوربەند و بامیان[٥٢٩].

---

(٥٢٤) مهدی بامداد،، منبع پیشین،ص٢١٨.

(525) Jonas Hanway,Op.Cit,P.154.

(526) David O. Allen, Op.Cit, PP.142-143.

(٥٢٧) بهرام افراسیابی، منبع پیشین، ص٤٤٨.

(٥٢٨) همان منبع، ص٤٤٩.

(٥٢٩) **عبدالعظیم رضائی**، منبع پیشین، ص٢٧ "

William Irvine, Op.Cit,P.327.

سەبارەت بەرەزا قولیخان، پاش گەڕانەوەی لە سنوورەکانی بوخارا بەهێزێکی ١٢ هەزار سەربازییەوە لە ناوچەی بەهار سفلی بەدووری پێنچ فەرسەخ (١٥میل) لە باشووری ڕۆژئاوای جەلال ئاباد بەدیداری باوکی گەیشت[٥٣٠]، پاشان لە١٤ی تشرینی دووەمی هەمان ساڵ نادرشا لە مەراسیمێکدا تاجگوزاری بۆ کرد و داوای لێکرد بگەڕێتەوە بۆ مەشهەد، بەمەبەستی بەڕێوەبردنی کاروباری ئێران، تا ئەو کاتەی نادرشا کۆتایی بەهەڵمەتە فرەوانخوازییەکەی لە هیندستان دەهێنێت و دەگەڕێتەوە ئێران[٥٣١]، هەروەها سنوورێکیش بۆ هەڕەشەکانی ئیلبارسی فەرمانڕەوای خوارزم دابنێت، چونکە نیازی وابوو هێرش بکاتە سەر خۆراسان لە کاتی سەرقاڵبوونی نادرشا لە هیندستان[٥٣٢].

شیاوی باسکردنە نادرشا لە دوای مەراسیمی تاجگوزاری بۆ رەزا قولیخان، لە**٢٣**ی تشرینی دووەم **١٧٣٨**ز لەجەلال ئابادەوە بەرەو پیشاوەر هەنگاوی هەڵهێنا، هەرچەندە لەو ڕێگەیە تووشی ناڕەحەتی زۆر بۆوە، بەهۆی هێرشی لەناکاوی ئەو هۆزانەی کە لە دارستانەکانی ناوچەکەدا بوون، بۆیە نادرشا ناچار بوو دانوستاندن لەگەڵیان ئەنجام بدات، بەگوێرەی ڕێکەوتنی هەردوولا پێویست کرا لەسەر نادرشا هەر دەسکەوتێك بەدەست بهێنێت پشکی ئەوانیشی تێدا بێت، هەروەها ئەرکی پارێزگاریکردنی ئەو هۆزانە بکەوێتە ئەستۆی نادرشا، لەبەرامبەریشدا هۆزەکان هێرشەکانیان بۆ سەر سوپای ئێران ڕابگرن[٥٣٣].

نادرشا لە ڕێگەی ئەو دانوستاندنە توانی سۆزی هۆزەکان بۆ خۆی رابکێشێت، چونکە دەسەڵاتدارانی هیندی لە ماوەی پێنج ساڵی ڕابردوودا هەموو یارمەتییەکانی بۆ ئەو ناوچەیە بڕی بوو، بۆیە هۆزەکان پاش ئەو ڕێکەوتنە یارمەتی باشیان پێشکێش بەسوپای ئێران کرد لەکاتی تێپەربوونیان بەناوچەکەیاندا، تەنانەت بەشێکیان چوونە ناو ڕیزەکانی سوپای ئێران[٥٣٤]، دواتر نادرشا نامەیەکی ئاراستەی ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی هیندی کرد، تێیدا داوای لێکرد، ئامادەیە هەڵمەتەکانی لەناو خاکی هیندستان ڕابگرێت و بگەڕێتەوە ئێران،

---

(٥٣٠) **رضا** شعبانی، تاریخ اجتماعی ..، جلد اول، ص٧٢ " **رضا** زاده **شفق، المصدر السابق، ص١١٧.**

(٥٣١) کەلیمولڵلای تەوەحودی، سەرچاوەی پێشوو،ل١٢٢.

(٥٣٢) **محمد کاظم** مروی وزیر مرو،منبع پیشین، **جلد** دوم،ص ص٦٢٨-٦٢٩.

(533) Jonas Hanway,Op.Cit,P.156.

(534) Fraser. J., Op.Cit, PP134-135 "Robert Montgomery Martin,The British Colonies:Their history,extent, condition and resource,Volume.9,London,1850, P.164.

لەبەرانبەر پێدانی چوار کرۆر[٥٣٥] و چوار هەرێمی هیندی بەنادرشا، بەڵام ئەم داواکاریانەی (شا)ی ئێران لەلایەن ئیمپراتۆری هیندی ڕەتکرایەوە[٥٣٦].بەمەش پێوەندییەکانی ئێران و هیندستان گواسترانەوە بۆ قۆناخی بەرەنگاربوونەوە.

دوای ڕەتکردنەوەی داواکارییەکان لەلایەن دەسەڵاتدارانی دەلهی، نادرشا بەردەوامیدا بەلەشکرکێشییەکەی بەئاراستەی پیشاوەر، لە بەرانبەریشدا ناسرخانی فەرمانڕەوای شارەکە بۆ ڕێگەگرتن لەیسوپای ئێران نێزیکەی ٢٠هەزار سەربازی لە جەمرود دانا بەمەبەستی پارێزگاریکردن لە گەرووی خەیبەر[٥٣٧]، کە تاکە دەروازەیە بۆ چوونە ناو خاکی هیندستان[٥٣٨]، لەو هەلومەرجەدا نادرشا گەیشتە ناوچەی دگا، لەوێش لەلایەن ڕێنیشاندەرەکانی ئاگەدارکرایەوە لە مەترسی بڕینی گەرووی خەیبەر، بۆیە دوای گفتوگۆکردن لەسەر دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەك، بڕیاردرا ڕێگەی شاخی سەرچوپە بگرنە بەر هەرچەندە ڕێگەیەکی سەخت و دژوار بوو، بەڵام لە ڕووی تەکتیکی سەربازییەوە باشترین ڕێگە بوو، پاشان توانرا لە شەودا ئەو ڕێگەیە ببڕن و بۆ بەیانی بگەنە هێڵی بەرگری هێزەکانی ناسرخان و لە شەڕێکی سەختدا توانرا شکست بەفەرمانڕەوای پیشاوەر بدەن و هێڵی بەرگری سوپای هیندی بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان[٥٣٩].

سەبارەت بەو هێزەی کە لە جەمرود دانرابوو لەسەر دەستی هێزەکانی ئێران بە**سەرکردایەتیی** مورتەزا قوولی شکستیان خوارد، بەمەش گەرووی خەیبەر و شاری پیشاوەر کەوتە دەست سوپای ئێران[٥٤٠]، پاش دەست بەسەرداگرتنی پیشاوەر، ناسرخان هەوڵ دەدات خۆی دەرباز بکات، بەڵام لەلایەن هۆزی پاتن دەستگیر دەکرێت و رادەستی

---

(٥٣٥) هـــەر کرۆرێـــك لەبەرامبـــەر یـــەك ملیـــۆن و دووســـەدپەنجا ئیســـترلی**نییـــە**: Jonas Hanway,Op.Cit,P.157.

(٥٣٦) ایرج افشار، منبع پیشین،ص٨٤٠.

(537) William Irvine, Op.Cit, P.329.

(538) P.SYKES, Op. Cit,P.352.

(٥٣٩) محمد حسین میمندی نژاد،منبع پیشین، ص ص٥٧٣-٥٧٤.

(٥٤٠) لکهارت، نادرشا،ص ص١٧٢-١٧٣. هەرچەندە بهرام افراسیابی پێی وایە نادرشا لە ڕێگەی پێدانی ١٠ تومان بۆ هەر سەربازێکی ناسر خان لە جەمرود، بۆتە هۆکار بۆ ئەوەی بەبێ شەڕ خۆیان ڕادەستی سوپای ئێران بکەن. بهرام افراسیابی، منبع پیشین، ص٤٦٢.

نادرشا کرایەوە، دواتر (شا)ی ئێران لە تاوانەکانی بەخشی و ناسرخانیش لە بەرامبەر ئەم کارەدا دڵسۆزی خۆی بۆ نادرشا دووپاتکردەوە و بوو بەبەشێك لە سوپای ئێران[٥٤١].

نادرشا لە شاری پیشاوەر هەواڵی کوژرانی ئیبراهیم خان زەهیر ئەلدەولەی فەرمانڕەوای ئازەربیجانی پێگەیشت بەدەستی لەزگییەکان لە داغستان، بۆ ئەم مەبەستە نادرشا لە یەکەمین هەنگاویدا میر ئەسلان قەرخلوی کردە فەرمانڕەوای ئازەربیجان وسەفی خان بەغایری کردە سەرکردەی هێزەکانی ئێران لە داغستان تا ئەو کاتەی لە هیندستان کارەکانی تەواو دەبێت و دەگەڕێتەوە ئێران بۆ سزادانی بکوژانی ئیبراهیم خان[٥٤٢].

بەر لەدەرچوونی لە پیشاوەر بەتایبەت پاش ملکەچبوونی فەرمانڕەوای قەڵای ئات تەك، نادرشا بڕیاری دروستکردنی پردێکی دا لەسەر ڕووباری (ئات تەك)[٥٤٣]، دوای ئاگەدارکردنەوەشی لە تەواوبوونی پردەکە، لە٦ی کانوونی دووەمی **١٧٣٩**ز ڕووباری سندی بڕی ڕوویکردە وەزیر ئاباد[٥٤٤]، لە هەمان کاتدا لەلایەن حاجی خان ئاگەدارکرایەوە کە زۆرینەی خەڵکی ناوچەکانی سەر ڕێگەی سوپای ئێران، ئامادەیی خۆیان نیشانداوە لە پاڵپشتیکردن و پێشکێشکردنی یارمەتی بۆ سوپای ئێران، لەوانەیە هەندێکیان بۆ پارێزگاریکردن لە **بەرژەوەندییە**کانیان و هەندێکی دیکە لەبەر زوڵم و ستەمی کاربەدەستانی هیندی ئەو هەڵوێستەیان نواندبێت[٥٤٥]، بێگومان ئەمەش کاردانەوەی خراپی لەسەر بارودۆخی سەربازە هیندییەکان دروستکرد، بۆ ئەم مەبەستەش زەکەریا خان داوای یارمەتی و کۆمەکی لە دەلهی کرد[٥٤٦]، بەڵام لە وەڵامدانەوەی کاربەدەستانی هیندی وا نیشاندرا، کە پێویستە زەکەریا خان پشت بەخۆی ببەستێت و لە ڕێگەی ئەو هێزەی کە هەیەتی بەربەست لەبەردەم لەشکرکێشییەکەی نادرشا دابنێت[٥٤٧].

---

(541) Jonas Hanway,Op.Cit,P.157.

(٥٤٢) حبیب الله شاملوئی، منبع پیشین، ص٧٠٧.

(٥٤٣) محمد حسین میمندی نژاد،منبع پیشین، ص٥٩٤.

(٥٤٤) لکهارت، نادرشا،ص١٧٣ " وەزیر ئاباد دەکەوێتە دووری ٦٠ میل لەشاری لاهور.
S. R . SHARMA, Op.Cit, P.728.

(٥٤٥) بهرام افراسیابی، منبع پیشین، ص٤٦٩.

(٥٤٦) **عبدالعظیم رضائی**، منبع پیشین، ص٢٨.

(٥٤٧) بهرام افراسیابی، منبع پیشین، ص٤٧٣.

نادرشا بەر لەوەی بگاتە وەزیر ئاباد، لە ناوچەی قەڵای گەنج لە دووری ١٢میل باکووری ڕۆژئاوای وەزیر ئاباد ڕووبەڕووی سوپای هیندی بووەوە بە**سەرکردایەتیی** قەلەندەرخان، لەمیانەی ئەو جەنگەدا نادرشا توانی شکست بەو هێزە هندییە بهێنێت، کە نێزیکەی حەوت هەزار سەرباز دەبوون بەتایبەت پاش کوژرانی قەلەندەرخانی سەرکردەی هێزەکە[٥٤٨]، دواتر سوپای ئێران توانی لە ڕووباری بنجاب بپەڕێتەوە و دەست بگرێت بەسەر وەزیر ئاباد و یەمین ئاباد[٥٤٩].

دوابەدوای داگیرکردنی وەزیر ئاباد و یەمین ئاباد لەلایەن سوپای ئێران، نادرشا بەردەوامیدا بە پێشڕەوییەکانی بەئاراستەی شاری لاهوور و لە ناوچەی شوعلەما بڕیاری وەستاندنی سوپاکەیدا، بۆ ئەوەی زانیاریی تەواو لەسەر ئەو شارە کۆبکاتەوە، دواتر لە ڕێگەی حاجی خان ئاگەدارکرایەوە، کە زەکەریا خانی فەرمانڕەوای لاهوور لەسەر کەناراوەکانی ڕووباری راوی بەرگری و قایمکاری بەهێزی دامەزراندووە بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوپای ئێران[٥٥٠]، بۆیە نادرشا لە ڕێگەی پلانێکی سەربازی توانی زەکەریا خان فریو بدات، چونکە راستەوخۆ هێرشی نەکردە سەر لاهوور، بگرە ڕوویکردە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری راوی بۆ ئەوەی ڕێگە بگرێت لەو هێزە هیندییەی کە بە**سەرکردایەتیی** (زەمیندار ئادینکەر) هاتبوون بۆ یارمەتی دانی زەکەریا خان[٥٥١]، لە ئەنجامی ڕووبەڕووبوونەوەی هەردوولا لە ناوچەی مەلیك پوور بەدووری ١٢ میل لەشاری لاهوور سوپای ئێران توانی شکست بەو هێزە هندییە بدات و پاشەکشەیان پێ بکات بۆ ناو شاری لاهوور[٥٥٢].

سوپای ئێران پاش ئەم ڕووداوە لە شووراکانی لاهوور نێزیك بۆوە، پاشان بەفەرمانی نادرشا دەستکرا بەبۆردومانکردنی شاری لاهوور، لەهەمان کاتیشدا لەلایەن سوپای ئێرانەوە هێرشی لەناکاو کرایە سەر زەکەریا خان لە کەناراوەکانی ڕووباری راوی، بەرئەنجام توانیان شکستی پێ بدەن و ناچاری بکەن پاشەکشە بکات بۆ ناو شاری لاهوور[٥٥٣]، پاشان لەلایەن زەکەریا خان داوای دانوستاندن کرا بەمەبەستی ڕادەستکردنی شارەکە، بۆ ئەم مەبەستە نادرشا ڕەزامەندیی

---

(٥٤٨) لکهارت، نادرشا،ص١٧٣.

(549) S. R . SHARMA, Op.Cit, P.728.

(٥٥٠) محمد حسین میمندی نژاد،منبع پیشین، ص ص٥٩٧-٥٩٨.

(٥٥١) لکهارت، نادرشا،ص١٧٤.

(552) William Irvine, Op.Cit, P.332.

(553) Fraser. J., Op.Cit,PP.149-150.

خۆی نیشاندا و عەبدولباقی خان وەك نوێنەری خۆی ڕەوانەی لاهوور کرد، لە کۆتایدا زەکەریا خان ڕازی بوو لەسەر ڕادەستکردنی شارەکە و ڕاگەیاندنی ملکەچی بۆ نادرشا(٥٥٤)، لەگەڵ پێشکێشکردنی چەندین دیاری گرانبەها(٥٥٥).

نادر شا لەدوای دەستگرتنی بەسەر لاهوور بۆ ماوەی ١٢ ڕۆژ لە باغی شوعلەمای نێزیك لاهوور مایەوە، لەو ماوەیەشدا هەڵسا بەدەرکردنی چەند فەرمانێك بۆ ڕێکخستنی کاروباری شارەکە(٥٥٦)، لەمیانەی ئەنجامدانی کارەکانیدا، زەکەریا خانی هێشتەوە لە پۆستەکەی وەك فەرمانڕەوای لاهوور(٥٥٧)هەروەها ناسرخانیش وەك فەرمانڕەوای کابوڵ و پیشاوەر (٥٥٨)، لەگەڵ گەڕاندنەوەی فەخرەدین ئەلدەولەی فەرمانڕەوای پێشووی کەشمیر کە لە لاهوور وەك پەناهەندە ژیانی بەسەر دەبرد بۆ سەر پۆستەکەی پێشووتری(٥٥٩)، سەرەڕای ئەوانەش جارێکی دیکە نادرشا نامەیەکی لە ڕێگەی نێردەیەکی ڕەوانەی دەرباری هیندی کرد، تێیدا دووبارە جەختی کردەوە لە پێوەندییەکانی هەردوولا و پرسی ئەفغانییە هەڵاتووەکان و کێشەی کوژرانی نێردەکەی لە جەلال ئاباد، لە کۆتایی نامەکەشیدا بەتوندی ئاگەداری ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی هیندی کردەوە لە هاویشتنی هەر هەنگاوێکی دوژمنکارانە دژ بەسوپای ئێران و داواشی لێکرد ملکەچبوونی خۆی رابگەیەنێت بۆ نادرشا(٥٦٠).

سرووشتیە ئەم داواکارییە لەلایەن دەسەڵاتدارانی هیندی مایەی قبووڵکردن نەبوو، چونکە بەشەرمەزاری بۆ سەر شکۆ و دەسەڵاتی خۆیان دەزانی، بۆیە محەمەد شا داوای لە دەربارِیانی هیندی کرد بەزووترین کات سوپا ئامادە بکەن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو

---

(٥٥٤) لکهارت، نادرشا،ص١٧٤.

(٥٥٥) سەبارەت بەو دیارییانەی، کە زەکەریا خان لەکاتی ملکەچبوونی بۆ نادرشا پێشکێشی کرد بریتی بوو لە بیست لەك زێڕ کە هەر لەکێك سەد هەزار روپییەیە لەگەڵ چەند فیلێك و چەندین دیاری گرانبەها. میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص٣١٨.

(٥٥٦) لکهارت، نادرشا،ص١٧٤.

(٥٥٧) میرزا مهدی خان استرابادی، دره نادره...، ص ص٧٤٤-٧٤٥.

(٥٥٨) **ریاض** الاسلام، منبع پیشین،ص٢٣٧.

(559) William Irvine, Op.Cit, P.333.
(560) William Irvine, Op.Cit, P.333.

مەترسییە دەرەکییە، بۆ ئەم مەبەستەش لە ماوەی یەك مانگدا ٣٠٠ هەزار سەرباز و دووهەزار فیل و دووهەزار تۆپی ئاگرین ئامادەکرا[٥٦١]، هەروەها کاروباری محەمەد شا لەو سەردەمەدا لە دەست هەریەکە لە خان دووران میری میران و سەرکردەی گشتیی سوپای هیندی و نیزام ئەلمولك فەرمانڕەوای دەکەن و قەمەرەدین خان ئیعتمادئەلدەولە و سەدری ئەعزەم دابوو، لەگەڵ بوونی دووبەرەکی و ململانێی توندی نێوانیان کە هەر یەکەیان لە هەوڵی ئەوەدابوو چاڵ بۆ ئەوەکەی دیکە هەڵبکەنێت، ئەمەش کاری نادرشای ئاسانتر کرد لە جەنگی یەکلاکەرەوەی کەرنال[٥٦٢].

## ب- جەنگی کەرنال ٢٤ی شوباتی ١٧٣٩ز

سوپای هیندی لە کانوونی دووەمی **١٧٣٩**ز لەدەلهییەوە بەرەو کەرنال بەڕێکەوت، پاش گەیشتنیان دەستیانکرد بەجێگیرکردنی سوپا و ئامادەکارییە سەربازییەکان[٥٦٣]، هەروەها محەمەد شا لە١٨ی کانوونی دووەم بە مەراسیمێکی شکۆدار لەگەڵ کوڕە گەنجەکەی بەناوی سوڵتان ئەحمەد کە وەك سەرۆکی پاسەوانانی دانرابوو، لەدەلهیەوە بەرەو سەربازگەی هیندی بەرێکەوتن و لە٤ی شوبات گەیشتنە دەشتی کەرنال [٥٦٤]، لە نێزیك ڕووباری پیرۆزی جومنا لە ناوچەیەك لەنێوان ڕووباری فەیز و دارستانی زار سوپاکەیان جێگیر کرد[٥٦٥].

سەبارەت بەئیمپراتۆری هیند هیچ شتێکی کەم نەبوو تەنیا ئازایەتی و زانایی نەبێت، لەوێش هێزەکانی دابەشکردە سەر سێ قۆڵ[٥٦٦]، لای راستی سوپا کەوتە دەست خان دووران کە پێنج سەرکردە لەژێر دەسەڵاتی دابوو، لای چەپی سوپا لەژێر سەرپەرشتی قەمەرەدین خان بوو کەسێ سەرکردەی لەگەڵدابوو، هەرچی ناوەڕاستی سوپا بوو لەلایەن خودی محەمەد شا و نیزام ئەلمولك سەرپەرشتی دەکران[٥٦٧].

---

(٥٦١) **عبدالعظیم رضائی**، منبع پیشین، ص٢٨.

(٥٦٢) عباس اقبال اشتیانی، باقر عاقلی، منبع پیشین، ص ص٦٢٤-٦٢٥.

(563) Fraser. J., Op.Cit,PP.136-137.
(564) Jonas Hanway,Op.Cit,PP.158-159.

(٥٦٥) حبیب الله شاملوئی، منبع پیشین، ص٧٠٨.

(566) Fraser. J., Op.Cit,PP.152-153.
(567) Jonas Hanway,Op.Cit,P.159.

نادرشا لە دوای ئاگەداربوونەوەی لە ئامادەكارییەكانی سوپای هیندی لە كەرنال، لە٢٦ی كانوونی دووەم ساڵی **١٧٣٩** ڕوویكردە دەشتی كەرنال بەیاوەری **١٣٥** هەزار سەرباز بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای هیندی، بۆ ئەم مەبەستە لە(٥)ی شوبات گەیشتە سەرهەند و لە (٧)ی شوبات گەیشتە ئەنبالە[٥٦٨] پاشان لە (١٤)ی شوبات گەیشتە دەشتی كەرنال و بەدووری ١٠ میل لە سوپای هیندییەوە هێزەكەی جێگیر كرد[٥٦٩].

دوا بەدوای ئەوەی سەعادەت خان فەرمانڕەوای بەنگالە گەیشتە سەربازگەی هیندی لەكەرنال، هێزەكەی كە نێزیكەی ١٢ هەزار سەرباز دەبوون لەدوای خۆی بە**سەركردایەتیی** هیمەت خان كەوتنە ناو بۆسەیەكی سوپای ئێرانی بە**سەركردایەتیی** حاجی خان كورد و جانعەلی خان گوگلان (توركمەن)، لە ئاكامی بەگژیەكداچوونی هەردوو هێز، ژمارەیەكی زۆر لە هێزە هیندییەكە كوژران و بەدیل گیران لەگەڵ بەدەستهێنانی چەند دەسكەوتێكی سەربازی بۆ سوپای ئێران[٥٧٠].

ئەم ڕووداوە بووە هۆكارێك كە سەعادەت خان هانی ئیمپراتۆر بدات بۆ هێرشكردنە سەر سوپای ئێرانی، چونكە پێی وابوو مانەوەی سوپا لەو سەربازگەیە بەبێ ئەنجامدانی شەڕ دەبێتە نێچیرێكی ئاسان بۆ سوپای ئێران[٥٧١]، هەروەها نادرشا لە١٢ شوبات دووبارە هێزێكی شەش هەزار سەربازی دیكەی بە**سەركردایەتیی** حاجی خان بەڕێكرد[٥٧٢]، بەمەبەستی وەرگرتنی زانیاریی لەسەر ناوچەی (پانی بت)[٥٧٣] ، چونكە نادرشا مەبەستی داگیركردنی ئەو ناوچەیەی هەبوو بۆ ئەوەی پێوەندیی ئیمپراتۆر لەگەڵ دەهلی ببڕێت[٥٧٤].

---

(568) William Irvine Op.Cit, P.334.
(569) G . S . Chhabar, Op.Cit, P.8.

(٥٧٠) كەلیمولڵای تەوەحودی، سەرچاوەی پێشوو،ل١٢٦.

(571) Jonas Hanway,Op.Cit,P.165.
(572) Fraser. J., Op.Cit,PP.153-154.

(٥٧٣) شارێكە لە هەرێمی (هریانە) لەباكوری هیندستان، ئەم ناوچەیە لە مێژووی هیندستان چەندین جەنگی یەكلاكەرەوەی تێدا ڕوویداوە، بەناوبانگترینیان جەنگی نێوان بابر و ئیبراهیم ئەلودی بووە لە ساڵی ١٥٢٦ز، كە تێیدا بابر توانی سەركەوێت بەسەر ڕكابەرەكەی و ئیمپراتۆرییەتی مەغۆلی هیندی دابمەزرێنێت، هەروەها ئەم شوێنە ئێستە گرینكترین سەنتەری بازرگانی دانەوێڵەیە لە هیندستان. **رضا** زادە **شفق، المصدر السابق،ص٣٠.**

(٥٧٤) محمد شفیع تهرانی، تاریخ ...،منبع پیشین، ص٣١٧.

هەر لەو دەرچوونەدا حاجی خان توانی ڕووبەڕووی دەستەیەکی سوپای خان دووران ببێتەوە و شکستیان پێ بدات و تەواوی چەك و تفاقیان دەست بەسەردا بگرێت و بگەڕێتەوە تیلاوەری[٥٧٥]، ئەم ڕووداوە بووە پاڵنەرێك بۆ سەعادەت خان بۆ ئەوەی ئەو هەلە بقۆزێتەوە بۆ هێرشکردنە سەر سوپای ئێران[٥٧٦]، بەڵام حاجی خان پاشەکشەی کرد بەمەبەستی ڕاکێشان و دوورخستنەوەی سەعادەت خان لەهێزی سەرەکی[٥٧٧] دوای ئەمەش ئیمپراتۆر داوای لەخان دووران کرد بەهێزێکی ٨-٩ هە زار سەربازی بەرێبکەوێت بۆ گۆڕەپانی جەنگ بەمەبەستی یارمەتیدانی سەعادەت خان، لەهەمان کاتدا خان دووران پێیوابوو جەنگ کردنی لەگەڵ نادرشا وەك شەڕکردنە لەگەڵ یاخیبوویەك یاخۆ تێکدەرێك لە بازاڕ و شوێنە گشتییەکانی دەڵهی[٥٧٨].

لە٢٤ی شوباتی **١٧٣٩**ز جەنگ لەنێوان هەردوو هێز ڕوویدا، کە لە ناوەڕاستی ڕۆژدا دەستیپێکرد و بەردەوام بوو بۆ ماوەی شەش کاتژمێر[٥٧٩]، سەرەتا هەرسێ دەستەی سوپای ئێرانی بەرەنگاری سەعادەت خان بوونەوە بەشێوەیەك توانرا لای ڕاستی سوپای هیندی تێك بشکێنن و سەعادەت خان دەستگیر بکەن[٥٨٠]، پاشان دووران خان لەگەڵ سوپاکەی هاتنە ناو گۆڕەپانی جەنگ، کە چەند فیلێك لە پێشەوەی هێزەکەدا بوون، هەرچەندە لەسەرەتادا سوپای ئێران تووشی شۆك هاتن، چونکە شەڕی لەم جۆرەیان ئەنجام نەدابوو[٥٨١]، بەڵام نادرشا توانی بەسەر ئەو بارودۆخە زاڵ بێت، پاش ئەوەی لە ڕێگەی گرتنەبەری تاکتیکێکی سەربازی بارودۆخەکەی لە شڵەژانەوە بۆ سەرکەوتن گۆڕی[٥٨٢] هەروەها نیزام ئەلملوك کە **سەرکردایەتیی** بەشی چەپی سوپای

---

(575) Jonas Hanway,Op.Cit,P.165.

(576) Ibid,P.165.

(٥٧٧) لکهارت،نادرشا،ص١٨٠ .

(٥٧٨) همان منبع،ص١٨٠.

(٥٧٩) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص٣١٥.

(٥٨٠) لکهارت،نادرشا،ص ص١٨١-١٨٢.

(581) Jonas Hanway,Op.Cit,P.166.

(٥٨٢) کەلیمولا تەوەحودی پێی وایە نادرشا لە ڕێگەی فەرمانێکەوە کە داوای لەتۆپاخانەکەی کرد، تۆپەکانیان بەئاراستەی فیلەکان بهاوێژن، هەر ئەمەش وایکرد، پشێوی لەناو سوپای هیندی دروست بێت،

هیندی دەکرد، لەلایەن محەمەد شای ئیمپراتۆری هیندی داوای لێکرا بۆ کۆمەك کردنی هەردوو سەرکردە، بەڵام گوێڕایەڵی فەرمانەکەی ئیمپراتۆر نەبوو(٥٨٣).

دەکرێت بڵێین پێڕەوکردنی تەکتیکی سەربازی لەلایەن خودی نادرشا، هەروەها بەکارهێنانی چەکی سەردەمیانەی سوپای ئێران لەچاو سوپای هیندی(٥٨٤)، لەگەڵ یەکگرتووی سوپای ئێران و کۆبوونەوەیان لەژێر چەتری یەك سەرکردە تەواو پێچەوانەی سوپای هیندی بوون کە سەرکردەکانیان لەبەربوونی ململانێی و دووبەرەکیی نێوانیان بوونە هۆی ئەوەی کە سوپای ئێران هەرچەندە لە ڕووی ژمارە و دووریان لە خاکی خۆیان توانیان سەرکەوتن بەدەست بهێنن.

لەلایەکی دیکەوە زیانی گیانی سوپای هیندی لەمیانەی جەنگی کەرنال **٣٠** هەزار سەرباز وەك قوربانی ئاماژەی پێکراوە(٥٨٥)، لەهەمان کاتدا زیانی گیانی سوپای ئێران لەو جەنگە برێتی بوو لە **٢٥٠٠** سەرباز و **٥** هەزار بریندار(٥٨٦)، لەگەڵ دەستگیرکردنی

---

بەهۆی هەڵگەڕانەوە و پاشەکشەکردنی فیلەکان بەئاراستەی سوپای هیندی، هەروەها بەهرام ئەفراسیابی هاوڕایە لەگەڵ تەوەحودی، لەهەمان کاتدا رەخنە لە هانوی دەگرێت بەهۆی باسکردنی لە بەکارهێنانی وشتر و دانانی تەنوری مسین لەسەر پشتیان، دواتر کردنەوەی ئاگر لەسەر پشتیان و ئاراستەکردنیان بۆ فیلەکان، لەو بارەیەوە ئەفراسیابی بەسەر سوورمانەوە دەڵێت (( ئایا وشترەکان تا ئەو رادەیە هۆشیان هەیە بۆ دیارکردنی کارەکەیان ڕوو بکەنە فیلەکان، یاخود ئەگەر چەند کەسانێك ئەوانیشی راکێشا بێت بەئاراستەی فیلەکان هەر راست **نییە**، چونکە لەلایەك سەربازانی ئێران بەبینینی فیلەکان تووشی شۆك هاتن، لەلایەکی دیکەوە ئەگەر وامان دانا راست بێت ئەوە ئەو سەربازانەی ئەرکی راکێشانی وشترەکانیان لە ئەستۆ بووە نەبوونەوتە ئامانجی سوپای هیندی، هەروەها چۆن توانرا لە شەوی جەنگدا ئەوەندە تەنووری مسین دروست بکرێت)). کەلیمولاّ تەوەحودی، سەرچاوەی پێشوو،ل١٢٧" بهرام افراسیابی، منبع پیشین، ص ص٥٠٥-٥٠٦ "
Jonas Hanway,Op.Cit,PP.166-167.

(٥٨٣) پ.ی . پتروف، منبع پیشین،ص٢٥.

(٥٨٤) لکهارت،نادرشا،ص١٨٢.

(٥٨٥) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص٣٢٠. سەبارەت بەژمارەی کوژراوانی هیندی لوکهارت، بەپێچەوانەی میرزا مەهدی خان ١٠ هەزار کوژراوی ئاماژە پێکردووە .لکهارت،نادرشا،ص١٨٣.

(586) Fraser. J., Op.Cit,P.158.

سەعادەت خان لە گۆڕەپانی جەنگ لەلایەن سوپای ئێران و برینداربوونی دووران خانی میری میران و سەرکردەی گشتیی سوپای هیند زۆر بەسەختی[٥٨٧].

دوا بەدوای ئەو سەرکەوتنە نادرشا بەردەوامیدا بەهێرشەکانی بەئاراستەی سەربازگەی سەرەکیی هێزەکانی هیند، بەتایبەت دوای ئەوەی ئالۆزی و پشێوی ناو سەربازگەکەی تەنییەوە بەهۆی شکستی سوپای هیند لە کەرنال، بەڵام نادرشا هەوڵی نەدا داگیری بکات، چونکە تا ئەو کاتیش قایمکارییەکانی زۆر بەهێز بوون، بۆیە ئەستەم بوو بۆ سوپای ئێران بیانبڕێت[٥٨٨]، دواتر نادرشا فەرمانیدا بەگەمارۆدانی ئەو سەربازگەیە بۆ ئەوەی پێوەندییەکانی لەگەڵ دەوروبەری ببڕێت[٥٨٩].

شیاوی باسکردنە ئەم گەمارۆدانە و بڕینی پێوەندییەکانی سەربازگەی هیندی بە دەوروبەریەوە، ئیمپراتۆری هیندی ناچار کرد ڕۆژێك دوای جەنگی کەرنال، نیزام ئەلمولك ڕەوانەی سەربازگەی ئێرانی بکات بەمەبەستی ئەنجامدانی دانوستاندن[٥٩٠]، بۆ ئەم مەبەستە عەبدولباقی خان وەك نوێنەری نادرشا دەستنیشانکرا بۆ ئەنجامدانی دانوستاندن لەگەڵ نیزام ئەلمولك[٥٩١]، پاش گفتوگۆکردن هەردوو لایەن ڕێککەوتن لەسەر دووخاڵی گرینگ، لەوانە دەست هەڵگرتنی نادرشا لە کردە سەربازییەکانی لە هیند و گەڕانەوەی بۆ ئێران، لەبەرانبەر بژاردنی غەرامەی جەنگی لەلایەن ئیمپراتۆریەتی هیندی مەغۆلی، بەڵام لەلایەن نوێنەری ئێران جەخت لەوە کرایەوە پێویستە خودی ئیمپراتۆری هیندی بێتە سەربازگەی ئێرانی و لە بەرانبەر نادرشا ملکەچبوونی خۆی ڕابگەیەنێت[٥٩٢].

هەرچەندە خاڵی دووەم جێبەجێکردنی گران بوو لەسەر شکۆ و دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی هیندی مەغۆلی، بەڵام بەهۆی خراپی بارودۆخی سیاسی و سەربازی ناچار بوو داواکارییەکەی نادرشا پەسند بکات، بۆیە لە**٢٧**ی شوبات **١٧٣٩**ز **محەمەدشا** ڕوویکردە سەربازگەی نادرشا[٥٩٣]، لەلایەن هەر یەکە لە نەسروڵا میرزا و حاجی خان کورد زەفەرانلو پێشوازی

---

(587) Robert Montgomery Martin,Op.Cit,P.165.
(588) Jonas Hanway,Op.Cit,P.172.

(٥٨٩) پ.ی . پتروف، منبع پیشین،ص٢٥.

(590) Robert Montgomery Martin, Op.Cit,P.165.

(٥٩١) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص٣٢٧.

(٥٩٢) لکهارت،نادرشا،ص ص١٨٤-١٨٥.

(593) A. Yusuf Ali, Op.Cit,P.184.

لێکرا[٥٩٤]، پاشان چاوی کەوت بەنادر شا، لە دیدارەکەشیدا لەگەڵ (شا)ی ئێران، ئیمپراتۆری هیندی تاجی پاشایەتی لەسەری هێنا خوارەوە و لە تەنیشت خۆی داینا[٥٩٥]، بەئەنجامدانی ئەو کارەی محەمەدشا لەناو سەربازگەی ئێرانی، ئاماژەیەکی ڕوون و ئاشکرایە، کە بەشێوەیەکی گشتیی کاروباری هیندستان کەوتە دەست نادرشا[٥٩٦].

لە ٧ی ئازاری ١٧٣٩ز ئیمپراتۆری هیندی بەیاوەری ٢٠٠٠ کەس لەپیاو ماقووڵان و یاوەرانی، لەگەڵ هەر یەکە لە خێزانی و سوڵتان ئەحمەدی کوڕی جارێکی دیکە لەسەر ڕاسپاردەی نادرشا ڕوویکردە سەربازگەی ئێرانی، پاش مەراسیمی پێشوازیکردن هەر یەکە لەمحەمەدشا و نادرشا دەستیانکرد بەگفتوگۆکردن و ڕێککەوتن لەسەر ڕۆیشتنیان بۆ ناو شاری دەلهی[٥٩٧]، هەر دوای کۆبوونەوەکەش نادرشا لە فەرمانێکدا داوایکرد لە بەشێك لە سوپاکەی ڕوو بکەنە سەربازگەی هیندی لە کەرنال، ئەو هێزە ئێرانییە چەند سەرکردە و کەسایەتییەکی هیندیان لەناو سەربازگەکە دەستگیر کرد، پاشان دەستیانگرت بەسەر نێزیکەی دووسەد تۆپی ئاگرین و ڕەوانەی شاری (کابول)یان کرد[٥٩٨].دوای ئەم ڕووداوە هەموو ئامادەکارییەکان ڕێکخران بەمەبەستی چوونی نادرشا بۆ ناو دەلهی پایتەختی ئیمپراتۆریەتی هیندی مەغۆلی.

---

(٥٩٤) کەلیمولاّی تەوەحودی، سەرچاوەی پێشوو،ل١٢٨.

(٥٩٥) **ریاض** الاسلام، منبع پیشین،ص٢٣٧.

(٥٩٦) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص٣٢٧.

(٥٩٧) بیان واقع **سرکذشت** نادرشاه و... در **ذکر** محاربه فرمانفرمای هندوستان با والی ایران بـاین عنـوان و عاقبت بمصالحه انجامیدن، مجله وحید، شماره ٢٣٢، تهران، نیمه دوم اردیبهشت ١٣٥٧ ه.ش، ص٢٣٢.

(598) Jonas Hanway,Op.Cit,P.173.

## تەوەری سێیەم:

## ڕاپەڕینی دەلهی وبەرئەنجامەکانی

نادرشا بەر لەدەرچوونی لەدەشتی کەرنال، داوای لە تەهماسب خان جەلایری کرد، بەیاوەری چوار هەزار سەرباز ڕوو بکاتە دەلهی بەمەبەستی وەرگرتنی کلیلەکانی دەروازەی شاری دەلهی، هەرچەندە لە سەرەتادا دەروازەکانی دەلهی بەڕووی تەهماسب خان جەلایری و هێزەکەی والآ نەکرا، کە لەلایەن فولاد خان فەرماندەی پاسەوانی شارەکە سەرپەرشتی دەکرا، تا ئەو کاتەی فەرمانی فەرمی نادرشا و ئیمپراتۆری هیندی گەیاندرایە فەرماندەی شاری دەلهی بۆ ئەوەی کلیلەکانی دەروازەی شارەکەیان پێشکێش بکات و خۆشی وەك فەرمانداری شارەکە بمێنێتەوە، پاش والآکردنی دەروازەکانی دەلهی تەهماسب خان جەلایری و هێزەکەی چوونە ناو شارەکە و دەستکرا بەرێکخستنی ئامادەکارییەکان بۆ پێشوازیکردن لە نادرشا [٥٩٩].

لە١٢ی ئازاری **١٧٣٩** نادرشا لەگەڵ ئیمپراتۆری هیندی گەیشتنە باغی شوعلەما لە دەوروبەری شاری دەلهی، دواتر محەمەد شا بەتەنیا گەڕایەوە ناو دەلهی بەمەبەستی چاوەدێریکردنی ئامادەکارییەکانی مەراسیمی پێشوازیکردن لە (شا)ی ئێران[٦٠٠]. دوای مانەوەی هەشت ڕۆژ لە باغی شوعلەما نادرشا لە٢٠ ئازاری **١٧٣٩**ز چووە ناو شاری

(٥٩٩) **رضا** افشار، نادر شاه چگونه هندوستانرا مسخر کرد،نشریه دانشکده ادبیات وعلوم انسانی تبریز،شماره (٢٥)، سالّ چهارم، دی ما (١٣٣٠ ه.ش)،ص٦.

(٦٠٠) **رضا** شعبانی، شورشی دلهی در زمان نادر شاه، مجله وحید، شماره ٨٣، ابان ١٣٤٩ه.ش،ص١٣٨٨.

دەهلی، بەیاوەری بیست هەزار سەرباز[٦٠١]، لە مەراسیمێکی شکۆداردا لە شوێنی بەرێکەوتنی تاکو شوێنی نیشتەجێبوونی[٦٠٢]، هەر لەمیانەی مەراسیمەکەدا **محەمەدشا** خەلاتی گرانبەهای پێشکێش بەنادرشا کرد، هەرچەندە نادرشا لە سەرەتادا دیارییەکانی ڕەتکردەوە، بەلام بەهۆی پێداگیری **محەمەدشا** ناچار بوو دیارییەکان قبوولْ بکات[٦٠٣]، پاشان نادرشا لە کۆشکی شا جهان جێگیر بوو، هەروەها ئیمپراتۆری هیندی لە باڵەخانەیەکی نێزیك ئەسەد بورج لە نێزیك نادرشا مایەوە، لەهەمان کاتدا هێزەکانی ئێران لە تەواوی شاری دەهلی و تاوەرەکانی بلاوبوونەوە[٦٠٤].

شیاوی باسکردنە نادرشا ڕۆژێك لەدوای هاتنی بۆ ناو شاری دەهلی کە دەکاتە ڕێکەوتی **٢١** ئازای **١٧٣٩**ز هاوکات بوو لەگەلْ جەژنی قوربان و جەژنی نەورۆز، لە هەموو مزگەوتەکانی شاری دەهلی وتار بەناوی نادرشا خوێندرایەوە[٦٠٥]، هەروەها پارەوپولیش بەناوی ئەو لێدرا و دەستەواژەیەکیش لەسەر پولەکان نەخشێندرا کە برێتی بوو لە (( هست **سلطان** بر **سلاطین** جهان شاه شاهان نادر صاحبقران))[٦٠٦]، بەلام هەر لە ئێوارەی هەمان ڕۆژدا چەندین پرۆپاگەندە بلاوکرایەوە، لەوانە دەنگۆی ئەوە هاتە ئاراوە، کە گوایە ئیمپراتۆری هیندی نادرشای ژەهرخوار کردووە، لەکاتی ئەو سەردانیکردنەی کە لەکاتی نیوەڕۆ ئەنجامیداوە بۆ شوێنی حەوانەوەی **محەمەد** شا[٦٠٧]، هەروەها هەندێکی دیکە پێیانوابوو نادرشا هەر لەقەلای ئەرك شوێنی حەوانەوەی

---

(٦٠١) **محمد** حسين قدوسى، منبع پيشين،ص١٥٢.

(٦٠٢) لكهارت، نادرشا، ص١٨٨ " سەبارەت بە مەراسیمی پێشوازیکردن لە نادرشا بگەڕێوە بۆ: Fraser. J., Op.Cit, PP.176-178.

(٦٠٣) **رضا** افشار،منبع پيشين،ص٧. سەبارەت بەو بابەتە (**رضا** زادە شفق) پێی وایە راستە نادرشا پێداگریی کردووە لەسەر وەرگرتنی دیارییەکان، بەلام ئەم پێداگرییە تەنیا رووکەش بووە، چونکە یەکێك لە هۆکارەکانی لەشکرکێشیی نادرشا بۆ هیندستان بەدەستهێنانی دەسکەوتی ئابووری بووە، کەوا بێت چۆن ئەو هەلە لەدەست دەدات. **رضا** زادە شفق،المصدر السابق،ص١٩٧.

(٦٠٤) **رضا** شعبانى، شورشى دلهى...،ص١٣٨٨.

(605) Radhy Shyam Chaurasia,History of modern India (1700 to 2000),Delhi ,2002,P.9.

(٦٠٦) **رضا** شعبانى، شورشى دلهى...،ص١٣٨٨.

(٦٠٧) مهدى بامداد،، منبع پيشين،ص٢٢٠.

**محەمەد** شا لەلایەن کەنیزە تورك و چینییەکان بەگوللە تیرۆر کراوە، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی دەنگۆی کەوتنە خوارەوەی نادرشا لەسەر بانی کۆشکەکەی(٦٠٨).

بڵاوبوونەوەی کوژران یاخود مردنی نادرشا بووە هۆکارێك بۆ سەرهەڵدانی **راپەڕین** دژ بەسوپای ئێران لەناو شاری دەلهی، هەرچەندە سەرەتا و هۆکاری **راپەڕینە**کە لەنێو مێژوونووسان راڤەی جیاوازی بۆ کراوە، عەباس پەرویز پێی وایە رێگە گرتنی تەهماسب قوولی جەلایر لە گرانی و فرۆشتنی گەنم بەنرخێکی گونجاو بووە هۆی تووڕەکردنی خاوەن گەنمەکان و دەربڕینی ناڕەزایی و هاندانی خەڵك لەدژی سوپای ئێران(٦٠٩)، کەچی بەگوێرەی سەرچاوە هیندییەکان هۆکاری **راپەڕینە**کە دەگەڕێننەوە بۆ مەرگی یاخود خۆکوژی سەعادەت خان بورهان ئەلمولك لەکاتێك تەرمەکەی لە قەڵا بردرا دەرەوە **راپەڕین** لەناو شاردا ڕوویدا(٦١٠).

بەهەرحاڵ بڵاوبوونەوەی هەموو ئەو دەنگۆیانە بووە هۆکارێك بۆ بەرپابوونی **راپەڕین** لەناو دەلهی، ئەوەی زیاتر پرسەکەی گەورەتر کرد، هاتنی ژمارەیەك جەنگاوەر لە باکووری ڕۆژئاوای سەرهەند بوو بۆ ناو شاری دەلهی بەمەبەستی وەرگرتنەوەی تۆڵەی خوێنی کوژراوەکانیان لەجەنگی کەرنال(٦١١)، ئەو گردبوونەوە و رق و کینەیە لە سوپای ئێرانی بووە هۆی کوژرانی ژمارەیەکی زۆر لە سەربازانی ئێرانی لەناو شاری دەلهی(٦١٢) بۆ ئەم مەبەستە ژان ئوتەر پێی وایە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی دەنگۆی کوژرانی نادرشا، هەر لە ئێوارەوە تا درێژایی شەو هیندییەکان کەوتنە گیانی سەربازانی ئێرانی و نێزیکەی ٢٥٠٠ سەربازیان کوشت(٦١٣).

---

(٦٠٨) **رضا** شعبانی، شورشی دلهی...،ص١٣٨٨.

(٦٠٩)عباس پرویز،منبع پیشین،ص١٢٠.

(٦١٠)**رضا** شعبانی، شورشی دلهی...،ص ص ١٣٨٩-١٣٩٠ . سەبارەت بەمردنی سەعادەت خان لوکهارت پێی وایە لەبەر سەختی برینەکانی ژەهری خواردووە. لکهارت، نادرشا، ص١٩٠.

(611) Fraser. J., Op.Cit, PP.180-181.

(612) David O. Allen, Op.Cit, P.144.

(٦١٣) ژان اوتر،منبع پیشین، ص ص١٦٥-١٦٦. سەبارەت بەقوربانییانی سوپای ئێران، عەباس ئیقبال ئاشتییانی بەپێچەوانەی گۆتەی ژان ئوتەر، پێی وایە ٧٠٠ سەربازی ئێرانی لەو ڕووداوە بوونەتە قوربانی. عباس اقبال اشتیانی، منبع پیشین،ص٧٢٧.

دوابەدوای گەیاندنی هەواڵەکان بەنادرشا، سەرەتا باوەڕی بەهەواڵەکە نەکرد، هەر زوو سەربازانی ئێرانی تۆمەتبار کرد بەنانەوەی پشێوی بۆ ئەوەی بتوانن تالآن و ڕاوە ڕووت لەناو شاری دەهلی ئەنجام بدەن، هەروەها نادرشا بۆ زانینی ڕاستی هەواڵەکان نێردەی تایبەتی خۆی ڕەوانەی ناوشار کرد، بەڵام بەهۆی کوژرانیان نەگەڕانەوە[٦١٤]، بۆیە نادرشا لە شەودا بڕیارێکی گشتاند بەسەر سوپاکەی کە لە ئامادەباشی دابن و هیچ کاردانەوەیەك ئەنجام نەدەن، تەنیا ئەگەر هێرش بکرێتە سەریان، لەبەرەبەیاندا خودی نادرشا لەگەڵ دەستەیەك لە سوپاکەی ڕوویکردە مەیدانی چاندی چوك بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخە ناهەموارەکەی شاری دەهلی[٦١٥].

هەر بەگەیشتنی بەمەیدانی چاندی چوك، بەتایبەت لە نێزیك مزگەوتی رۆشەن ئەلدەولە لەلایەن یەکێ لەڕاپەڕیوان گوللەیەکی ئاراستەکرا، بەڵام بەر یەکێك لەئەفسەرە پاسەوانەکانی کەوت و کوژرا، ئەم ڕووداوە بووە هۆی هەڵگیرساندنی بڵێسەی تووڕەیی نادرشا و ئەنجامدانی کوشتارگە لە دەهلی[٦١٦]، بۆ ئەم مەبەستە نادرشا لە ڕێگەی جارچییەکانی فەرمانیدا بەسوپاکەی دەست بکەن بەکوشتن و سەربڕینی هەر کەسێك لەناو شاری دەهلی، کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، بەتایبەت لەو شوێنانەی سەربازانی ئێرانی تێدا کوژراوە[٦١٧].

سوپای ئێران دەستبەجێ فەرمانەکەیان جێبەجێ کرد، بۆیە ئاشوب و ترسی گەورە باڵی کێشا بەسەر شاری دەهلی، هیچ شوێنێك نەمابوو نەبێتە نیشانەی تۆپچیانی هێزی ئێرانی[٦١٨]، سەرەڕای کوشتارکردن لەناو بازار، سوپای ئێران پەلاماری ماڵەکانیان دەست پێکرد، چەندین کردەی تالآنی و بردنی کەلوپەلی بەنرخ و کوشتنی هەرەمەکییان ئەنجامدا[٦١٩]، بۆ ئەم مەبەستە ( فریزەر) باس لە سووتاندنی خانووی هاووڵاتییان

---

(٦١٤) **رضا** شعبانی، شورشی دلهی...،ص ١٣٩٣.

(615) Fraser. J., Op.Cit, P.182.

(616) G . S . Chhabar, Op.Cit, P9" Fraser. J., Op.Cit, PP.183-184.

(٦١٧) لکهارت، نادرشا، ص١٩٢ "

George Ripley and Chrles A. Dana, The New American Cyclopaedia: Nadir shah , Volume. XII , New York, 1863,P.85.

(٦١٨) میرزا مهدی خان استرابادی، دره نادره...، ص٧٤٦.

(٦١٩) لکهارت، نادرشا، ص ١٩٢.

دەكات لەناو شاری دەهلی كە خانەوادەكەشی تێدا بووە، لەگەڵ دەستگیركردنی نێزیكەی ٥٠ هەزار كەس لەو كردە سەربازییەدا، شاری دەهلیش بێ دەنگی باڵی بەسەردا كێشابوو، تەنانەت لە هەر خانەوادەیەك تەنیا كەسێك یاخود كەسی بەزیندوویی نەمابوو[٦٢٠]. ئەم بۆچوونەی فریزەر تاڕادەیەك زیادڕۆیی تێدا بەدی دەكرێت، چونكە (ڕەزا شەعبانی) پێی وایە ڕووداوەكە تەنیا چەند ناوچەیەكی دیاریكراوی شاری دەهلی گرتۆتەوە، نەك هەموو شارەكە، بەشێوەیەك ڕووداوەكە لە دەروازەی دەهلی تاكو كهاری باولی، هەروەها لە قەڵای ئەرك تاكو مزگەوتی فەتح پووری گرتبۆوە[٦٢١].

خراپبوونی بارودۆخی ناو شاری دەهلی وایكرد هەر یەكە لە ئیمپراتۆری هیندی و قەمەرەدین خان و نیزام ئەلمولك تكا لە نادرشا بكەن دەست هەڵبگرێت لەو كردە سەربازییە، تا ڕادەیەكیش توانیان ئاگری تووڕەیی نادرشا خامۆش بكەن[٦٢٢]، بۆیە پاش تكای ناوبراوان نادرشا لە فەرمانێكدا لە ڕێگەی جارچییەكان لە سوپاكەی داوایكرد كردە سەربازییەكانیان لە شاری دەهلی كۆتایی پێ بهێنن، ئەم فەرمانەش دەست بەجێ لەلایەن هێزەكەی جێبەجێ كراو كردە سەربازییەكان وەستێنران، دوای ئەوەی ژمارەیەكی زۆری خەڵك بوونە قوربانی[٦٢٣].

نادرشا گەیشتە ئەو بڕوایەی، كە هەر یەكە لە سەید نیاز خان و شانەوازخان ڕۆڵی سەرەكییان هەبووە لە هاندانی خەڵك لە شاری دەهلی دژ بەسوپای ئێران، بۆیە لە

---

(٦٢٠) بۆ زانیاریی پتر لەبارەی بارودۆخی دەهلی لەكاتی جێبەجێكردنی فەرمانەكەی نادرشا بگەڕێوە بۆ:
Fraser. J., Op.Cit, PP.185-187.

(٦٢١) **رضا** شعبانی، تاریخ اجتماعی ...،جلد اول، ص ص٧٥-٧٦.

(٦٢٢) **رضا** شعبانی، شورشی دلهی...،ص ص ١٣٩٥-١٣٩٦.

(٦٢٣) سەبارەت بەقوربانییانی ئەو ڕووداوە لەنێوان مێژوونووسان ڕاڤەی جیاوازی بۆ كراوە، لەوانە فریزەر ١٢٠ هەزار كوژراوی هەژمار كردووە، كەچی میرزا مەهدی ٣٠ هەزاری داناوە، هەروەها لوكهارت ٢٠هەزار كوژراوی داناوە، بەگوێرەی **بۆچوونی ڕەزا شەعبانی**ئەو ژمارەیەی كەلوكهارت ئاماژەی پێكردووە بەڕاستری دادەنێت، چونكە پێی وایە ڕووداوەكە تەنها چەند ناوچەیەكی دیاریكراوی شاری دەهلی گرتۆتەوە نەك هەموو شارەكە، هەروەها ناوبراو جەخت لەوە دەكاتەوە، كە ژمارەی قوربانییان لەوانەیە كەمێك لەو ژمارەیە پتر بێت، بەڵگەشی بۆ ئەمە برێتییە لە كرداری خۆكوشتنی ژمارەیەكی زۆری ئافرەت لە ترسی پارێزگاریكردن لەئابڕوویان.

Fraser. J., Op.Cit, P.185 ؛

میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص٣٣١ " لكهارت، نادرشا، ص١٩٣ ؛ **رضا** شعبانی، تاریخ اجتماعی ..،جلد اول، ص ص٧٥-٧٦.

فەرمانێکدا هەر یەکە لە عەزیمولاّ خان و فولادخانی ڕاسپارد بۆ دەستگیرکردنیان کە لە قەڵایەکی نێزیك دەهلی خۆیان داڵدەدابوو، دوای شەڕێکی یەك دەمێری هەردووکیان دەستگیرکران و بەفەرمانی نادرشا لە سێدارەدران[٦٢٤].

سەبارەت بەشاری دەهلی، دوای بەرقەرارکردنی ئاسایش نادرشا فەرمانیکرد بەفولادخانی فەرمانداری شاری دەهلی، کە لاشەی مردووەکان کۆبکاتەوە، دیارە فولاد خان هەڵسا بەجێبەجێکردنی فەرمانەکە لە سەرەتادا لاشەکان کۆکرانەوە، پاشان چەند تەرمێك پێکەوە سووتێنران، هەندێکیش خرانە ناو ڕووبار[٦٢٥]، دواتر نادرشا بڕیاری ئابلۆقەدانی شاری دلهیدا بۆ ئەوەی لەو ڕێگەیەوە بتوانێت دەست بگرێت بەسەر داهات و موڵکی بازرگانان و میر و کەسایەتییە دیارەکانی هیندی[٦٢٦]، بۆ ئەم مەبەستەش شاری دەهلی دابەشکردە سەر چەند بەشێك و چەند کەسێکی دڵسۆزی خۆشی ڕاسپارد بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە[٦٢٧].

لەو هەڵمەتەدا نادرشا دەستی گرت بەسەر ماڵ و موڵکی هەر یەکە لەخان دووران و نیزام ئەلملك و قەمەرەدین خان و موزەفەرخان، بڕی ئەو دەسکەوتەی لەناو براوان وەرگیرا بە هەشت کرور و نیو هەژمارکراوە[٦٢٨]، لەهەمان کاتدا داوای لەدانیشتووان دەهلی کرد ماڵ وموڵکیان بەشێوەیەکی ڕاستگۆیانە ڕابگەیەنن، لەهەمانکاتدا ئاگەداری کردنەوە لە شاردنەوەی راستییەکان و پێدانی زانیاریی ناتەندروست لەسەر ماڵ و موڵکەکانیان ئەوە ڕووبەڕووی توندترین سزا دەبنەوە[٦٢٩]، پاش ئەو هەڵمەتە نادرشا توانی گەورەترین دەسکەوتی ئابووری بۆ خۆی و سوپاکەی دەستەبەر بکات[٦٣٠].

---

(٦٢٤) بهرام افراسيابى، منبع پيشين، ص ص٦١١-٦١٢ " **رضا** افشار،منبع پيشين، ص٨.

(٦٢٥) **رضا** شعبانى، شورشى دلهى...، ص١٤٠٠.

(626) Fraser. J., Op.Cit, P.188.
(627) Jonas Hanway,Op.Cit,P.187.
(628) Fraser. J., Op.Cit, PP.188,193.
(629) Jonas Hanway,Op.Cit,P.187.

(٦٣٠) سەبارەت بەدەسکەوتەکانی نادرشا لە هیند، ایرج افشار بەپشت بەستن و جەخت کردنەوەی لەبۆچوونەکانی هەر یەکە لەسایکس کە بڕی ١٧٥ کرور لیرەی ئینگلیزی داناوە، هەروەها فریزەر بڕی ٥٢٥ کرور تومان چەندین کەلوپەلی گرانبەها تایبەت بەنادرشا دیارکردووە،لەگەڵ بڕی ٧٥کرور تومان تایبەت بەدەسکەوتەکانی سوپای ئێرانی لە هیندستان. ایرج افشار،منبع پيشين،ص٨٤٥.

لە ڕێگەی ئەو سامانەی کە بەهۆی داگیرکردنی هیندستان بەدەستی هێنا نادرشا توانی تا ڕادەیەك ئابووری وڵات جێگیر بکات و زاڵ بێت بەسەر بارودۆخی ناهەمواری ناوەخۆ، بۆیە لەیەکەمین هەنگاویدا دوای داگیرکردنی هیندستان، لە نیسانی **١٧٣٩**ز فەرمانیدا بەبەخشینی دانیشتووان ئێران بۆ ماوەی سێ ساڵ لەدانی باج، هەروەها مووچەی ساڵێك وەك دیاری بەخشییە سەربازانی[(٦٣١)]، لەگەڵ ئەنجامدانی هاوسەرگیری بۆ نەسروڵای کوڕی لەگەڵ کچی برای محەمەد شای ئیمپراتۆری هیندی مەغۆل[(٦٣٢)].

نادرشا بۆ ماوەی **٥٨** ڕۆژ لەشاری دەلهی مایەوە، دواتر بەدەستی خۆی تاجی (شا)یەتی خستەوە سەر **محەمەد** شا و بڕیاری گەڕانەوەیدا بۆ کابول[(٦٣٣)] ، بەتایبەت دوای ئەوەی لە٦ی ئایاری **١٧٣٩** لەکۆبوونەوەیەکی دووقۆڵی لەگەڵ **محەمەد** شا (پەیماننامەی شالیمار)ی گرێدا، تێیدا دەسەڵاتدارانی هیندستان ناچارکران واز لەناوچەیەکی فرەوانی ژێر دەسەڵاتیان بهێنن بۆ ئێران، بەتایبەت ئەو ناوچانەی کە دەکەونە ڕۆژئاوای ڕووباری ئەتك و هەموو ئەو زەوییانەی، کە دەکەونە ڕۆژئاوای ڕووباری سند و نالاسنك[(٦٣٤)].

دوای بەستنی پەیماننامەی شالیمار، جارێکی دیکە لە١٢ی ئایاری **١٧٣٩**ز ، لەسەر داوای نادرشا کۆبوونەوەیەکی دیکە لەنێوان هەردوو لادا ئەنجام درا، مەبەستی (شا)ی ئێران لەبەستنی ئەو کۆبوونەوەیە برێتی بوو، لەدڵنیا کردنەوەی ئیمپراتۆری هیندی لەپێشکەشکردنی یارمەتی و کۆمەکییەکانی نادرشا لەکاتی گەڕانەوەیان بۆ ئێران، هەروەها لەمیانەی کۆبوونەوەکەدا داوای لەسەرکردە هیندیەکان کرد گوێرایەلی ئیمپراتۆر بن و هیچ یاخی بونێك ئەنجام نەدەن[(٦٣٥)].

---

(631) Fraser. J., Op.Cit, PP.189-190“

ایرج افشار، فتحی دهلی، مجله اینده، مجلد دوەم، شماره ١٢، تهران، اسفند ماه ١٣٠٦هـ.ش،ص٨٤٦.

(632) David O. Allen, Op.Cit, P.145.

(٦٣٣) ایرج افشار،منبع پیشین،ص٨٤٣.

(٦٣٤) میرزا مهدی خان استرابادی، دره نادره...، ص٧٤٧.

(635) Jonas Hanway,Op.Cit,PP.195-196.

بەر لەجێهێشتنی دەلهی نادرشا لە١٤ی ئایار **١٧٣٩**ز لەبڕیارێکدا مانەوەو جێگیر بوونی سەربازانی ئێرانی لەدەلهی و دەوروبەری قەدەغە کرد، لەگەڵ ئاگادار کردنەوەی دانیشتووان دەلهی لەگرتنە بەری سزای توندوتیژ بەرامبەر هەموو ئەو کەسانەی کەهەوڵی داڵدەدانی سەربازانی ئێرانی دەدەن[٦٣٦]، هەروەها لەهەنگاوێکی تری نادرشا برێتی بوو لەبڕیاردان لەسەر بنیادنانی شارێکی نوێ بەناوی فەتح ئاباد لەشوێنی جەنگی یەکلاکەرەوەی کەرنال، بۆ ئەم مەبەستەش بڕی (٥) هەزار ڕوپیەی تەرخان کرد، بەڵام هەر بەدوورکەوتنەوەی نادرشا لەدەلهی پرۆژەی دروستکردنی شارەکە نەکەوتە بواری جێبەجێ کردن[٦٣٧].

دوابەدوای ئەم هەنگاوانە نادرشا لە١٦ی ئایار **١٧٣٩**ز لەباغی شالیمار ڕوویکردە کابول [٦٣٨]، لەکاتی گەڕانەوەشیدا نادرشا لەگەڵ خۆیدا تەختی تاوس[٦٣٩] وگەوهەری دەریا نوری هێنا ، هەروەها لەگەڵ نێزیکەی ١٣٠ نووسەر و٢٠٠ ئاسنگەرو ٣٠٠ وەستاو ٢٠٠ دارتاش و١٠٠ شارەزا لەتاشینی بەرد[٦٤٠]، هۆکاری هێنانی ئەو پیشەگەرانە زیاتر بۆ مەبەستی بوژاندنەوەی کاری پیشەگەری بوو لەئێران، چونکە دەستی کار لە ئێران لەدوای داگیرکاری ئەفغانەکان وشەڕو ئاڵۆزیەکان ڕووی لەکەمی کردبوو، ویستی لەو ڕێگەیەوە ئەم کارە ببوژێنێتەوە [٦٤١]، هەروەها شارێکیش هاوشێوەی دەلهی لە ئێران بونیاد بنێت[٦٤٢].

دەکرێت بڵێین هەرچەندە نادرشا دوای مانەوەی **٥٨** ڕۆژ لە دەلهی، پاشان گەڕاندنەوەی تاجی (شا)یەتی بۆ ئیمپراتۆری هیندستان، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە نادرشا نیازی تەواوی نەبووە دەسەڵاتی تەواوی خۆی لە وڵاتێکی پان و بەرینی وەکو

---

(636) Fraser. J., Op.Cit, PP.209-210.

(637) Fraser. J., Op.Cit,P.212.

(638) Jonas Hanway,Op.Cit,P.198.

(٦٣٩) تەختی تاوس درێژیەکەی نۆ پێیە و **پانییە**کەی چوار پێ، دەکەوێتە ناوەراستی هۆلی دەرباری هیندی، لەناوەراستی تەختەکە تاوسێك هەیە و کلکەکەی درێژ بۆتەوەو بەبەردی بەنرخ داپۆشراوە، هەروەها ئەم تەختە لەسەردەمی تەیمورلەنگ بنیادنراوە،بەڵام لەسەردەمی شاجهان کارەکەی تەواوکراوە. بۆ پتر زانیـاری بگـەڕێوە بۆ: P. SYKES, Op. Cit,P.355.

(640) Radhy Shyam Chaurasia, Op. Cit,P.9.

(٦٤١) سعید نفیسی، کاروان **ثروت**( غنائم نادر شاه از فتح هندوستان)، **مجله شرق**، پیش شماره اول، بهار ١٣٠٣هـ.ش،ص٤٠.

(642) Radhy Shyam Chaurasia, Op.Cit,P.9.

هیندستان جێگیر بکات، بگرە زیاتر پرسەکە پێوەست بووە بەهۆکاری ئابووری، چونکە لە ڕێگەی ئەو دەسکەوتانەی، کە لە هیندستان بەدەستی هێنا توانی تا ڕادەیەك ئاڵۆزی و ئاشوب لە ناوەخۆی وڵات کەم بکاتەوە، لەهەمان کاتدا مەرامە راستەقینەکەی جێبەجێ بکات، ئەویش پێکهێنانی ئیمپراتۆریەتێك بوو، کە خۆی لەسەری هاوکێشەکەدا بێت، ئەویش لەکاتێکدا دەچێتە بواری جێبەجێکردن کە خودی نادرشا خاوەن ئابوورییەکی بەهێز و سوپایەکی گەورە و ئامادەکراو بێت، لەو ڕێگەیەوە سوڵتان و کاربەدەستانی عوسمانی ملکەچ بکات بۆ ئیرادە و مەبەستەکانی خۆی.

لەلایەکی دیکەوە نادرشا لە گەڕانەوەکەیدا بەئاراستەی کابول تووشی چەرمەسەری زۆر بۆوە، چونکە هەر لەناوچەی تانیسیر(TANISEER) پاشکۆی هێزەکەی لەلایەن جووتیارانی ناوچەکە ڕووبەڕووی ڕاوە ڕووت و تاڵان بۆوە[٦٤٣]، هەروەها بەگەیشتنی بەڕووباری بنجاب بڕیاری چێکردنی پردێکی دا ، بەڵام بەهۆی قورسایی و زۆری ژمارەی سەربازانی ئێرانی پردەکە دووچاری دارمان هات، کە بەهۆیەوە نێزیکەی دوو هەزار سەرباز بوونە قوربانی[٦٤٤]، هەرچەندە میرزا مەهدی خان ئەستەرئابادی هۆکاری دارمانی پردەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ بەرزبوونەوەی ئاستی ئاوی ڕووباری بنجاب بەهۆی ئەو باران بارینە زۆرەی کە ناوچەکەی داگرتبۆوە[٦٤٥].

نادرشا دوای ئەم ڕووداوە دووبارە لە ڕێگەی ئەو کەشتییانەی کە نێزیك شوێنەکە بوون، توانی پردێك چێ بکات و کرداری پەڕینەوەی سوپاکەی پێ ئەنجام بدات، کە نێزیکەی چل ڕۆژی خایاند تاکو تەواوی سوپای ئێران پەڕینەوە، هەروەها سەرەڕای خراپی کەشوهەواش نادرشا توانی خۆی بگەیەنێتە حەسەن ئاباد، لەوێشەوە ڕوویکردە ڕۆژئاوا بەئاراستەی ڕووباری سند، هەرچەندە لە ڕێگەدا تووشی پەلاماردان بۆوە لەلایەن هۆزی یوسف زای، بەڵام نادرشا لە ڕێگەی دانوستاندن توانی باوەڕیان پێ بێنێت و رایانکێشێت بۆ ناو سوپاکەی، پاشان ڕوویکردە پیشاوەر،لەوێشەوە ڕێگەی گرتەبەر بەئاراستەی کابول پاش بڕینی گەرووی خەیبەر [٦٤٦].

---

(643) Jonas Hanway,Op.Cit,P.199.

(٦٤٤) **لکهارت، نادرشا،ص٢٠٠.**

(٦٤٥) میرزا مهدی خان استرابادی، دره نادره...، ص٧٤٧.

(٦٤٦) **لکهارت، نادرشا، ص٢٠٢.**

لەکاتی گەڕانەوەی نادرشا بۆ کابول، پێی ڕاگەیاندرا کەوا فەرمانڕەوای سند ئامادە نییە قبوولّی شکۆ و دەسەلاّتی ئێران لەسەر ناوچەکەیدا بکات و ببێتە بەشێك لە قەڵەمڕەوی دەوڵەتی ئێران[٦٤٧]، هەرچەندە بەگوێرەی پەیماننامەی شالیمار کە لەنێوان نادرشا و ئیمپراتۆری هیندستان گرێدرابوو، ناوچەی سند ببووە بەشێك لەدەسەلاّتی ئێران، بۆ ئەم مەبەستە نادرشا هەر لەدەهلیەوە نوێنەری تایبەتی خۆی بەناوی محەمەد عەلی بەگ سوڵتان بەیاوەری نوێنەری فەرمانڕەوای سند لە دەهلی بەناوی میر لوتف ئەلاّ ناسراو بەمیر متارۆ ناردە لای خدایارخانی فەرمانڕەوای سند بەمەبەستی ئاگەدارکردنەوەی[٦٤٨].

دوا بەدوای گەیشتنی نێردراوی ئێران بۆ سند، نامەکەی نادرشای خستە بەردەم خدایارخانی فەرمانڕەوای ناوچەکە، سەبارەت بەناوەڕۆکی نامەکە نادرشا داوای لە فەرمانڕەوای سند کردبوو وەفاداری خۆی بۆ دەسەلاّتی ئێران دووپات بکاتەوە، هەروەها لە بەرامبەر نیشاندانی وەفادارییەکەشی لەلایەن نادرشا دڵنیا کرابوویەوە کە لە شوێن و پێگەی خۆی دەمێنێتەوە، بەلاّم خدایارخان پاش ڕاوێژکردنی لەگەڵ کاربەدەستانی ناوچەکە، ئەم داواییەی نادرشای ڕەتکردەوە [٦٤٩].

جێگەی ئاماژە پێکردنە ڕەتکردنەوەی داواکارییەکەی نادرشا لەلایەن خدایارخان، بەهانەیەکی باش بوو بۆ (شا)ی ئێران کە هێرش بکاتە سەر سند، بۆ ئەوەی بەتەواوی دڵنیا ببێتەوە لە دەسەلاّت و شکۆی ئێران لەسەر ئەو ناوچەیە کە بەگوێرەی پەیماننامەی شالیمار درابوو بە ئێران، بۆ ئەم مەبەستە نادرشا لە **٢٧**ی تشرینی دووەمی ساڵی **١٧٣٩**ز لەشاری کابول ڕوویکردە سند[٦٥٠].

نادرشا بەر لە لەشکرکێشییەکەی بۆ سند، داوای لەزەکەریا خانی فەرمانڕەوای لاهوور کرد بۆ ئەوەی باوەڕ بهێنێت بە خدایارخان بەمەبەستی ڕاگەیاندنی گوێڕایەلی بۆ نادرشا،

---

(٦٤٧) عباس اقبال اشتیانی، باقر عاقلی، منبع پیشین، ص٦٢٦.

(٦٤٨) **ریاض** الاسلام، نادر شاه در سند،مترجم: علی محمد **طرفداری**، مجله بررسیهای نوین تاریخی، شماره( ٤،٥)،مرکز تحقیقات هنر، معماری و شهرسازی **نظر**، تهران،پایزو زمستان ١٣٨٧ه.ش،ص٣٧.

(٦٤٩) همان منبع،ص٣٧.

(٦٥٠) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص٣٣٩. سەبارەت بەهەنگاوەکانی لەشکرکێشی نادرشا بۆ سند بگەڕێوە بۆ پاشکۆی ژمارە ( ٩).

بەڵام هەوڵەکانی فەرمانڕەوای لاهوور بێ ئاکام بوو، چونکە لەلایەن فەرمانڕەوای سند دووبارە داواکارییەکە ڕەتکرایەوە[٦٥١] پاشان نادرشا لە (١٥)ی کانوونی دووەمی ساڵی١٧٤٠ز گەیشتە ناوچەی غازی خان[٦٥٢]، بەبێ ڕوودانی جەنگ توانی دەستی بەسەردا بگرێت، چونکە فەرمانڕەوای ناوچەکە وەفاداری خۆی بۆ نادرشا دووپاتکردەوە، بۆیە لەلایەن (شا)ی ئێران وەك فەرمانڕەوای ناوچەکە دەست نیشانکرایەوە[٦٥٣].

سوپای ئێران لە دوای ناوچەی (دیرەی قازی) لە پێشڕەوییەکانی بەردەوام بوو، لەشوباتی هەمان ساڵ گەیشتە لارکانای پایتەختی سند، بەڵام فەرمانڕەوای سند بۆئەوەی خۆی دوور بگرێت لە سوپای ئێران ڕوویکردە بیابانەکانی(عومەرکوت)، چونکە گەیشتە ئەو بڕوایەی جۆرە ناهاوسەنگییەك لەنێوان هەردوو هێزدا هەیە، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی هەواڵی راکردنی خدایارخان بۆ عومەرکوت نادرشا بەشێکی سوپاکەی بە**سەرکردایەتیی** نەسروڵا میرزا لە لارکانا جێهێشت و خۆشی بەیاوەری بەشێك لە سوپاکەی ڕوویکردە عومەرکوت[٦٥٤].

بەر لە گەیشتنی نادرشا بەعومەرکوت، لە ڕێگەدا دوو بەرەنگاربوونەوەی توند ڕوویدا لەگەڵ هەردوو هۆزی مەچهی و مەهدی لایەنگرانی خدایارخان، سەرەڕای پیادەکردنی سیاسەتی زەوی سووتاندن لەلایەن خدایارخان، نارەحەتییەکی زۆری بۆ نادرشا و هێزەکەی چێ کرد، بەڵام دواتر نادرشا توانی بەسەر باردۆخە ناهەموارەکە زاڵ بێت و شکست بدات بەهێزە لایەنگرەکەی خدایارخان[٦٥٥].

دوا بەدوای سەرکەوتنەکانی سوپای ئێران، خدایارخان هەڵسا بەئامادەکاری پێویست بۆ خۆی وخانەوادەکەی بەمەبەستی خۆدەربازکردن لە عومەرکوت[٦٥٦]بەرەو راجچوتانا یاخود گوجرات[٦٥٧]، بەڵام نادرشا دوای ئاگەداربوونەوەی لە پلانەکەی

---

(651) Jonas Hanway,Op.Cit,P.203.

(٦٥٢) **رضا** زاده **شفق، المصدر السابق، ص١٢٠.**

(٦٥٣) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص ص٣٤٠-٣٤١.

(٦٥٤) **ریاض** الاسلام، نادر شاه در سند، ص٣٨.

(٦٥٥) همان منبع،ص٣٩.

(٦٥٦) لکهارت،نادرشا،ص٢٠٥.

(٦٥٧) **ریاض** الاسلام، نادر شاه در سند، ص٣٩.

خدایارخان زۆر بەخێرایی و بێ ئاگەداری بەر لە جێبەجێکردنی پلانەکە خۆی گەیاندە عومەرکوت، بۆیە فەرمانڕەوای سند، جگە لە خۆبەدەستەوەدان هیچ هەڵبژاردنێکی دیکەی لەبەردەم نەما[٦٥٨].

فەرمانڕەوای سند گرێنتی پارێزراوی ژیانی خۆی و خانەوادەکەی وەك مەرجی خۆبەدەستەوەدان خستە بەردەم نادرشا، ئەم مەرجەی خدایارخان لەلایەن نادرشا پەسند کرا، چونکە سوپای ئێران بەدەست کەمی ئاو و خۆراك دەیانناڵاند، بۆیە پاش ڕازیبوونی نادرشا لەسەر داواکارییەکە خدایارخان و خانەوادەکەی خۆیان رادەستی سوپای ئێران کرد، پاشان نادرشا لەگەڵ خۆیدا گەڕاندنییەوە بۆ لارکانای پایتەخت[٦٥٩].

دوای ئەم ڕووداوە نادرشا توانی دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێت بەسەر سند، بەشێوەیەك ئەو ناوچەیەی دابەشکردە سەر سێ بەش، ناوچەی (تاتا) و دەوروبەری خستە ژێر دەسەڵاتی خدایارخان، کە سێ بەشی ناوچەکەی دەگرتەوە، هەروەها بەشێکی زەوییەکانی خستە ژێر دەسەڵاتی موحەبەت خانی فەرمانڕەوای بلوجستان، هەرچی ناوچەی (شکارپوور) و هەندیك لە ناوچەکانی دەوروبەری بوو خرایە ژێر دەسەڵاتی فەرماندەکانی (داودپوترا) وەك پاداشت لەبری کۆمەکی و یارمەتییەکانیان بۆ سوپای ئێران لە کاتی ئەنجامدانی هەڵمەتەکانیان بۆ سەر فەرمانڕەوای سند[٦٦٠].

نادرشا لە نیسانی ١٧٤٠ز لە لارکانا بە یاوەری هەردوو کوڕەکەی خدایارخان بەناوی (محەمەد موراد بابا خان و غولام شا) گەڕایەوە نادرئاباد، پتر ئەو هەنگاوەشی دەگەڕێتەوە بۆ ڕێگەگرتن لە هەر کارێکی نەخوازراوی خدایارخان، کە لە داهاتوودا بیەوێت ئەنجامی بدات لە دژی دەسەڵاتی نادرشا، هەروەها لەو لەشکرکێشییەدا نادرشا توانی زۆرینەی ئەو کەل وپەلانەی کەپێوەست بوون بەدەوڵەتی سەفەوی کەلەسەردەمی داگیرکاری ئەفغانەکان تاڵان کرابوون و لەو ناوچانە بە نرخی هەرزان فرۆشرابوون بیانگەڕێنێتەوە لەگەڵ هێنانی چەندین پەڕتووکی زانستی[٦٦١].

---

(٦٥٨) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا...، ص٣٤٢.

(٦٥٩) لکهارت،نادرشا،ص٢٠٥.

(٦٦٠) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشا... ص٣٤٣-٣٤٤ " **رضا** زاده **شفق، المصدر السابق،ص١٢٠.**

(٦٦١) **ریاض** الاسلام، نادر شاه در سند، ص٤١.

## تەوەری چوارەم:

## لەشکرکێشییەکانی بۆ ناوچەکانی ئاسیای ناوەڕاست

نادرشا دوای گەیشتنەوەی بە نادرئاباد (قەندەهاری نویٚ)، داوای لە فەرمانڕەوا و کەسایەتییە دیارەکانی ئێران کرد بەزووترین کات ڕوو بکەنە شاری هرات، مەبەستی نادرشا لەو بانگهێشتکردنە زیاتر بۆ نیشاندانی هەموو ئەو دەستکەوتانە بوو کە لە ئەنجامی لەشکرکێشییەکانی بەدەستی هێنابوو، لە سەرووی هەموویانەوە تەختی **تاوس**[٦٦٢].هەروەها دوای مانەوەی ١٥ ڕۆژ لە هرات [٦٦٣]، نادرشا ئامادەکارییەکانی ڕێکخست بۆ هێرشکردنە سەر بوخارا و خوارزم، بۆ ئەم مەبەستەش داوای لە فەرمانڕەوای بەلخ[٦٦٤] کرد ئازووقە ئامادە بکات بۆ سوپای ئێران[٦٦٥]، لەهەمان کاتدا ژمارەیەك لەو دارتاشانەی، کە لە هیندستانەوە لەگەڵ خۆیدا هێنابووی ناردە ئەو ناوچەیە بەمەبەستی دروستکردنی چەند کەشتییەك[٦٦٦].

---

(٦٦٢) لکهارت،نادرشا،ص ص٢٣٧-٢٣٨.

(٦٦٣) همان،ص٢٣٨.

(٦٦٤) لەکاتی لەشکرکێشییەکەی نادرشا بەئاراستەی قەندەهار، داوای لە رەزا قوولی کرد هێرش بکاتە سەر بەلخ، لە ئاکامی بەرەنگاربوونەوەی سوپای ئێران بەسەرکردایەتیی رەزا قوولی لەگەڵ سوپای بەلخ توانیان شکست بدەن بەفەرمانڕەوای بەلخ و ناچاری بکەن گوێڕایەڵی دەسەڵاتی ئێران بێت، بەمەش هەموو ناوچەکانی بەلخ لەقەندوز و بغلان و بدخشان بکەوێتە ژێر قەڵەمڕەوی سوپای ئێران. بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: میرزا مهدی خان استرابادی، درە نادرە...، ص ص٧٤٢-٧٤٣.

)665( P. SYKES, Op. Cit,P.357.

(٦٦٦) سەبارەت بەدارتاشە هیندییەکان لە ناوچەی بەلخ توانیان ١١٠٠ کەشتی دروست بکەن. **رضا** شعبانی، تاریخ اجتماعی ..، جلد اول، ص٧٨.

لەو بارودۆخەدا نادرشا لە هرات بانگهێشتی رەزا قوولی کرد، کە ئەو کات لە مەشهەد بوو، بەمەبەستی بەشداریکردن لە هەڵمەتەکەی بۆ سەر بوخارا، چونکە ناوبراو شارەزایی تەواوی لەسەر ناوچەکە هەبوو بەهۆی ئەو لەشکرکێشییەی کە ئەنجامی دابوو، لەکاتی سەرقاڵبوونی نادرشا بە لەشکرکێشییەکەی بەرەو خاکی هیندستان[٦٦٧] .

بەهانەی نادرشا بۆ ئەنجامدانی لەشکرکێشییەکەی بۆ سەر بوخارا بەتایبەتی و ئاسیای ناوەڕاست بەگشتیی زیاتر بۆ دانانی سنوورێك بوو بۆ ئەو زێدەڕۆیانەی کە فەرمانڕەوایانی بوخارا و خوارزم لەکاتی سەرقاڵبوونی نادرشا لە هیندستان ئەنجامیان دابوو[٦٦٨]، لەو بارەیەوە عەبدولحوسێن زرین کوپ جەخت لەوە دەکاتەوە نادرشا ویستویەتی لە رێگەی ئەو لەشکرکێشییەدا ئەو شەرمەزارییە بسڕێتەوە، کە کاتی خۆی ئوزبەکەکان لە رێگەی هێرشەکانیان بۆ سەر ئێران ئەنجامیانداوە، هەروەها ببێتە وەڵامدانەوەیەکیش بۆیان[٦٦٩] .

سەرەڕای ئەو هۆکارانەی سەرەوە چەندین هۆکاری دیکە هەبوون کە بوونەتە پاڵنەر بۆ ئەنجامدانی لەشکرکێشیی بۆ ئاسیای ناوەڕاست لەوانە پێوەندیی راستەوخۆی هەیە بەخودی کەسایەتی نادرشا، بەتایبەت لە ڕووی ئارەزووە فرەوانخوازییەکانییەوە، بۆ ئەم مەبەستە لە وتەیەکیدا بەڕاشکاوانە دەڵێت (ئەو کاتە پشوو دەدەم کە دوژمنەکانم لەناو خاکەکەی خۆشیان پاشەکشە پێ بکەم)[٦٧٠] .

لە لایەکی دیکەوە هۆکاری ئابووری و سەربازی بەدەر نین لە هاندانی نادرشا بۆ ئەنجامدانی هەڵمەتە فرەوانخوازییەکانی لە ئاسیای ناوەڕاست، چونکە نادرشا لە رێگەی داگیرکردنی ئەو ناوچانە و خستنییە ژێر ڕکێفی خۆی توانی باجی ساڵانەیان بەسەردا بسەپێنێت و ئازووقە و کۆمەکی سەربازیان بخاتە ئەستۆ[٦٧١]، جگە لەمەش لە ڕووی سەربازییەوە گرینگی زۆری بۆ نادرشا هەبووە،

---

(٦٦٧) محمد حسين ميمندى نژاد،منبع پيشين، ص٦٢٦.

(٦٦٨) عبدالله رازى، منبع پيشين، ص٤٤٣ .

(٦٦٩) عبدالحسين زرين كوب، منبع پيشين، ص ٧٥٠.

(٦٧٠) حسين حسينى پتاه، ناگفته هاى تاريخ ايران — سخنان نادرشاه افشار، موجود در وب سايت ( متاح على الموقع الالكترونى)

http://irantarikh.blogfa.com/post-13.aspx

بازديد كننده (تمت زيارة الموقع في) ٨:٣٠ في ٢٠١٢/٩/١٠

(٦٧١) لكهارت،نادرشا،ص ص٢٤١-٢٤٢.

چونکە بەدەستگرتنی بەسەر ئەو ناوچانە توانی بەشێك لە گەنجانی بوخارا و خوارزم بخاتە ناو ڕیزەکانی سوپاکەی بەمەش نادرشا توانی تا ڕادەیەك توانا سەربازییەکانی بەهێز و گەورە بکات کە چەندین پێکهاتەی جیاوازی لەخۆ دەگرت[٦٧٢].

نادرشا دوای ڕێکخستن و ئامادەکارییەکانی لەشکرکێشی لە٣ی ئابی١٧٤٠ز لە هرات بەیاوەری٥٠ هەزار سەرباز ڕوویکردە بەلخ[٦٧٣]، لە ڕێگەی شاخەکانی باغدیس[٦٧٤]، لە ١٥ی ئاب هەمان ساڵ گەیشتە شوێنی دیارکراو، پاشان ڕوویکردە ڕووباری ئامودariya[٦٧٥] بەمەبەستی چاوەدێری و ئاگەداربوونی لە چۆنییەتی بەڕێوەچونی کارەکانی چێکردنی کردنی کەشتییەکانی ئێران لەلایەن دارتاشە هیندییەکانەوە[٦٧٦]، هەر لەوێش داوای لە بەشێکی سوپاکەی کرد بە**سەرکردایەتیی** عەلی مەکی بیگ بۆ ئەوەی لە ڕووباری جیحۆن بپەڕنەوە بەمەبەستی پارێزگاریکردن لە هێرشەکانی ئوزبەك، پاشان نادرشا لەگەڵ ئەو هێزەی کە مابوونەوە لە ١٦ی ئەیلول ڕووبارەکەیان بڕی و ڕێگەیان گرتەبەر بە ئاراستەی بوخارا[٦٧٧]، بەتایبەت دوای ئەوەی لە ناوچەی چارجوی توانرا پردێك لە کەشتی چێ بکرێت بۆ پەڕینەوەی سوپای ئێران[٦٧٨].

لەلایەکی دیکەوە هەواڵی پەڕینەوەی نادرشا و سوپاکەی لە ڕووباری ئامودariya، ئەبولفەیزی تووشی دڵەڕاوکێ کرد، بۆیە پێش ڕووداوەکان کەوت سەرەتا هەڵسا بەناردنی محەمەد ڕەحیم حەکیم ئەتالیق بۆ پێشوازیکردن لە نادرشا، هەرچەندە ئەم کارەی فەرمانڕەوای بوخارا بووە هۆکاریك بۆ لەیەك نێزیکبوونەوەی هەردوولا، چونکە نادرشا بە دڵێکی فرەوان ئەم پێشوازیەی قبووڵ کرد، هەروەها بەڕاشکاوانە بە ئەتالیقی ڕاگەیاند کە پێویست بوو فەرمانڕەوای بوخارا خۆی ئامادە ببوایە لە پێشوازی کردنەکەیدا[٦٧٩].

---

(٦٧٢) عباس پرویز،منبع پیشین،ص١٢١.

(673) Jonas Hanway,Op.Cit,P.205.

سەبارەت بەهەنگاوەکانی لەشکرکێشیی نادرشا بۆ ئاسیای ناوەڕاست بگەڕێوە بۆ پاشکۆی ژمارە ( ٩).

(٦٧٤) عباس پرویز،منبع پیشین،ص١٢١.

(٦٧٥) مەبەست لێی ڕووباری جیحۆنە

(٦٧٦) لکهارت،نادرشا،ص٣٣٩.

(٦٧٧) محمد حسین میمندی نژاد،منبع پیشین، ص٦٢٦.

(٦٧٨) **رضا** شعبانی، تاریخ اجتماعی ..،جلد اول، ص٧٨.

(٦٧٩) لکهارت،نادرشا،ص٣٣٩.

هەرچەندە فەرمانڕەوای بوخارا ئامادەیی نیشاندا بۆ داواکارییەکەی نادرشا، بەڵام ناڕەزایی هۆزەکانی میانکال و ئاق بالو و خنجد و ئەندیجان و لنکرات، بەهۆی دڵ گەرمی و پەنگ خواردنەوەی تووڕەییان بەرانبەر بەسوپای ئێران، بەهۆی لەدەستدانی رۆڵەکانیان لە کاتی لەشکرکێشیی رەزا قوولی بۆ سەر ناوچەکەیان لەکاتی هێرشکردنی نادرشا بۆ قەندەهار، ناڕەزایی هۆزەکانیش بووە هۆکاریك کە فەرمانڕەوای بوخارا لە بەڵێنەکەی پاشگەز ببێتەوە و بڕیاری بەرگرییکردن بدات[٦٨٠].

لە ئەنجامی پاشگەزبوونەوەی ئەبولفەیزخان لە بەڵێنەکانی و پاڵپشتی کردن لە بۆچوونی هۆزەکان، لە تشرینی یەکەمی ساڵی١٧٤٠ز لەدەرەوەی شاری بوخارا لە ناوچەی چاربکر لە کەناراوەکانی ڕووباری زرافشان ڕووبەڕووبوونەوە لەنێوان هەردوو هێز ئەنجامدرا کە ئاکامەکەی بەسەرکەوتنی سوپای ئێران کۆتایی پێهات و ئەبولفەیزخان ناچارکرا پاشەکشە بکات بەرەو شاری بوخارا[٦٨١]، دوای ئەم ڕووداوە فەرمانڕەوای بوخارا دووبارە داوای لە ئەتالیق کرد، ڕووبکاتەوە بارەگەی سەرەکیی سوپای ئێران لە کاراکول بۆ ئەوەی ملکەچبوونی فەرمانڕەوای بوخارا بە نادرشا رابگەیەنێت، لەو هەوڵەشدا ئەتالیق توانی باوەڕ بەنادرشا بهێنێت و ڕازی بکات لەسەر داواکارییەکەی فەرمانڕەوای بوخارا[٦٨٢].

دوای ڕازیبوونی نادرشا لەسەر داواکارییەکە، ئەبولفەیزخان بەیاوەری چەند کەسایەتییەکی دیاری شاری بوخارا لە١١ی ئەیلوولی ١٧٤٠ز ڕوویانکردە سەربازگەی سەرەکیی سوپای ئێران و ملکەچبوونی خۆیان لە بەرامبەر نادرشا ڕاگەیاند[٦٨٣]، بەمەش ناوچەکانی ئەوبەر ڕووبار لە ڕۆژهەلات تاکو باکووری ڕۆژهەڵاتی بوخارا و سەمەرقەند کەوتە ژێر شکۆ و دەسەڵاتی نادرشا[٦٨٤]، پاشان ئەبولفەیزخان دووبارە وەك فەرمانڕەوای بوخارا لەلایەن نادرشا دەستنیشان کرایەوە[٦٨٥]، لەگەڵ وەرگرتنی نازناوی شا، لە بەرامبەر ئەم کارەی (شا)ی ئێران فەرمانڕەوای بوخارا لەلایەن خۆیەوە ئامادەیی

---

(٦٨٠) همان،ص٣٤٠.

(٦٨١) م.ر. ارنوا- ك.ز.اشرافيان، منبع پيشين،ص٢٥٣.

(٦٨٢) لكهارت،نادرشا،ص٣٤١.

(٦٨٣) ميرزا مهدى خان استرابادى، دره نادره...، ص٧٤٩.

(٦٨٤) لكهارت،نادرشا،ص٣٤١.

(٦٨٥) عباس پرويز،منبع پيشين،ص١٢١.

نیشاندا ئازووقەی سوپای ئێران ئامادە بکات[٦٨٦].هەرچەندە (ئەرنوا و ئەشرافییان) پێیان وایە بەشێوەیەکی کرداری دەسەڵات لە دەست ئەبولفەیز دانەبووە، بگرە دەسەڵاتەکان زیاتر درایە دەست ئەتالیق کەناسرابوو بە ئەمیر کەبیر[٦٨٧].

لەلایەکی دیکەوە نێزیکەی١٠هەزار گەنجی بوخارا پێوەندییان کرد بەسوپای ئێران لەژێر **سەرکردایەتیی** کوڕەکەی ئەتالیق[٦٨٨]، سەرەڕای ئەوەش نادرشا بۆ ئەوەی جۆرە نێزیکبوونەوەیەك چێ بکات لەگەڵ فەرمانڕەوای بوخارا، هەڵسا بەمارەکردنی دوو کچی ئەبولفەیزخان، یەکێکیان بۆ خۆی و ئەویدیکەیان بۆ شاهرخی نەوەی، پاش ئەوەی ڕەزا قوولی ڕەزامەندی نیشان نەدا لەسەر قبوولکردنی هێنانی کچە گەورەکەی فەرمانڕەوای بوخارا، بۆیە نادرشا بەناچاری بۆ خۆی مارەی کرد[٦٨٩].

نادرشا دوای سەپاندنی دەسەڵاتی بەسەر هەر یەکە لە بەلخ و سند و بوخارا،تەنیا شوێن کە لە دەرەوەی دەسەڵاتی مابوویەوە، بریتی بوو لە خوارزم، کە لەژێر فەرمانڕەوای ئیلبارس خان دابوو، ناوبراو لە کاتی لەشکرکێشییەکەی نادرشا بۆ قەندەهار و هیندستان چەند جارێك هێرشی کردبووە سەر خۆراسان[٦٩٠].

دوا بەدوای ڕێکخستنی کاروباری بوخارا، نادرشا لەسەر پێشنیازی ئەبولفەیزخان، سێ کەسی وەك نێردەی تایبەتی خۆی نارده لای فەرمانڕەوای خوارزم، بەمەبەستی خۆبەدەستەوەدان و ڕاگەیاندنی گوێڕایەڵی[٦٩١]، بەڵام پێشنیازەکەی ئەبولفەیزخان

---

(٦٨٦) لکهارت،نادرشا،ص ص٢٤١-٢٤٢.

(٦٨٧) م.ر. ارنوا- ك.ز.اشرافیان، منبع پیشین،ص٢٥٤.

(٦٨٨) **رضا** شعبانی، تاریخ اجتماعی ...،جلد اول، ص٧٨. سەبارەت بە پێوەندیکردنی گەنجانی بوخارا بەسوپای ئێران لەنێوان مێژوونووسان ڕاڤەی جیاوازی بۆ دەکرێت، عەباس پەرویز جەخت لە٢٠ هەزار سەرباز دەکاتەوە، هەروەها هەر یەکە لەلوکهارت ئاماژە بە٣٠هەزار سەرباز و سایکس ٨٠ هەزار سەرباز دەکەن. عباس پرویز،منبع پیشین،ص١٢١ " لکهارت،نادرشا، ص٢٤١ "

P. SYKES, Op. Cit,P.357.

(٦٨٩) عباس اقبال اشتیانی، باقر عاقلی، منبع پیشین، ص٦٢٦"

P. SYKES, Op. Cit,P.357.

(٦٩٠) عباس پرویز،منبع پیشین،ص١٢١.

(٦٩١) میرزا مهدی خان استرابادی، دره نادره...، ص٧٥٠.

لەلایەن فەرمانڕەوای خوارزم ڕەتکرایەوە، جگە لەمەش هەڵسا بەکوشتنی هەر سێ نێردراوەکەی نادرشا[٦٩٢]، بێگومان ئەم کارەی فەرمانڕەوای خوارزم، بووە هۆی پەستکردنی (شا)ی ئێران، بۆیە بەر لە بەڕێکەوتنی بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئیلبارس خان، فەرمانێکی دەرکرد تێیدا تەهماسب خان جەلایر وەك سەرکردەی گشتیی سوپای ئێران لە هیندستان دەست نیشانکرد، پاشان بەیاوەری هێزێکی گەورە ڕوویکردە خوارزم[٦٩٣].

نادرشا دوای ئەوەی لە بوخارا بەڕێکەوت، بەردەوام بوو تاکو گەیشتە دەوروبەری (چارجو) پاشان لەگەڵ دەستەیەکی سوپای ئیلبارس خان کە پێك دەهاتن لە ئۆزبەك و تورکمان بەرەنگاری یەکدیی بوونەوە،بەڵام دوای بەرگرییەکی کەم شکستیان خوارد و بەرەو کەنارەکانی ڕووباری ئامودریا پاشەکشەیان کرد[٦٩٤]، دوای ئەم ڕووداوە نادرشا بۆ بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لە شیرحاجی مایەوە، بەمەبەستی ڕێکخستنەوەی هێزەکەی، هەر لەو شوێنەشدا داوای لە رەزا قوولی کرد بگەڕێتەوە مەشهەد[٦٩٥].

لەلایەکی دیکەوە نادرشا دوای ڕێکخستنی سوپاکەی، لە ٣ تشرینی دووەم لە شیرحاجی گەیشتە گەردن شوتر(دەوبون)، لەوێش لە ڕووباری جیحون پەڕیەوە[٦٩٦]،لە نێزیك شاری فتناك بەرەنگاری هێزی خوارزم بۆوە، کە نێزیکەی ٦ هەزار جەنگاوەری خوارزمی بەسەرکردایەتیی ئلیبارس خان بەشدارییان تێداکرد، ئاکامەکەی بەسەرکەوتنی سوپای ئێران تەواو بوو، کە خودی نادرشا بەشداری کردەیی لەو جەنگەدا کرد[٦٩٧]، تێیدا فەرمانڕەوای خوارزم ناچارکرا پاشەکشە بکات بەرەو قەڵای هەزار ئەسپ[٦٩٨].

ئیلبارس خان دوای ئەوەی خۆی جێگیر کرد لە قەڵای هەزار ئەسپ، فەرمانیدا بەکردنەوەی چەند کەناڵێکی ڕووباری ئامویە بەمەبەستی دروستکردنی لافاو و ڕێگەگرتن لە پێشڕەوییەکانی نادرشا، ئەم هەنگاوەی فەرمانڕەوای خوارزم وای لە نادرشا

---

(٦٩٢) عباس پرویز،منبع پیشین،ص١٢١.

(٦٩٣) لکهارت،نادرشا،ص٢٤٣.

(٦٩٤) میرزا مهدی خان استرابادی، دره نادره...، ص٧٥٠.

(٦٩٥) لکهارت،نادرشا،ص٢٤٤.

(٦٩٦) محمد حسین قدوسی، منبع پیشین،ص١٩٣.

(٦٩٧) محمد شفیع تهرانی، تاریخ ...، ص٣٥٢.

(٦٩٨) میرزا مهدی خان استرابادی، دره نادره...، ص٧٥٠.

کرد بیر لەوە بکاتەوە، کە ئەنجامدانی گەمارۆدانی قەڵای هەزار ئەسپ تەنیا کات بەفیڕۆدانە، چونکە لەو هەلومەرجەدا بارودۆخ لەبار نابێت بۆ سوپای ئێران بەهۆی نێزیکبوونەوەی وەرزی زستان[٦٩٩]، بۆیە نادرشا بڕیاری گەمارۆدانی قەڵای هەزار ئەسپی هەڵوەشاندەوە و ڕوویکردە قەڵای خانەقا، کە دەکەوێتە دووری ٢٨ کم لە باکووری ڕۆژهەڵاتی خیوە، کە سامان و خانەوادەکەی فەرمانڕەوای خوارزمی تێدابوو، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئەم هەواڵە، ئیلبارس خان کەوتە دڵەڕاوکێ و بڕیاریدا لە قەڵای هەزار ئەسپ دەربچێت و ڕووبکاتەوە قەڵای خانەقا[٧٠٠].

دوای دەرچوونی ئیلبارس خان لە قەڵای هەزار ئەسپ، لە نێزیك قەڵای خانەقا بەرەنگاری سوپای ئێران بۆوە، کە تێیدا فەرمانڕەوای خوارزم تووشی شکست هات و بەناچاری ڕوویکردە ناو قەڵاکە، بەڵام بەهۆی سەختی تۆپبارانکردنی قەڵای خانەقا لەلایەن سوپای ئێران، تەنیا ماوەی سێ ڕۆژ توانی بەرگە بگرێت، پاشان لە تشرینی دووەمی ١٧٤٠ز خۆبەدەستەوەدانی ڕاگەیاند[٧٠١]، هەرچەندە لە سەرەتادا لەلایەن (شا)ی ئێران لە تاوانەکانی بەخشرا،بەڵام نارەزایی خانەوادەی سێ نێردراوەکە و داواکاریان بۆ وەرگرتنی خوێنی کوژراوەکانیان، بووە هۆی ئەوەی کە نادرشا لە بەڵێنەکەی پەشیمان ببێتەوە و فەرمانڕەوای خوارزم لە سێدارە بدات[٧٠٢]، لەگەڵ بیست کەس لە لایەنگرانی[٧٠٣].

نادرشا پاش لە سێدارەدانی ئیلبارس خان، ڕوویکردە خیوەی پایتەختی خوارزم کە ئەو کات کاروباری شارەکە لە دەست ئەبولخەیرخان دابوو، کە لەسەر ڕاسپاردەی ئیلبارس خان بەهێزێکەوە هاتبوو بۆ شاری خیوە، بۆیە هەرزوو ناوبراو لە دوای لە سێدارەدانی فەرمانڕەوای خوارزم لەخیوە نێردەیەکی تایبەتی کە بریتی بوو لە ئەندازیارێکی ڕووسی بەناوی (مراوین) ناردە لای نادرشا بۆ ڕاگەیاندنی ملکەچی[٧٠٤]،

---

(٦٩٩) لکهارت،نادرشا،ص٤٤٥.

(٧٠٠) محمد حسين قدوسى، منبع پيشين،ص١٩٤.

(٧٠١) عباس پرويز،منبع پيشين،ص ص١٢١-١٢٢.

(٧٠٢) لکهارت،نادرشا،ص٤٤٦.

(703) P. SYKES, Op. Cit,P.358.

(٧٠٤) لکهارت،نادرشا،ص٤٤٧.

بەڵام وەڵامی نادرشا بۆ نێردەکە بریێتی بوو لە هاتنی خودی ئەبولخەیرخان بۆ سەربازگەی سەرەکیی سوپای ئێران، دیارە داواکەی نادرشا لەلایەن ئەبولخەیرخان جێبەجێ نەکرا، بۆیە لە ترسی گیانی خۆی شاری خیوەی جێ هێشت و ڕوویکردە بیابانەکان[٧٠٥].

دوا بەدوای راکردنی ئەبولخەیرخان خەڵکی خیوە لەدەوری سەرکردەیەکی ئوزبەگی بەناوی عەبدولرحمان بیگ کۆبوونەوە، کە هانی دان بۆ جەنگ کردن دژ بە نادرشا، لەهەمان کاتدا دەرگەی شارەکەیان داخست و بڕیاری بەرگریی کردنیاندا، لەگەڵ کوشتنی چەند دیلێکی خۆراسانی لە ترسی ئەنجامدانی هەڵگەڕانەوە[٧٠٦]، پاش ئەم هەنگاوانە نادرشا گەمارۆی شارەکەیدا لە چوارلاوە، لەگەڵ دانانی ٢٨ تۆپی ئاگرین و ١٦ هاوەن لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری سەرباز[٧٠٧].

گەمارۆدانی شاری خیوە لەلایەن سوپای ئێران بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بەردەوام بوو، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ترس و دڵەڕاوکێ لەناو دانیشتوانی شارەکە، بۆیە لە ئەنجامدا بڕیاری خۆبەدەستەوەدانیان دا،چونکە گەیشتنە ئەو بڕوایەی بەرگرییکردن سوودی نابێت تەنیا وێرانکاری و خوێن ڕشتن نەبێت، بۆیە سوپای ئێران بەبێ ئەنجامدانی جەنگ چوونە ناو شاری خیوە[٧٠٨]، نادرشا لە یەکەمین هەنگاویدا لەناو شاری خیوە هەڵسا بەئازادکردنی نێزیکەی ١٢ هەزار دیلی خۆراسانی کە بەشێکیان چوونە ناو سوپای ئێران، هەروەها بڕیاریدا بەدروستکردنی شارێکی هاوشێوەی دەهلی لە نێزیك ئەبیوەرد و ناوی لێنرا خیوە ئاباد تایبەت بە خانەوادەی دیلە خۆراسانییەکان، لەگەڵ پێدانی ژمارەیەك لە دیلەکانی خیوە وەك کۆیلە و دیاری بۆیان[٧٠٩].

سەرەڕای ئەوەش تاهیر بەگ کە یەکێکە لە نەوەکانی جەنگیزخان وەك فەرمانڕەوای خوارزم دەستنیشانکرد[٧١٠]، هەرچەندە لە سەرەتادا لەلایەن هەندێك لە سەرۆك هۆزە ئۆزبەکییەکان دژ بەم بڕیارە یاخیبوونیان ڕاگەیاند، بەڵام نادرشا لە رێگەی هێز توانی ملکەچی

---

(٧٠٥) نورالله لارودی، منبع پیشین، ص١٨٨.

(706) Jonas Hanway,Op.Cit,P.206.

(٧٠٧) میرزا مهدی خان استرابادی، درە نادرە...، ص٧٥٠.

(٧٠٨) لکهارت،نادرشا،ص ص٤٤٧-٤٤٨ .

(٧٠٩) نورالله لارودی، منبع پیشین، ص١٨٩.

(٧١٠) **رضا** شعبانی، تاریخ اجتماعی ..،جلد اول، ص٧٩.

فەرمانڕەوای نوێیان بکات[711]، پاش ئەنجامدانی ئەو کارانە نادرشا لە٢٣ی کانوونی یەکەم ١٧٤٠ز لەخیوە ڕوویکردە شیرحاجی، لەوێشەوە ڕێگەی خۆراسانی گرتەبەر تا گەیشتە کەلات، پاش دوو هەفتە پشوودانی لەو ناوچەیە بەڕێکەوت بەرەو شاری مەشهەد[712].

دەکرێت بڵێین،گەڕانەوەی نادر بۆ مەشهەد وەك سەرکردە و (شا)یەکی ئەفسانەیی لەناو ئێران سەیر دەکرا،چونکە لە ماوەیەکی کەم توانی شکست بەپێنچ پادشا بهێنێت، هەروەها توانی شکۆ و سنووری ئێران بەرفرەوان بکات، سەرەڕای ئەوەش لەگەڵ بیستنی ناویشی لەو کاتەدا دوژمنانی تووشی دڵەڕاوکێی و ترس کردبوو.

هەروەها نادرشا لەرێگەی داگیرکردنی هیندستان و ئاسیای ناوەڕاست دەیویست لاسایی سەرکردە گەورەکانی وەك ئەسکەندەری مەکدۆنی و مەحمودی غەزنەوی و تەیمورلەنگ بکاتەوە [713]. لەو ڕێگەیەوە ناوی لە بیرەوریەکانی خەڵك و مێژوو تۆمار بکرێت بەوەی کە نادر شا لە ئاستی ئەو سەرکردە مێژوویانەدایە، هەر بۆ ئەم مەبەستە مێژوونووسە ڕۆژئاواییەکان نادرشا بە ناپلیۆنی ڕۆژهەڵات ناوزەد دەکەن، لەو بارەیە خودی ناپلیۆن لە نامەیەکدا بۆ فەتح عەلی شاە قاجار١٧٩٧ – ١٨٣٤جەخت لە کەسایەتیی نادرشا دەکاتەوە پێی رادەگەیەنێت کە ئێران دەبێت شانازی بەسەرکردەیەکی وەك نادرشا بکات کە توانی ئێرانی لێکترازاو رێك بخاتەوە، بەمەش نەوەستێت، بگرە زلهێزانی ناوچەکەش بخاتە مەترسییەوە[714].

---

(٧١١) لکهارت،نادرشا،ص٢٤٩.

(٧١٢) عباس پرویز،منبع پیشین،ص١٢٢.

(٧١٣) حسن کریم جاف، المصدر السابق، ص ٩٧.

(٧١٤) عرفان موسوی، جنگهای بزرگ – نامه ناپلئون به فتحعلی شاه، موجود در وب سایت ( متاح علی الموقع الالکترونی)

http://1939.blogfa.com/post-33.aspx

بازدید کننده (تمت زیارة الموقع في) ٨:٣٠ في ٢٠١٢/١٠/٢

# بەشی سێیەم

## پێوەندیی ئێران و عوسمانی

## لە سەردەمی فەرمانڕەوایی نادر شا ١٧٣٦ — ١٧٤٧

**تەوەری یەکەم:**

**ڕێککەوتننامەی ئاشتی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی ١٧٣٦**

**تەوەری دووەم:**

**هەڵمەتی سێیەمی نادرشا بۆ سەر عێراق ١٧٤٣ز**

**تەوەری سێیەم:**

**قووڵبوونەوەی کێشە ئاینزاییەکان و ڕێککەوتننامەی کرند ١٧٤٣ ـ ١٧٤٦**

## تەوەری یەکەم:
## ڕێککەوتننامەی ئاشتی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی ١٧٣٦

دەستپێکی ململانێی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی سەفەوی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شازدەیەم، بەتایبەت پاش دەرکەوتن و چێبوونی دەوڵەتی سەفەوی کە توانیان دوای نێزیکەی نۆسەد ساڵ دەسەڵاتێکی بەهێز لە ئێرانی ئاڵۆز و پەشۆکاوی ئەو کاتەدا دابمەزرێنن.

دەوڵەتی سەفەوی بەدرێژایی زیاتر لە دوو سەدە تێکۆشانی بەردەوام و هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر وێڕای سەقامگیرکردنی دەسەڵات و دابینکردنی ئارامی و تەناهی و یەکەتیی جوگرافیایی و چەسپاندنی بیروباوەڕێکی نوێی ئاینزایی (شیعەگەرایی دەمارگرژانە) تەنانەت هەندێ جاریش سنووری فەرمانڕەوایەتی خۆیان بەرفرەوانتر بکەن و هەوڵی ئەوە بدەن، کە فەرمانڕەوایەتییەکی بەهێز و بەرفرەوان و پڕ شکۆ و دابمەزرێنن.

لەلایەکی دیکەوە دەوڵەتێکی نوێ چێ بوو وەك دەوڵەتی سەفەوی توانی تەنگ هەڵچنێت بە زلهێزێکی سەردەم، کە خۆی دەنواند لە دەوڵەتی عوسمانی، کە فرەوانخوازییەکانی لەناو دڵی ئەوروپا بوو، بەڵام دەرکەوتنی ئەم دەوڵەتە زەنگێکی مەترسیداربوو بۆی، بۆیە گۆڕانکارییەك لە فرەوانخوازییەکانی دەوڵەتی عوسمانی هاتە ئاراوە، ئەویش دەست هەڵگرتن لە فرەوانخوازییەکانی ڕۆژئاوا و ڕووکردنە بەرەی ڕۆژهەڵات.

بەشێوەیەکی گشتی چێبوونی دوو بەرە لە جیهانی ئیسلامی (دەوڵەتی عوسمانی **سونە** ئاینزا و دەوڵەتی سەفەوی شیعە ئاینزا ) و پێوەندییەکانیان لەگەڵ جیهانی ڕۆژئاوا لە پێناو پارێزگاریکردن لە **بەرژەوەندییە**کانیان دژ بە یەکدیی هۆکار بوون بۆ سەرهەڵدانی جەنگ لەنێوان هەردوو دەوڵەت و کاریگەرییەکانی لەسەر پێوەندییەکانی هەردوولا.

هۆکاری سەرەکیی بەردەوام بوونی ململانێی عوسمانی و ئێرانی، کە زیاتر لە سێ سەدەی خایاند ئەوەبوو هەردوولا چاوی تەماعکاریان بڕیبووە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیان لەگەڵ چەندین هۆکاری دیکە کە لە پێشوودا باسمان کردووە، هەردەم لە هەل و دەرفەت دەگەڕان بۆ ئەوەی فرەوانخوازی لەسەر حیسابی ناوچەی دەسەڵاتی یەکتر بکەن.

شیاوی باسکردنە پەیماننامەی ئاماسیا کە لە ساڵی ١٥٥٥ز مۆرکرا، یەکەم پەیماننامە بوو کە لە نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی بەسترا،کە تێیدا هەردوو دەوڵەت دانیان بەدەسەڵاتی یەکدیی نا لەو ناوچانەی کە لەژێر دەستیان دابوو، بەڵام لە دوای مردنی شا تەهماسبی یەکەم ١٥٧٦ز بارودۆخێکی ناهەموار لە ئێراندا پەیدا بوو، ئەمە وای لە دەوڵەتی عوسمانی کرد هێرش بکاتە سەر ئەو وڵاتە و هەندێك ناوچەی داگیر بکات، کە زۆرینەیان ناوچەی کورد بوون، ئەم جەنگە بە پەیماننامەی ساڵی ١٥٩٠ (پەیماننامەی ئیستانبول) کۆتایی هات کە لە بەرژەوەندیی عوسمانییەکان بوو.

شا عەباسی یەکەم کەبەناچاری پەیماننامەی ساڵی ١٥٩٠ز مۆرکردبوو،بەڵام دواتر لەساڵی ١٦٠٢ز بڕیاریدا تۆڵە لەعوسمانییەکان بکاتەوە،لە ئەنجامدا جەنگێکی درێژخایەن لەنێوانیاندا دەستی پێکرد، کە لە گرینگترین ڕووداوەکانی ئەوە بوو لەشکری سەفەوی لە ساڵی ١٦٢٣ز بەغدا و هەندێك ناوچەی دیکەیان داگیر کرد، بەڵام عوسمانییەکان لە هەوڵەکانیان بەردەوام بوون تاکو لە ساڵی ١٦٣٨ز توانیان بەغدا و ئەو ناوچانە داگیر بکەنەوە.

ئەم جەنگە سەرەڕای چەند پەیماننامەیەکی کورتخایەن تا ساڵی ١٦٣٩ز بەردەوام بوو، بەڵام دواتر پەیماننامەی زەهاو (١٦٣٩ز) لە نێوان سوڵتان مورادی چوارەمی عوسمانی شا سەفی سەفەوی لەسەر خاکی کوردستان گرێدرا، بووە هۆکارێك بۆ چارەسەرکردنی کێشە و ناکۆکییەکانی هەردوو وڵات لەسەر ئەو ناوچانەی کە چەندین ساڵ جێگەی مشتومڕ و ناکۆکی بوو لەنێوانیاندا، هەروەها ئەو پەیماننامەیە ئارامی لە نێوان هەردوو دەوڵەت بەرقەرارکرد تاکو کۆتایی سەردەمی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی سەفەوی، بەڵام لە سەدەی هەژدەیەم جارێکی دیکە ململانێیەکانی عوسمانی ـ ئێرانی

دەستی پێکردەوە بەتایبەت لەگەڵ دەرکەوتنی نادرشا لەشانۆی ڕووداوەکانی ئێران، پێوەندییەکانی ئێران و عوسمانی پێی نایە قۆناخێکی دیکەی ململانێ و گۆڕانکاریی بەسەردا هات بەشێوەیەك بەردەوام پێوەندییەکان لە هەڵکشان و داکشان دابوون، بەواتایەکی دیکە پێوەندیی هەردوولا لەو قۆناخە مێژووییەدا پێوەست بووە لەسەر بالانسی هێز لە نێوان هەردوو دەوڵەت لەلایەك و خودی بیرکردنەوەکانی نادرشا و هەوڵە فرەوانخوازییەکانی لەلایەکی دیکەوە.

**تەوەری یەکەم: ڕێککەوتننامەی ئاشتی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی ١٧٣٦ز**

دوابەدوای ئەوەی سوڵتانی عوسمانی ڕەزامەندی تەواوی نیشان نەدا لەسەر ڕێککەوتننامەی بەغدا کە لەنێوان تەهماسب قوولی و والی بەغدا ئەحمەد پاشا گرێدرابوو وەك ئاماژەمان پێکرد، بۆیە جارێکی دیکە شەڕێکی مەترسیدار لەنێوان هەردوو وڵات ڕوویداوە، لە ١٨ی حوزەیرانی ١٧٣٥ز کە تێیدا سوپای عوسمانی تووشی شکست هات و سوپای ئێران توانی هەریەکە لە شارەکانی تەفلیس و یەریڤان و گەنجە بخاتەوە ژێر دەسەڵاتی[٧١٥].

سوڵتانی عوسمانی دوای ئەو ڕووداوە، ڕەزامەندیی تەواوی نیشاندا لەسەر ڕێککەوتننامەی بەغدا، بۆ ئەم مەبەستەش دەسەڵاتی تەواو درا بەوالی بەغدا بۆ دەستپێکردنەوەی گفتوگۆ[٧١٦]، لە سەرەتای ساڵی ١٧٣٦ دەوڵەتی عوسمانی گەنج عەلی پاشا فەرمانڕەوای گەنجەی بەمەبەستی دانوستاندن لەسەر گرێدانی ڕێککەوتننامەی ئاشتی ناردە ئێران[٧١٧].

نێردەی تایبەتی دەوڵەتی عوسمانی لەناو خاکی ئێران، لەلایەن عەبدولباقی زەنگەنە فەرمانڕەوای کرماشان بانگهێشت کرا بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی موغان، بەمەبەستی بەشداریکردنی لە مەراسیمی تاجگوزاریکردن بۆ نادرشا[٧١٨]، دوای تەواوبوونی مەراسیمەکە

---

(٧١٥) حسن مجید الجیلی، المصدر السابق، ص٨٠ " حسن کریم جاف، المصدر السابق، ص ٩٠.

(٧١٦) ستیڤن هیمسلی لونگریك، المصدر السابق، ص١٨١.

(٧١٧) بهرام افراسیابی، منبع پیشین، ص٣٥٣ "

J. Von Hammer, Osmanli Imparatorlugu Tarihi (Istanbul – Kumsaati Yayin Dagitim Ltd. – 2008) Cilt,III, S.392.

(٧١٨) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای..، ص٢٦٧.

نادرشا پێنچ داواکاری سەرەکیی دانا وەك سەرەتایەك بۆ ڕێككەوتننامەی ئاشتی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی [٧١٩]، بۆ ئەم مەبەستە دەسەڵاتی تەواوی بەخشییە عەبدولباقی زەنگەنە بۆ ئەنجامدانی دانوستاندن لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی [٧٢٠].

سەبارەت بەداواکارییەکانی نادرشا کە پێنچ داواکاری لەخۆدەگرت، بریتی بوون لە دانپێدانانی دەوڵەتی عوسمانی بەئاینزای جەعفەری، هەروەها لە کەعبەی پیرۆزدا، کە چوار لایە و هەر لایەکی هی یەکێ لە لقەکانی ئاینزای سونەیە، پێویستە بۆ ئەم ئاینزایەش لایەك هەبێت، لەلایەکی دیکەوە هەموو ساڵێك لەلایەن ئێرانەوە (میری حەج) [٧٢١] دیار بکرێت و لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی وەك میرەکانی حەجی میسر و شام بیانناسێ [٧٢٢]، لەگەڵ قەدەخەکردنی کڕین و فرۆشتنی دیلەکانی هەردوولا، هەروەها

(٧١٩) عباس اقبال اشتیانی، باقر عاقلی، منبع پیشین، ص٦٢٢.

(٧٢٠) **علاء** موسى **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص١٨٢.

(٧٢١) کاروانی حاجیان لەناو دەوڵەتی عوسمانی گرینگی و بایەخی تایبەتی هەیە، بەئەرکێکی ئاینی گەورە لەلایەن دەسەڵاتدارانی عوسمانی سەودایی لەگەڵ کراوە، بۆ ئەم مەبەستە لەناو دەوڵەتی عوسمانی ساڵانە چوار کاروانی حاجیان بەرەو مەکە بەڕێدەکران، هەر کاروانێك میرێکی تایبەتی بەخۆیەوە هەبووە، کە زۆرجار ئەو میرە ئەرکی سەرکردایەتیی ئەو سوپایەشی لە ئەستۆ بوو، کە بۆ پاسەوانی کاروانەکان لەلایەن دەسەڵاتدارانی عوسمانی ئامادە دەکرا، گرینگترین کاروانەکانی حەج بریتی بوون لە کاروانی حەجی شامی کە حاجیانی وڵاتی شام و جەزیرە و ئازەربیجان و قەفقاز و قەرم و ئەنادۆل و بەلقان و حاجیانی ئیستانبۆلی لەخۆ دەگرت، خودی سوڵتانی عوسمانی چاوەدێری ئامادەکارییەکانی ئەو کاروانەی دەکرد، هەروەها میری حەجی ئەو کاروانەش بریتی بوو لە والی سوریا، هەرچی کاروانی حەجی میسر بوو حاجیانی میسر و باکوری ئەفریقای لەخۆ دەگرت، ئەم کاروانەش لە قاهیرە بەڕێدەکەوت، سەبارەت بەکاروانی حەجی عێراق، حاجیانی عێراق و فارسی لەخۆدەگرت، هەروەها کاروانی حەجی یەمەنی، حاجیانی یەمەن و هیندستان و مالیزی و ئەندەنووسی و حەبەشە و سۆماڵی دەگرتەوە، هەر کاروانێکیش میرێکی تایبەت بەخۆی هەبووە، لەگەڵ ئەوەش دەوڵەتی عوسمانی ئەرکی پارێزگاریکردن لە ڕێگەکانی حەجی لە ئەستۆدابوو، کە چەندین ڕێگەی جیاواز بوو لەوانە ڕێگەی شام، میسر، عەدەن، عومان، حسا، بەسرە و ڕێگەی بەغدا. بۆ زانیاریی پتر لەبارەی کاروانەکانی حەج و میری حەج لە دەوڵەتی عوسمانی بگەڕێوە بۆ: **الصفصافی احمد القطوری، قوافل الحج فی العصر العثمانی، مجلة علمية ثقافية فصلية(حراء)، العدد(٢)، السنة الاولى، القاهرة، مارس ٢٠٠٦م، ص ص ٣٤-٣٩.**

(٧٢٢) شوکرەڵا بابان، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٣.

دانان و دیارکردنی باڵیۆزی هەردوو وڵات لە پایتەختەکانیان [٧٢٣]، داواکارییەکانی نادرشا لە ڕێگەی شاندێك بەسەرکردایەتیی عەبدولباقی خان زەنگەنە بەیاوەری هەریەکە لەمیرزا ئەبولقاسم کاشانی سەدر ئەلمەمالیك و مەلاباشی عەلی ئەکبەر گەورە مەرجەعی شیعە لە ئێران گەیاندرانە ئیستانبول [٧٢٤]، لەگەڵ چەند فیلێك وەك دیاری نادرشا بۆ سوڵتانی عوسمانی [٧٢٥].

لە سەرەتای تەمووزیساڵی **١٧٣٦**ز شاندەکە گەیشتە ئیستانبول، بەمەبەستی ئەنجامدانی دانوستاندن لەسەر ڕێککەوتننامەی ئاشتەوایی، لەگەڵ لایەنی عوسمانی **بەسەرکردایەتیی** سەدری ئەعزەم **محەمەد**پاشا بەئەندامییەتی وەزیر مستەفا پاشا و عەبدوڵا ئەفەندی و مەلا **خەلیل** ئەفەندی [٧٢٦]،کۆی گشتیی دانیشتنەکان برێتی بوون لە هەشت کۆبوونەوە [٧٢٧] ، لە دانیشتنی یەکەم لەلایەن شاندی ئێرانی دەستکرا بەخوێندنەوەی پەیامەکەی نادرشا کە لە کۆنگرەی موغان ئاراستەی سوڵتانی عوسمانی کردبوو [٧٢٨]، پاشان لە درێژەی دانیشتنەکانی دیکە شاندی ئێرانی جەختیان کردەوە لەسەر دووخاڵی سەرەکیی داواکارییەکە، کە لەلایەن نادرشا بەگرینگیەوە سەیر دەکرا [٧٢٩].

سەبارەت بەو دوو داواکارییەی کە لەلایەن شاندی ئێران گرینگی پێدرا لەمیانەی دانیشتنەکاندا برێتی بوون لە دانپێدانانی دەوڵەتی عوسمانی بەئایینزای جەعفەری و دانانی لایەك لە کەعبە بۆ ئەم ئایینزایە هاوشانی لقەکانی دیکەی سونە ئاینزا، بەڵام ئەم داواکارییانە

---

(٧٢٣) **محمد** حسین میمندی نژاد، منبع پیشین، ص٤٦٠

(٧٢٤) هامر پور گشتال، **تاريخ** امپر**اطوری عثمانی**، ترجمە : میرزا زکی علی ابادی، باهتمام : جمشید کیان فر، جلد ٤، انتشارات زرین، تهران، ١٣٦٨هـ.ش، ص ص٣٢١٥-٣٢١٦. هەرچەندە لەبارەی شاندەکە لە سەرچاوە تورکییەکەی هامر تەنیا باس لە عەبدولباقی خان زەنگەنە کراوە، کەچی لە وەرگێڕدراوە فارسییەکە ئەو ناوانەی لەگەڵ دانراوە.

J. Von Hammer, A.G.E, S.392.

(٧٢٥) **محمد علی بن محمد التبریزی، منبع** پیشین، **ص١٦٣**.

(٧٢٦) شاكر صابر **الضابط**، المصدر السابق، ص ص٤٥-٤٦.

(٧٢٧) ستیڤن هیمسلی لونگریك، المصدر السابق، ص١٨١ "

J. Von Hammer, A.G.E, S.393.

(٧٢٨) **علاء** موسی **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...،** ص١٨٣.

(٧٢٩) **محمد** حسین میمندی نژاد، منبع پیشین، ص ٥٠٧.

لەلایەن دەستەی دانوستانکارانی عوسمانییەوە ڕەتکرایەوە [٧٣٠]، پاش ئەوەی زانایانی ئاینی لە دەوڵەتی عوسمانی لە گفتوگۆکانیان لەگەڵ پیاوانی ئاینی ئێران نەگەیشتن بەهیچ بەرئەنجامێك، بۆیە ڕەتیانکردەوە، کە ئاینزای جەعفەری ببێتە ئاینزای پێنجەم [٧٣١].

دەکرێت بڵێین مەترسییەکانی دەوڵەتی عوسمانی سەبارەت بەقبووڵ نەکردنی ئاینزای جەعفەری لە دوو خاڵی سەرەکیی سەرچاوەی گرتووە، لەوانەیە مەترسییەکانی عوسمانی لەوە سەرچاوەی گرتبێت کاتێك لایەك بۆ ئەم ئاینزایە دابنرێت و بەرەسمی بناسرێت، چاوەڕوانی هەرکاتێك بکەن کە لەلایەن نادرشا یاخود هەر بنەماڵەیەکی دیکە فەرمانڕەوایی ئێران بکات بەبیانووی حەجکردن دەست بگرن بەسەر نەجەف و مەکە و سوریا [٧٣٢]، یاخود ئەو قبووڵکردنە دەبێتە بیانوویەکی باش بۆ نادرشا، کە هەڕەشەکانی لەسەر دەوڵەتی عوسمانی چڕبکاتەوەو **سەرکردایەتیی** عوسمانی بەسەر جیهانی ئیسلامیدا نەهێڵێت، ئەمەش لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی هێڵی سوور بوو.

دوا بەدوای ئەوەی داواکارییە ئاینییەکان ڕەتکرانەوە، هەردوولا بڕیاری داڕشتنی سێ خاڵەکەی دیکەیان خستە بواری گفتوگۆکردن، کە جەخت دەکرایەوە لەسەر ئەوەی کاروانی حاجیانی ئێران بەئارامی ئاسایشەوە لە نەجەفەوە بەرەو مەکە بڕۆن، لەهەمان کاتدا میری حەجی ئێران هەر ساڵێك گۆڕانکاریی بەسەردا بێت،هەروەها دیارکردنی باڵیۆزی هەردوو وڵات لە پایتەختەکانیان بەمەرجێك هەر سێ ساڵ گۆڕانکاریی تێدا بکرێت،لەگەڵ چارەسەرکردنی کۆتایی بۆ کێشەی دیلەکان و ئاڵوگۆڕپێکردنیان [٧٣٣].

لەلایەکی دیکەوە ڕێککەوتننامەکە پاشکۆیەکی هەبوو، کە چەندین خاڵی لەخۆ دەگرت، وەك دیارکردنی سنووری هەردوو وڵات و گەڕانەوە بۆ ڕێککەوتننامەی مورادی چوارەم (زەهاو **١٦٣٩**ز) [٧٣٤]، هەروەها پێویست کرا ڕێز لە ئیمامەکان بگیرێت، هەروەها ئاسانکاریی بۆ زیارەتکارانی ئێرانی بکرێت لەناو خاکی دەوڵەتی عوسمانی و بەهیچ شێوەیەکیش هەڵاتووەکانی یەکدیی لەباوەش نەگرن و داڵدەیان نەدەن، لەگەڵ

---

)730(J. Von Hammer, A.G.E, S.393.

(٧٣١) **علاء** موسى **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص١٨٣.

(٧٣٢) المصدر نفسه، ص ١٨٣.

)733(J. Von Hammer, A.G.E, S.394.

(٧٣٤) عباس العزاوي، المصدر السابق، **الجزء** الخامس، ص٢٤٩.

دانانی ڕێوشوێنی تایبەت بۆ مەبەستی ئاڵوگۆڕی بازرگانی نێوانیان[٧٣٥]، پاش ڕازیبوونی هەردوو لایەنی دانوستانکار لەسەر ئەم خاڵانە لە١٧ی تشرینی یەکەم ١٧٣٦ز ڕێککەوتننامەی ئاشتی واژۆکراو کەوتە بواری جێبەجێکردن، کە بەشێوەیەکی فەرمی جەنگ لەنێوان هەردوو دەوڵەت کۆتایی پێهات[٧٣٦] .

جێگەی ئاماژە پێکردنە داواکارییە ئاینییەکانی نادرشا بەهەڵواسراوی مایەوە، لەهەمان کاتدا شاندی دەوڵەتی عوسمانی گەیشتە لای نادرشا ڕەتکردنەوەی وڵاتەکەی بەو داواکاریانە ڕاگەیاند[٧٣٧]، هەرچەندە نادرشا ڕایگەیاند بوو ڕێککەوتننامەی ئاشتی نایەتە جێبەجێکردن تاکو هەموو داواکارییەکان جێبەجێ نەکرێن[٧٣٨]، بەڵام ڕێککەوتننامەکە جێبەجێ کرا بەبێ داواکارییە ئاینییەکان، بەشێوەیەك پرسی دانپێدانانی عوسمانی بۆ ئاینزای جەعفەری تەنیا بووە پردێك بۆ ئاڵوگۆڕکردنی نامە لەلایەن (شا)ی ئێران و سوڵتانی عوسمانی[٧٣٩] .

دەکرێت بڵێین داواکارییەکان لە ناخ و بیری نادرشا هەڵقوڵابوون، بەواتایەکی دیکە ئەم داواکارییانە ڕاوبۆچونی تەواوی خەڵکی ئێران نەبوو، هەرچەندە داواکارییە ئاینییەکان لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی ڕەتکرایەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا لەلایەن زانایانی شیعە جێگەی قبووڵکردن نەبوو، بگرە بەهۆی زەبر و دەسەڵاتی نادرشا توانی بۆچوونی خۆی بسەپێنێت[٧٤٠]، بەڵگەش بۆ ئەمە هەر لە دوای کوژرانی نادرشا دووبارە شەڕی ئاینزای دەست پێدەکاتەوە، لەلایەکی دیکەوە هەرچەندە نادرشا پێداگری دەکرد لەسەر جێبەجێکردنی داواکارییە ئاینییەکان،وەك مەرجێك بۆ ئاشتی کردن داینابوو لەسەر دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام ڕێککەوتننامەکە جێبەجێ کرا بەبێ داواکارییە ئاینییەکان، لەوانەیە ڕازیبوونی نادرشا بەڕێککەوتننامەی ئاشتی پێوەندیی ڕاستەوخۆی بەپڕۆژە فرەوانخوازییەکانی نادرشا هەبووبێت و ئارەزووی کردبێت لە ڕێگەی ئەو

---

)735(J. Von Hammer, A.G.E, S.394.

(٧٣٦) ستيڤن هيمسلي لونگريك، المصدر السابق، ص١٨٢.

(٧٣٧) **علاء** موسى **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص١٨٤.

(٧٣٨) عبدالحسين زرين كوب، منبع پیشین، ص ٧٤٧.

(٧٣٩) **علاء** موسى **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص١٨٤.

(٧٤٠) عبدالحسين زرين كوب، منبع پیشین، ص ٧٤٨.

ڕێککەوتننامەیە بۆ ماوەیەك دڵنیا ببێتەوە لە بەرەی عوسمانی بۆ ئەوەی هەنگاوە فرەوانخوازییەکانی لە هیندستان و ئاسیای ناوەڕاست ئەنجام بدات.

سەبارەت بەنادرشا وەڵامی سوڵتانی عوسمانی دایەوە بەنامەیەك تێیدا ئامادەیی خۆی نیشان دابوو، کە خۆی بچێت بۆ ئیستانبول و کێشەکە لەگەڵ سوڵتانی عوسمانی چارەسەر بکات، کە لە بەرژەوەندیی هەردوولا بێت، بەڵام ئەم ڕەفتارەی نادرشا هیچ گۆڕانکارییەکی لە هەڵوێستی دەوڵەتی عوسمانی نەکرد بۆ ئەوەی ڕازی بن بەدانپێدانان بەئاینزای جەعفەری[٧٤١] .

لەلایەکی دیکەوە لەیەك نێزیکبوونەوەی ئێران و عوسمانی مەترسییەکانی رووسیای قەیسەری زیادکرد، چونکە بەگوێرەی ڕێککەوتننامەی گەنجەی ساڵی ١٧٣٥ز دەبوایە ئێران ئاگەداری رووسیای بکردبایەوە لە دانوستاندنی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام لەلایەن نادرشا پشتگوێ خران[٧٤٢] .

سەبارەت بەهەڵوێستی نادرشا بەرانبەر بەرووسیای تەزاری دوای ڕێککەوتننامەی ئاشتی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، زۆر بەڕوونی دەردەکەوێت کاتێك داواکارییەکەی کالوشین (Иван Калошинl) نێردەی رووسیا ڕەتدەکاتەوە، کە داوای یارمەتی لە ئێران کرد دژ بەدەوڵەتی عوسمانی، کاتێك رووسیا ئابلۆقەی (ئازوف)ی دابوو لە ساڵی ١٧٣٦ز، بەڵام نادرشا لەبری پێشکێشکردنی کۆمەك، ڕابردووی رووسیای بەبیر هێنانەوە لەکاتی لاوازی ئێران و پێی ڕاگەیاندن هەر کاتێك بەهێزبن ئێران یەکەمین نێچیری ئێوە دەبێت بۆ پەلاماردانی، چونکە سرووشت وایە بەهێزەکان لاوازەکان دەخۆن، بۆیە کالوشین بەبێ هیچ دەسکەوتێك گەڕایەوە رووسیا[٧٤٣] .

---

(٧٤١) **علاء** موسى **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص ١٨٤ " روبرت دبليو.اولسن، المصدر السابق، ص ٢٠٧.

(٧٤٢) سەبارەت بە ڕێککەوتننامەی گەنجە جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە پێوستە ئێران و ڕووسیا پابەند بن بەوەی کە دانوستاندن بەشێوەیەکی تاك لایەنە ئەنجام نەدەن لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی بەبێ ئاگەداری لایەنەکەی دیکە کە زیان بەبەرژەوندییەکانی بگەیەنێت. کمال **مظهر** احمد، المصدر السابق، ص ص ٢١-٢٢.

(٧٤٣) محمد حسين ميمندى نژاد، منبع پيشين، ص٥٠٩.

## تەوەری دووەم:

## هەلمەتی سێیەمی نادرشا بۆ سەر عێراق ١٧٤٣ز

### هۆکارەکانی لەشکرکێشیی نادرشا بۆ عێراق

دەوڵەتی عوسمانی لە هەوڵی ئەوەدا بوو خۆی لە داواکارییەکەی نادرشا سەبارەت بەناساندنی ئاینزای جەعفەری وەك ئاینزای پێنجەم بدزێتەوە و وەڵامی ڕوونی بۆ بابەتەکە نەخاتەڕوو، بۆیە نادرشا لە یەکەمین کاردانەوەی کەوتە بیرۆکەی بەکارهێنانی هێز بۆ سەپاندنی پێشنیازەکانی بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا(٧٤٤)، هەرچەندە ئەو هۆکارە دەبێتە فاکتەرێکی سەرەکیی، بەڵام ئەوە ناگەیەنێت کە هۆکاری ستراتیژی و ئابووری ڕۆڵیان نەبووبێت لە هاندانی نادرشا بۆ ئەنجامدانی لەشکرکێشییەکەی بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی.

نادرشا بەر لە ئەنجامدانی هەڵمەتەکەی، جارێکی دیکە لە ساڵی ١٧٤٠ز شاندێکی گەورە بە**سەرکردایەتیی** حاج بیگ خان بەیاوەری ژمارەیەکی زۆر لەدەست و پێوەندەکانی نارده ئیستانبول(٧٤٥) بەمەبەستی دانوستاندن لەسەر پێشنیازەکەی سەبارەت بەداواکارییە ئاینییەکەی(٧٤٦)، هەروەها گەڕاندنەوەی هەرێم و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی

---

(٧٤٤) **عبدالعظیم رضائی**، منبع پیشین، ص٣٣.

(٧٤٥) شاندی ئێرانی بەدیاری گرانبەها و یازده فیل لە ڕێگەی بەغداوە ڕوویانکرده ئیستانبول . الشیخ رسول الکرکوکلی، المصدر السابق، ص٤٧ .

(٧٤٦) ابراهیم بگ حلیم، المصدر السابق، ص١٦٩.

عوسمانی کە پێشتر لەژێر دەسەڵاتی ئێراندا بوون، لەگەڵ دانی بڕێك پارە بە ئێران وەك قەرەبووی جەنگەکانی ساڵی ١٧٣٥ز [٧٤٧] .

لەساڵی ١٧٤١ز شاندی ئێران چووە ناو شاری حەلەب بەشێوەیەك سەرنجی هەموو لایەکی بۆ خۆی راکێشا، دوای سێ مانگ شاندەکە گەیشتە ئیستانبول لەلایەن سەدری ئەعزەم پێشوازییان لێکرا، بەڵام شاندی ئێرانی ڕەتیان کردەوە داواکارییەکان لەگەڵ (محەمەد پاشا) سەدری ئەعزەم باس بکەن، بۆ ئەم مەبەستە جەختیان دەکردەوە کە پێویستە گفتوگۆکان لەگەڵ سوڵتانی عوسمانی (مەحمودی یەکەم) بێت[٧٤٨] .

جێگەی ئاماژە پێکردنە شاندی ئێرانی دوای ئەوەی چاویان کەوت بەسوڵتان مەحمودی یەکەم،کەوتنە گفتوگۆکردن لەگەڵ لایەنی عوسمانی، بەڵام بەهۆی پابەند نەبوونی هەردوولا لەسەر بۆچونەکانیان،کۆبوونەوەکە شکستی هێنا [٧٤٩]، بەڵام دەوڵەتی عوسمانی هەوڵی دەدا پێوەندییەکان بەتەواوەتی نەپچڕێنێت، بۆ ئەم مەبەستە بەشاندی ئێرانیان ڕاگەیاند کە پێویستە لێژنەیەك پێك بهێندرێت لە زانایان و وەزیران بۆ گفتوگۆکردن لەسەر ئەو بابەتە بۆ ئەوەی داواکارییە ئاینییەکەی نادرشا بگونجێنن لەگەڵ یاسا و رێسای شەرعی[٧٥٠] .

دوای بەدواداچوونی داواکارییەکەی ئێران لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی، لەساڵی ١٧٤٢ز شاندی عوسمانی کە پێك هاتبوون لە مەنیف ئەفەندی گەورە فەرمانبەری دارایی و نەزیف مستەفا ئەفەندی بەرپرسی گومرگی ئیستانبول ڕەوانەی ئێران کران، لەلایەن خودی نادرشا لەسەر بازگەیەکی نێزیك دەربەند پێشوازییان لێکرا، هەر لەمیانەی کۆبوونەوەکەیان لەگەڵ نادرشا ڕەتکردنەوەی داواکارییەکەیان پێ ڕاگەیاند لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە[٧٥١] .

سەبارەت بەنادرشا لە یەکەمین کاردانەوەیدا کاربەدەستانی عوسمانی و زانا ئاینییەکانیانی بەدەرچوو لە ئیسلام هەژمارکرد، هەروەها بڕیاریدا چاوخشاندنەوەیەك

---

(747) Jonas Hanway,VI, Op.Cit, P.215 .

(٧٤٨) لکهارت، نادرشا، ص٢٨٣.

(٧٤٩) ابراهيم بگ حليم، المصدر السابق، ص١٦٩.

(٧٥٠) لکهارت، نادرشا، ص٢٨٣.

(٧٥١) ميرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای..، ص٣٧١ " **محمد علی بن محمد التبريزی**، منبع پيشين، ص٢٢٢ "
Abdurrahman Ates, Avsarli Nadir Sah Ve Doneminde Osmanli- Iran Mucadeleleri, Doctora Teze – suleyman Demirel Universitesi- Sosyal Bilimler Enstitusu,Isparta-2001,SS. 93 – 94.

بکات بەئاینزای دوازدە ئیمامی کە لە سەردەمی شا ئیسماعیل رەواجی هەبووە، لەگەڵ جەختکردنەوە لەسەر ڕێزلێنان لە هەر سێ خەلیفەی راشدین ئەبوبەکری سەدیق، عومەری کوڕی خەتاب و عوسمانی کوڕی عەفان (ر.خ) [٧٥٢]، نادرشا لە ڕێگەی شاندەکەی دەوڵەتی عوسمانی نامەیەکی ئاراستەی سوڵتانی عوسمانی کرد، کە تێیدا بەشێوازی هەڕەشەئامێز ئاگەداری سوڵتانی کردەوە و کە لە ڕێگەی هێزەوە دەوڵەتی عوسمانی ناچار دەکات داواکارییەکەی قبووڵ بکەن[٧٥٣].

دوای نامە هەڕەشەئامێزەکەی نادرشا، لەسەر داوای سوڵتانی عوسمانی فتوایەك لەلایەن موفتی ئیستانبول (شیخی ئیسلام) شێخ مستەفا ئەفەندی فەیزوڵا ئەفەندی زادە ١٦٨٠ – ١٧٤٥[٧٥٤] دەرچوو، کە تێیدا جەنگ کردن دژ بەئێران بەجیهاد هەژمارکرد، هەروەها کوژراوەکانیشی بەشەهید دانا[٧٥٥] ، هەروەها لە٢٣ی نیسانی ١٧٤٢ز لەئیستانبول کۆبوونەوەیەك لەبارەگەی سەدری ئەعزەم بەسترا بەمەبەستی تاوتوێکردنی ناوەرۆکی نامەکەی نادرشا، پاشان دەستکرا بەگرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەموو ئەگەرەکانی جەنگ، وەك دەستنیشانکردنی سەرکردەکانی سوپا و گواستنەوەی پێداویستیی جەنگ و خۆراك لە ڕێگەی دەریاوە بۆ

---

(٧٥٢) حبیب الله شاملوئی، منبع پیشین، ص٧١٧.

(٧٥٣) **علاء** موسی **کاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص ١٨٦.

(٧٥٤) شێخ مستەفا کوڕی محەمەد فەیزوڵا کوڕی محەمەد جنیب کوڕی محەمەد بیر کوڕی ئەحمەد کوڕی جونەید کوڕی شەمسەدینی تەبریزی لە سەرەتاکانی ساڵی ١٦٨٠ز لە ئیستانبۆڵ لەدایکبووە، سەرەتای خوێندن و زانیارە ئاینییەکانی لەسەر دەستی باوکی وەرگرتووە، دواتر لەنێوان ساڵانی ١٧٠٠ – ١٧٠٣ز وەك قازی لە چەند ناوچەیەك دەست نیشانکراوە، سەرەتا لە دیمەشق، دواتر دەگوازرێتەوە بۆ مەکەی پیرۆز و وەك قازی دەست بەکاردەبێت، لەنێوان ساڵانی ١٧٠٢- ١٧٠٣دەبێتە قازی عەسکەری ئەنادۆڵ، لە دوای ڕاپەڕینەکەی پاترۆنا و دوورخستنەوەی سوڵتان ئەحمەدی سێیەم لە دەسەڵات و هاتنی سوڵتان مەحمودی یەکەم، شێخ مستەفا گەڕایەوە ئیستانبۆڵ، دواتر لە١٣ی نیسانی ١٧٣٦ پۆستی شێخی ئیسلامی پێدرا و بەردەوام بوو لەو پۆستە تاکو مردنی لە٤ی ئازاری ١٧٤٥ز. بۆ زانیاریی پتر بگەڕێوە : **احمد صدقی شقیرات، تاریخ مؤسسة شیوخ الاسلام في العهد العثمانی (٨٢٨-١٣٤١ە/١٤٢٥-١٩٢٢م)، المجلد الاول، الطبعة الأولی، المکتبة الوطنیة، اربد، الاردن، ٢٠٠٢م، ص ص٦٦٦-٦٦٧.**

(٧٥٥) **محمد علی بن محمد التبریزی**، منبع پیشین، ص٢٣١ " محمد حسین میمندی نژاد، منبع پیشین، ص٨١٤.

تەرابزۆن، لەوێشەوە بۆ ئەرزەڕوم کە بریتی بوو لە نێزیکەی ٣٠٠ - ٤٠٠ تەن لە خۆراك و پێداویستیی جەنگی، سەرەڕای ئەوانەش چەندین کەشتی جەنگی ڕەوانەی تەرابزۆن کران، لەگەڵ پێداویستیی سەربازی بۆ وان و بەغدا(٧٥٦).

یەکێك لە گرینگترین هۆکار بۆ بەئاشکرا ڕەتکردنەوەی داواکارییەکەی نادرشا لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕووداو پشێوییانەی ناوچەی داغستان کە بەرۆکی نادرشای گرتبوو، بووە هاندەرێك بۆ عوسمانییەکان ئەو بڕیارە بدەن (٧٥٧)، هەر لەمیانەی ئەو بارودۆخەدا دەستیانکرد بە زێدەڕۆیی لەسەر بازرگانان و حاجیانی ئێران، بۆ ئەم مەبەستە باجی زۆر قورسیان سەپاندە سەر بازرگانە ئێرانییەکان، هەروەها فشاریان خستنە سەر فەرمانبەرانی ئێران بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ ئێران (٧٥٨).

دوا بەدوای جێگیرکردنی باردۆخی قەفقاز، نادرشا دەستیکرد بەئامادەکارییەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، سەرەتا ژمارەیەکی زۆری خۆراك و خواردەمەنی عەمبار کرد لە حەوێزە وەك ئامادەکارییەك بۆ هێرشکردنە سەر شاری بەسرە، کە دواتر ئاماژەی پێ دەکەین (٧٥٩)، هەروەها هەڵسا بەکڕینی ژمارەیەکی زۆری ئاژەڵ کە نێزیکەی شەست هەزار سەر دەبوو پێك دەهاتن لە ئەسپ و وشتر و گوێدرێژ وەك ئامادەکارییەك بۆ جەنگە چاوەڕوانکراوەکەی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی (٧٦٠).

دەکرێت بڵێین عوسمانییەکان لە ڕێگەی سوود وەرگرتنیان لە سەرقاڵبوونی نادرشا بەناوچەی قەفقاز توانیان ئەو هەلە بقۆزنەوە و جارێکی دیکە بەهێزەوە بێنەوە ناو

---

(756) Abdurrahman Ates, A.G.E, SS.94-95.

(٧٥٧) لکهارت، نادرشا، ص ص٢٨٤-٢٨٥.

(٧٥٨) هەمان منبع، ص٢٨٥. نادرشا نێزیکەی ١٣ مانگ نەیتوانی هەڕەشەکانی بەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی بخاتە بواری جێبەجێکردن، بەهۆی شەڕکردنی لەگەڵ هۆزەکانی لزگی لە داغستان، ئەمەش وایکرد دەوڵەتی عوسمانی خۆی ئامادەبکات بۆ شەڕی داهاتوو، کە هەڵسا بەئامادەکاری پێویست بۆ حامییەکانی لە بەغدا و ئەرزەڕوم. **علاء** موسى **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص ١٨٦.

(٧٥٩) **الكسندر اداموف، المصدر السابق، ص١٠٤.**

(٧٦٠) نادرشا گەیشتبووە ئەو بڕوایەی کە جەنگ کردن لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی بەلای کەمی نێزیکەی سێ ساڵ دەخایەنێت، هەروەها زۆری ژمارەی سەربازانی بەشداربوو لەو هەڵمەتە پێویستی بەو ئامادەکارییانە دەکرد. **محمد** حسين ميمندى نژاد، منبع پيشين، ص٨١٣ .

گۆڕەپانی سیاسی و بیسەلمێنن بۆ جیهانی ئیسلامی، کە تاکو ئێستە هەر ئەوان دەسەلاّتی ڕاستەقینە و شەرعین، هەرچی نادرشا بوو گەیشتە ئەو بڕوایەی کە دەوڵەتی عوسمانی لە ڕێگەی درێژکردنەوەی بابەتەکە لە دوای دەرفەتێك دەگەڕێت تاکو لەو لاوازییە ڕزگاری بێت و بەهێزەوە بەرەنگاری مەبەستەکانی نادرشا بێتەوە، بەرئەنجام شەڕێکی گەورەی لێکەوتەوە کە زیان لێکەوتووی یەکەم و کۆتایی خەڵکی عێراق بوو.

## ب – ڕەوت و پەرەسەندنەکانی لەشکرکێشیی نادرشا بۆ عێراق ١٧٤٣ز

### ١ – لەشکرکێشییەکانی نادرشا و داگیرکردنی هەردوو شاری کەرکووك و هەولێر

نادرشا هەر لەناوچەی داغستان لەساڵی ١٧٤٣ز دوو لە پیاوەکانی خۆی ڕەوانەی لای ئەحمەد پاشا والی بەغدا کرد، بەمەبەستی ڕادەستکردنی شارەکە بەنادرشا، بەلاّم ئەم داواکارییە لەلایەن والی بەغدا لە سەرەتادا ڕەتکرایەوە، لەبری بەدەمەوە هاتنی داواکارییەکە هەڵسا بەپتەوکردنی قایمکارییەکانی بەغدا و گواستنەوەی خەڵکەکە لە بەرەی کەرخ بۆ ڕەسافە [٧٦١].

لەلایەکی دیکەوە نادرشا دوای ئارامکردنەوەی ناوچەی قەفقاز [٧٦٢]، لە شوباتی ١٧٤٣ز گەڕایەوە سنە، دواتر لە ڕێگەی کرماشان بەیاوەری هێزی تۆپخانەکەی لە

---

(٧٦١) ستیڤن هیمسلی لونگریك، المصدر السابق، ص١٨٣ " باقر امین الورد، المصدر السابق، ص٢٢١.

(٧٦٢) نادرشا ڕووسەکانی بە بەرپرسیار دانا بەرانبەر ئەو کێشانەی لە داغستان ڕووبەڕووی دەبوونەوە، لەوانەیە ڕووسەکان هەوڵی زۆریان دابێت بۆ ڕێگەگرتن لە هەڵمەتەکانی سوپای ئێران دژ بەلزگییەکان و ڕێگەگرتن لە گەیشتنی کۆمەکە سەربازییەکان، لەو بارەیەوە دەنگۆیەکی بەربلاّو هەیە باس لەوە دەکات کە ڕووسەکان یارمەتی چەك و پێویستی سەربازی پێشکێش بەلزگییەکان کردووە، هەر لەبەر ئەم هۆیە نادرشا لە تشرینی دووەمی ١٧٤٠ز ڕوویکردە باکور بەئاراستەی سنوورەکانی ڕووسیا، لەو هەلومەرجەشدا سوپای عوسمانی پاش ڕەتکردنەوەی پێشنیازە ئاینییەکانی نادرشا جووڵەی پێکرا بەئاراستەی قەفقاز، بۆیە نادرشا لە ١٠ی شوباتی ١٧٤٣ز گەیشتە ئەو بڕوایەی شەڕکردن لەگەڵ ڕووسەکان لەو بارودۆخەدا بەقازانجی ئێران تەواو نابێت لە کاتێکدا سوپای عوسمانی لە دواوە جووڵەی پێکرابوو، بۆیە نادرشا بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوپای عوسمانی ڕوویکردە موغان، پاش ئەوەی هێزێکی ئێرانی بەهێز کە لە ئەفغانەکان پێك دەهات لە دەربەند جێگیر کرد. بۆ زانیاریی پتر بگەڕێوە بۆ:

Michael Axworthy,The Sword Of Persia: Nader Shah From Tribal Warrior to Conquering Tyrant (London – I.B. Tauris – 2006), PP.247-248

ڕێگەی زەهاو گەیشتە سنووری عێراق (٧٦٣)، بەڵام لەکاتی پێشڕەوییەکانی نادرشا بەرەو سنە محەمەد ئاغا نێردەی تایبەتی والی بەغدا گەیشتە لای، چەندین دیاری والی بەغدای پێدا و لەگەڵ ئاگەدارکردنەوەی نادرشا بەڕازیبوونی ئەحمەد پاشا بەڕادەستکردنی شاری بەغدا (٧٦٤).

لەو بارەیەوە عەلی وەردی بەسەرسووڕمانەوە ئەو بابەتە دەخاتە بە رلێکۆڵینەوە، پێی وایە ئەو کارەی ئەحمەد پاشا ڕەنگە نەخشەیەك بوو بێت لە پشتی دەوڵەتی عوسمانییەوە ئەنجام درابێت لە نێوان نادرشا و والی بەغدا لە پێناو دابەشکردنی بەرژەوەندیی هەردوولایان لەسەر حیسابی ئەو دەوڵەتە (٧٦٥)، هەر ئەمەش وایکردووە ئەو هەڵوێستەی ئەحمەد پاشا لەلایەن هەندێك لە عوسمانییەکان بەناپاکیکردن هەژمار بکرێت، هەروەها بیشوبهێنن بەسەرکردەی هیندی نیزام ئەلمولك کە ناپاکی لە ئیمپراتۆریەتی هیندستان کرد (٧٦٦).

هەندێکی دیکە وای دەبینن پێشنیازەکەی ئەحمەد پاشا بۆ داگیرکردنی شاری موسڵ دەگەڕێتەوە بۆ زیرەکی و لێهاتووی ئەحمەد پاشا، چونکە ئەو کەسایەتییە گەیشتبووە ئەو بڕوایەی کە داگیرکردنی شاری موسڵ لەلایەن نادرشاوە کارێکی ئاسان نابێت، هۆکارەکەشی ستراتیژیەتی ئەو شارە بوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی لە ڕووی سیاسی و ئابووری و سەربازی گرینگی تایبەتی خۆی هەبووە، بەلەدەستدانی ئەو شارە تاڕادەیەك بارودۆخی ناوەخۆی دەوڵەتی عوسمانی تووشی لێکترازان دەکرد، بۆیە لەدەستدانی شاری

---

(٧٦٣) حبيب الله شاملوئی، منبع پيشين، ص٧١٧.

(٧٦٤) ميرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای..، ص٣٨٣ . سەرچاوە فارسییەکان باس لەوە دەکەن ناوەڕۆکی نامەکەی ئەحمەد پاشا بۆ نادرشا جەختی دەکردەوە لەسەر پێوەندییە دووقۆڵییەکانی نێوانیان، هەروەها داوای کردووە ماوەیەکی پێ ببەخشێت بۆ ڕادەستکردنی شاری بەغدا، کەچی سەرچاوە ناوەخۆییەکان باس لەوە دەکەن ئەحمەد پاشا پێشنیازی بۆ نادرشا کردووە سەرەتا دەست بگرێت بەسەر موسڵ. دواتریش لەلایەن ئەحمەد پاشاوە شاری بەغدا ڕادەستی دەکرێت: نورالله لارودی، منبع پيشين، ص٢٠٣ " غلام حسين مقتدر، منبع پيشين، ص١١٣ " **ياسين بن خيرالله الخطيب العمرى، منبية الادباء في تاريخ الموصل الحدباء، تحقيق : سعيد** الديوەچی، **مطبعة الهدف، موصل، ١٩٥٥م، ص٩٧** "سليمان صائغ، المصدر السابق، ص٢٧٨.

(٧٦٥) **على الوردى، المصدر السابق**، ص١٣١.

(766) Jonas Hanway, Op.Cit, P.234 .

موسڵ بۆ دەوڵەتی عوسمانی هێڵی سوور بوو، بەڵگەش بۆ ئەم باسە گێڕانی ئاهەنگێکی گەورە بوو لە ئیستانبول لەکاتی پاشەکشەکردنی نادرشا لە شاری موسڵ [٧٦٧] .

شیاوی باسکردنە نادرشا لە ڕێگەی ئەو نەخشە سەربازییەی کە دایڕشتبوو بۆ ئەنجامدانی لەشکرکێشییەکەی بۆ سەر عێراق، سوپاکەی دابەش کردە سەر دوو بەش، بەشێکیان ئەرکی داگیرکردنی ناوچەکانی دەوروبەری بەغدا و سامەڕا و حیلە و نەجەف و کەربەلا و کەناری دیالەیان پێ ڕاسپێردرا، هەروەها بەشەکەی دیکەی سوپای خستە ژێر **سەرکردایەتیی** قۆچە خان شەیخانلوی چەمشزگە و ئەرکی داگیریکردنی بەسرەی خستە ئەستۆ، لە هەمان کاتدا داوای لە فەرمانڕەواکانی حەوێزە و شوشتەر و دیزفول کرد یارمەتی پێویستی پێشکێش بکەن [٧٦٨].

بەگوێرەی گوتەی یەکێك لە نووسەری خەرجییەکان کۆی گشتیی ژمارەی سەربازانی سوپای ئێران لەو هەڵمەتەدا برێتیی بوو لە ٣٧٥ هەزار سەرباز،کە چەندین پێکهاتەی جیاوازی لەخۆ دەگرت لەوانە ٦٠ هەزار سەربازی تورکمان و ئوزبەك بەشداریان تێدا کرد، لەگەڵ ٧٠ هەزار سەربازی ئەفغانی و هیندی، ٦٥ هەزاریش لە خۆراسان، ١٢٠ هەزار سەرباز لە ڕۆژئاوای ئێران و ٦٠هەزار سەربازیش لە ئازەربیجان و قەفقاز[٧٦٩]، لەشکرکێشییەکەی نادرشا بەئاراستەی خاکی عێراق لە تەمووزی ١٧٤٣ز دەستی پێکرد، کە ناوچەکانی باکووری ئەو ناوچەیەی گرتەوە بەتایبەت شاری موسڵ، چونکە گرینگی پێگەی ستراتیژی ئەو شارە کە دەکەوێتە سەر ڕێگەی گواستنەوەی بازرگانی نێوان عێراق و ئەنادۆڵ، بەواتایەکی دیکە داگیرکردنی ئەو شارە دەبێتە بەربەست لەبەردەم دەوڵەتی عوسمانی سەبارەت بەگەیاندنی کۆمەکی سەربازی، هەروەها لەلایەکی دیکەوە داگیرکردنی بەشەکانی دیکەی عێراق لە ناوەڕاست و باشوور ئاسانتر دەبێت بۆ سوپای ئێران [٧٧٠] .

---

(٧٦٧) **سیار الجمیل، المصدر السابق، ص١٤٨.**

(٧٦٨) حاج میرزا حسن حسینی فسائی منبع پیشین، ص٥٦٠ " میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای..، ص ص٣٨٣-٣٨٤. سەبارەت بەهەنگاوەکانی لەشکرکێشیی نادرشا بۆ عێراق لە تەمووزی ١٧٤٣ز بگەڕێوە بۆ: پاشکۆی ژمارە (١٠).

)769(Michael Axworthy, Op.Cit, PP.249 - 250.

(٧٧٠) ابراهیم خلیل احمد، خلیل علی مراد، المصدر السابق، ص ص٥٤-٥٥ .

لەلایەکی دیکەوە نادرشا گەیشتە ئەو بڕوایەی بەجێگەیاندنی خەونەکانی لە دروستکردنی ئیمپراتۆریەتەکەی کە درێژ دەبۆوە لە ڕووباری سند تاکو بسفۆر، ئەو کاتە بەئەنجام دەگات کە شاری موسڵ داگیر بکات، چونکە ئەو شارە دەروازەیەکی گرینگە بۆ گەیشتن بەدڵی دەوڵەتی عوسمانی، لەبەرامبەریشدا عوسمانییەکان گەیشتنە ئەو بڕوایە کە شاری موسڵ باشترین و کۆتا شوێنە بۆ پارێزگاریکردن لە ئیستانبول [771]، بەواتایەکی دیکە هێرشکردنە سەر موسڵ لەلایەن نادرشا دەبێتە سەرەتایەك بۆ هێرشکردنی سوپای ئێران بۆ سەر دیاربەکر یاخۆ رقە و حەلەب [772] .

سوپای ئێران بە**سەرکردایەتیی** نادرشا ڕووی لە شارەزوور کرد، بەئاسانی توانی لە ئابی ١٧٤٣ز دەستی بەسەردابگرێت، چونکە هۆزە کوردەکانی نیشتەجێی ئەو ناوچەیە ملکەچی خۆیان ڕاگەیاند، پاش ئەوەی سەلیم بەگ یەکێك لە میرەکانی بابان کە ئەو کات فەرمانڕەوای شارەزوور بوو دڵسۆزی خۆی بۆ نادرشا دووپاتکردەوە، لەبەرامبەر ئەو دڵسۆزییەی نادرشا وەك میری بابان لە جێگەی خالید پاشای لایەنگری عوسمانییەکان دانا، چونکە خالید پاشا دوای ئەوەی نەیتوانی بەرەنگاری سوپای ئێران بێتەوە ڕایکردە شاری موسڵ و لەوێشەوە چوو بۆ دیاربەکر [773]، لەلایەکی دیکەوە بەشێکی دیکەی سوپای ئێران هێرشیانکردە سەر ئەرزەروم، مەبەستیش تێیدا زیاتر سەرقاڵکردنی دەوڵەتی عوسمانی بوو بەسەر دوو بەرەی جەنگدا [774].

(771) Cyrus Ghani, Iran and the West(London – Kegan Paul – 1987),P.288.

(٧٧٢) **محمد سعید فرائضجی** زادە، **کلشن معارف، اسطنبول، ١٢٥٢**هـ، **ص١٣٨٥**.

(773) Abdurrahman Ates, A.G.E, S.97 "

سعدی **عثمان** حسین، کوردستان الجنوبیه..، المصدر السابق، ص ص٣١٢-٣١٣ . لەو بارەیەوە (د.سەعدی عوسمان) جەخت لەوە دەکاتەوە کە دەسەڵاتی ئێر**انییە**کان لە میرنشینی بابان پاش ئەو ڕووداوە تەنیا بەناو بووە، ئەمەش وەك وەڵامدانەوەیەکە بۆ **مێژوونووس** (ئەحمەد جەودەت) کە پێی وایە ئێر**انییە**کان دەسەڵاتی تەواویان لە کاروباری میرنشینی بابان هەبووە، لەلایەکی دیکەوە د. سەعدی عوسمان جەخت لەوە دەکاتەوە، کە **مێژوونووسی** ناوبراو هیچ ڕووداوێکی لەو دەستێوەردانانە باس نەکردووە، سەرەڕای ئەوەش هیچ سەرچاوەیەکی دیکە ئاماژە بەو دەستێوەردانانە ناکەن. سعدی **عثمان حسین، امارة بابان..، المصدر السابق، ص٤٨.**

(٧٧٤) علی شاکر علی، المصدر السابق، ص١٩٥.

نادرشا له شارەزورەوە ڕوویکردە شاری کەرکووك بەمەبەستی داگیرکردنی، هەر زوو هەر یەکە لە حوسێن پاشا حەمال ئۆغلی والی شارەکە و ئەحمەد پاشا حەلەبی فەرمانداری شارەکە بەرەو شاری موسڵ ڕایان کرد، لەوێشەوە بەرێکەوتن بەرەو دیاربەکر[775]، پاش گەیشتنی نادرشا و هێزەکەی دەستیانکرد بەئابلۆقەدانی شارەکە، کە ماوەی هەشت ڕۆژی خایاند، دواتر دەستکرا بەبۆردومان کردنێکی سەختی شارەکە بەفەرمانی نادرشا، بەتایبەت دوای ئەوەی خەڵکی شارەکە بڕیاری بەرگرییکردنیاندا، کە ئەنجامەکەی بەداگیرکردنی شارەکە کۆتایی پێهات[776].

سوپای ئێران دوای داگیرکردنی شاری کەرکووك ڕوویان کردە شاری هەولێر، لە ڕێگەدا خەڵکی پردێ (ئاڵتون کۆپری) ملکەچبوونی خۆیان ڕاگەیاند بۆ نادرشا، لەوێشەوە بەفەرمانی نادرشا هێزێك، کە پێکدەهات لە١٢ هەزار جەنگاوەر بە**سەرکردایەتیی** عەلی قوولی خانی برازای بەرێکخرا بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئێزیدییەکان، هەرچەندە لەلایەن ئێزیدییەکان بەرگرییەکی توند کرا، بەڵام لەئەنجامدا نەیاتوانی خۆیان

---

(775) **سیار الجمیل، المصدر السابق، ص١٤١.**

(776) عباس العزاوی، المصدر السابق، **الجزء** الخامس، ص٢٦٧ " **یاسین بن خیرالله الخطیب العمری، المصدر السابق، ص١٨٠** . لەو بارەیەوە نادرشا سەرەتا هێزێکی نادر بۆ داگیرکردنی شاری کەرکووك، بەڵام شکستخواردنی ئەو هێزە لەلایەن هێزێکی عوسمانی جێگیر لەو شارە و کوژرانی ژمارەیەکی زۆری سەربازی ئێرانی بووە هۆکارێك بۆ پەستبوونی نادرشا، بۆیە نادرشا دوای جێهشتنی ١٠ هەزار سەرباز چەند تۆپێکی ئاگرین لە بەرامبەر بەغدا خۆشی لەسەرووی هێزیك ڕوویکردە شاری کەرکووك پاش تۆپبارانکردنێکی سەخت خەڵکی شارەکە ملکەچبوونی خۆیان ڕاگەیاند، بەتایبەت دوای ئەوەی لەلایەن نادرشا دڵنیا کرانەوە لە پارێزراوی گیان و ماڵیان، بەڵام ئەم بەڵێنانە دوای ملکەچبوونەکە بوونە بڵقی سەر ئاو لە جیاتی ئەوە بەتوندترین شێواز کەوتە گیانی خەڵکەکە و ژمارەیەکی زۆری بەدیل گرت،لەنێویاندا زانایانی ئاینی تێدا بوو، دواتر هەڵسا بەسەپاندنی سزای دارایی بەسەر خەڵکەکە، کە زۆرینەیان نەیانتوانی ئەو بڕە پارەیە ئامادەبکەن، دواتر عەبدوڵا ئەفەندی سویدی ڕۆڵی بەرچاوی گێڕا لەئازادکردنی دیلەکان. بۆ زانیاریی پتر لەبارەی هەڵسوکەوتی سوپای ئێران دوای داگیرکردنی شاری کەرکووك بگەڕێوە بۆ:

Abdurrahman Ates, A.G.E, S.97 "

**محمد بهجة الاثری، ذرائع العصبیات العنصریة في اثار الحروب وحملات نادرشاة علی العراق في روایة شاهد عیان، مطبعة المجتمع العلمی العراقی، بغداد، ١٩٨١م، ص٨٥ .**

لەبەردەم هێزێکی ڕێکخراودا بگرن [٧٧٧]، سەبارەت بەشاری هەولێریش، نادرشا هەمان ئەو سیناریۆیە سەربازییەی دووبارەکردەوە، کە بۆ داگیرکردنی کەرکووك ئەنجامی دابوو[٧٧٨]، دوای بوردومانکردنێکی سەخت کە ڕۆژێکی تەواو نەکرد، خەڵکەکە ملکەچبوونی خۆیان ڕاگەیاند و شارەکەیان ڕادەستی نادرشا کرد [٧٧٩].

## ٢ – هەوڵەکانی نادرشا بۆ داگیرکردنی شاری موسڵ

دوای داگیرکردنی شارەکانی کەرکووك و هەولێر لەلایەن هێزەکانی ئێران، لە هەولێرەوە بەفەرمانی نادرشا،نامەیەك لەلایەن مەلاباشی عەلی ئەکبەر، گەورە مەرجەعی ئاینی شیعەی ئێران ئاراستەی یەحیا ئەفەندی ئەلفەخری موفتی شاری موسڵ کرا کەلەلایەن هەریەکە لە حەسەن ئەفەندی قازی کەرکووك بەیاوەری هەریەکە لە محەمەد ئەفەندی و مستەفا ئاغا لە پیاو ماقووڵانی کەرکووك ئەرکی گەیاندنی نامەکەیان پێ ڕاسپێردرا بۆ ئەوەی بیگەیەنن بەحوسێن پاشا جەلیلی والی شاری موسڵ بەمەبەستی خۆبەدەستەوەدان[٧٨٠].

---

(٧٧٧) لکهارت، نادرشا، ص ص٢٨٩-٢٩٠.

(٧٧٨) الشيخ رسول الكركوكلي، المصدر السابق، ص٥٠.

(٧٧٩) **ياسين بن خيرالله الخطيب العمری، المصدر السـابق، ص١٨٠** "محمد حسين ميمندی نژاد، منبع پيشين، ص٨١٤ " عماد عبدالسلام **رؤوف**، الموصل في العهد **العثماني**..، ص١٠٤ . سەبارەت بەهێرشەکەی نادرشا بۆ سەر شاری هەولێر، سیار جەمیل ماوەی دەرچوونی نادرشا لەکـەرکووك و گەیشـتنی بەموسـڵ هەشـت ڕۆژی دیارکردووە، هەروەها پێی وایـە (Ives) لـە گەشـتنامەکەی (**A Voyage from England to India**) هەڵەی کـردووە لـەدیارکردنی شـەش ڕۆژی گـەمارۆدان، چـونکە ئەگـەر ئـەو سـوپایە شـەش ڕۆژ خـەریکی گەمارۆدانی هەولێر بوو بێت، کەواتە بەدوو ڕۆژ ئەو هێزە گەورەیە ماوەی نێوان کەرکووك و موسـڵی بڕیـووە، ئەمەش دوورە لەڕاستی، هەروەها لەلایـەکی دیکـەوە زوبـێر بـلال ئیسـماعیل پێـی وایـە دوای ٦٠ ڕۆژ لـە ئابڵوقەدان و بوردومانی سەختی قەڵای هەولێر خەڵکەکە ملکەچی نادرشا بوون، ئەمەش پێچـەوانەی هـەموو بۆچوونەکانە، بۆ ئەم مەبەستە زوبێر بلال سوودی لەزانیارییەکانی دائـیرەی معـاریفی ئیسـلامی وەرگرتـووە. **سيار الجميل، المصدر السابق، ص١٨٠، زبير بلال اسماعيل، اربيل في ادوارها التاريخيـة، النجـف، ١٩٧٠م، ص٢٨٩" دائرة معارف الاسلامية، مادة اربل، مجلد اول، ١٩٣٣، ص٥٧٢.**

(٧٨٠) سليمان صائغ، المصدر السابق، ص ص٢٧٩-٢٨١ . سەبارەت بەهۆکاری نادرنی نامە لەلایەن نادرشا بۆ والی موسڵ، **مێژوونووس** محەمەد حوسێن میمندی نژاد پێی وایـە نادرشـا نەیویسـتووە موسـڵمان کـوژی

پاش ئەوەی نامەکە گەیاندرایە والی موسڵ، بڕیاری کۆکردنەوەی خەڵکی موسڵیدا لە مزگەوتی سوور کە دەکەوێتە سەر ڕووباری **دیجلە** لەباشووری شاری موسڵ [(٧٨١)]، پاشان ناوەڕۆکی نامەکەی بۆ خوێندنەوە و ئاماژەی بەداواکارییەکەی نادرشا کرد،کە برێتی بوو لە ڕادەستکردنی شاری موسڵ، هەروەها هەڕەشەکانی خستە ڕوو لەکاتێکدا داواکارییەکەی ڕەتبکرێتەوە ئەوە دەکەونە بەر تووڕەیی نادرشا،بەڵام خەڵکی موسڵ داواکارییەکەیان ڕەتکردەوە، بۆیە موفتی موسڵ لە نامەیەکدا وەڵامی ئێرانییەکانی داویەوە کە ئامادەنین ملکەچی هەڕەشەکانی نادرشا بن[(٧٨٢)].

لە ئەنجامی سەرنەکەوتنی هەوڵە دیپلۆماتییەکان،بەتایبەت دوای ئەوەی خەڵکی موسڵ ڕەتیان کردەوە ملکەچی داواکارییەکەی نادرشا ببنەوە بەڕادەستکردنی شارەکەیان، بۆیە لە١٠ی ئەیلوولی **١٧٤٣**ز بەشێك لە سوپای ئێران جووڵەی پێکرا بەئاراستەی گوندی یارمچە[(٧٨٣)]، پاش پەڕینەوەیان لە ڕووباری **دیجلە** ڕووبەڕووی بەشێکی سوپای موسڵ بوونەوە بە**سەرکردایەتیی** عەبدولفەتاح پاشا برای حوسێن پاشای والی موسڵ[(٧٨٤)]، بەیاوەری میر قۆچ پاشا میری کۆیە دوای شەڕێکی سەخت سوپای موسڵ بەناچاری پاشەکشەیان کرد بەرەو شاری موسڵ [(٧٨٥)]، هۆکارەکانی ئەنجامدانی

---

بکات، لەهەمانکاتدا ئۆباڵی جەنگەکە دەگەڕێتەوە سەر حوسێن پاشای جەلیلی، چونکە فەرمانی سوڵتانی عوسمانی و فتوای شێخی ئیسلام کاریگەریی گەورەیان هەبووە لەسەر خودی والی موسڵ، هەروەها دەنگۆی گەیشتنی سوپای یارمەتیدەری عوسمانی لە حەلەبەوە هەبووە، هۆکارێك کە لایەنی موسڵ ئامادە نەبن ئاشتەوایی بکەن و بەداواکارییەکەی نادرشا رازی بن. **محەمەد** حوسێن میمندی نژاد، منبع پیشین، ص٨١٥ .

لەبارەی ناوەڕۆکی نامەکەی مەلاباشی بۆ موفتی موسڵ، بگەڕێوە بۆ پاشکۆی ژمارە (٤).

(٧٨١) **سيار الجميل، المصدر السابق، ص١٤٤.**

(٧٨٢) سليمان صائغ، المصدر السابق، **ص ص ٢٨١-٢٨٢ " ياسين بن خيرالله الخطيب العمري، المصدر السابق، ص ص١٨٠-١٨١" دومنيكو لانزا، الموصل في القرن الثامن عشر، ترجمة: القس روفائيل بيداويد، الموصل، ١٩٥٣م، ص٣٧** . لەبارەی ناوەڕۆکی نامەکە بگەڕێوە بۆ پاشکۆی ژمارە (٥).

(٧٨٣) دەکەوێتە دووری ٥کم لە باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری موسڵ. **علاء** موسى **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص١٩٠.

(٧٨٤) عبدالجبار محمود السامرائی، المصدر السابق، ص٢٤.

(٧٨٥) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای..، ص ص٣٨٥-٣٨٦" **سيار الجميل، المصدر السابق، ص١٥١.**

ئەو کردە سەربازییە لەلایەن سوپای موسڵ زیاتر بۆ بەرزکردنەوەی ورەی بەرگرییکارانی شاری موسڵ بوو[٧٨٦].

لە راستیدا پێشرەوییە سەربازییەکانی نادرشا دژ بەدەوڵەتی **عوسمانی** بەئاراستەی ویلایەتەکانی رۆژهەلات، پشێوی و ئالۆزییەکی گەورەی نایەوە لەناو پایتەختی دەوڵەتی **عوسمانی** بەتایبەت لەنێوان سەربازان و بێکاران و سەندیکا پیشەییەکان، کە هەوڵدرا بۆ ئە**نجا**مدانی شۆرش و **راپەرین**، لە رێگەی بلاوکردنەوەی ریکلام لەشەقام و بازارەکانی ئیستانبول،بەڵام لەلایەن دەسەلاتەوە توانرا ئەو دەنگانە کپ بکرێت، سەرەرای ئەوەش دەسەلاتدارانی **عوسمانی** سەبارەت بەپێشرەوییەکانی نادرشا مەترسییەکانیان نەدەشاردەوە، بۆیە خۆیان بۆ هەر پەرچەکردارێك ئامادە کرد، ئەویش ناردنی سوپا بۆ ئەو شوێنانەی کە چاوەروانی بەرەنگاربوونەوەی لێدەکرا لەگەڵ سوپای ئێران[٧٨٧].

هەڵویستی دەوڵەتی **عوسمانی** بەرامبەر ئەو رووداوە گەورەیەی رووبەرووی شاری موسڵ دەبویەوە تەنیا برێتی بوو لەنواندنی هەڵوێستێکی زۆر لاواز، وەك ناردنی سوپایەکی دوو هەزار سەربازی بە**سەرکردایەتیی** (حوسێن پاشا قازوقچی ) والی حەلەب وەك پالپشتییەك بۆ والی موسڵ، هەروەها ناردنی بری ٥٠٠ هەزار (قرش) لەلایەن سولتانی **عوسمانی** وەك یارمەتی و کۆمەکی مادی بۆ شاری موسڵ[٧٨٨].

لەو بارودۆخەدا شێخی ئیسلام هەڵسا بەناردنی فتوایەك بۆ شاری موسڵ کە تێیدا ئاماژەکرابوو بەوەی کەهەر جەنگاوەرێکی موسڵ بکوژرێت شەهیدە، لە بەرانبەریشدا ئەو جەنگاوەرانەی رووبەرووی هەڵمەتەکەی نادرشا دەبنەوە ئەوە خۆبەختکەرن (**مجاهد**) لە پێناو خودا، بەڵام ئەم فتوایە لەلایەن دانیشتووان شاری موسڵ بەگاڵتەجارییەوە

---

(٧٨٦) سهيل قاشا، الموصل فی..، ص٦٢.

**(٧٨٧). خليل على مراد، حصار الموصل (١١٥٦ه / ١٧٤٣م) الأصداء والنتائج، بحث مقدم الى ندوة ((حصار الموصل و انتصار العراقيين على نادر شاه ١١٥٦ه / ١٧٤٣م)) التى نظمتها وزارة الثقافة والاعلام في رحاب جامعة الموصل للمدة ٢٣ -٢٥ تشرين الاول ١٩٩٣م لمناسبة مرور ٢٥٠ سنة على الحصار، ص ص٢-٣. (نسخة بحوزة كاتب البحث)**

(٧٨٨) سعيد الديوەچی، المصدر السابق، ص٤٧.

سەیرکرا، چونکە دەیانگوت (ئەگەر تۆ راست دەکەی، لەگەڵمان بووەستە، تاکو یەکێك لەو دوو چاکەیەت بەرکەوێت)[٧٨٩].

دوای ئەوەی نادرشا دڵنیابوو لەوەی، کە خەڵکی موسڵ بڕیاری بەرگرییکردنیان داوە لە شارەکە، بۆیە دوای چوار ڕۆژ لە ڕووداوەکەی یارمچە بە**سەرکردایەتیی** کردنی نێزیکەی ١٧٠هەزار سەرباز پێشڕەوی کرد بەئاراستەی شاری موسڵ، پاش دروستکردنی دوو پرد لەسەر ڕووباری **دیجلە**[٧٩٠]، بەر لە گەیشتنی بەشاری موسڵ، نادرشا لە پێشڕەوییەکەیدا گەیشتە قەرەقوش، بەڵام خەڵکەکە شارۆچکەکەیان چۆڵکردبوو، لەسەر بانگەوازی والی موسڵ ڕوویان کردبووە شاری موسڵ، تەنیا هەشتا کەسی تێدا مایەوە بەمەبەستی پاسەوانی و پارێزگاریکردن لە شارەکە، بەڵام دوای دەستگیرکردنیان لەلایەن سوپای ئێران، کەسێکیان لێ دەکوژرێت[٧٩١].

لەلایەکی دیکەوە نادرشا لە پێشڕەوییەکانی بەردەوام بوو،دەستی گرت بەسەر هەموو ناوچەکان بەبێ جیاوازیکردن لەنێوان مەسیحی و موسڵمانان بەشێوەیەك لە سەرەتادا دەستیان گرت بەسەر کرملیس[٧٩٢]، بەرتلە[٧٩٣]، تەلکیف[٧٩٤]، گوندی

---

(٧٨٩) المصدر نفسه، ص٤٧.

(٧٩٠) عباس العزاوي، المصدر السابق، **الجزء** الخامس، ص٢٦٧ " **محمد** حسين قدوسی، منبع پيشين، ص ٢٧٥. لەو بارەیەوە لەنێوان مێژوونووسان بۆچوونی جیاواز هەیە سەبارەت بەژمارەی سوپای ئێران لە هەڵمەتەکەیان بەئاراستەی شاری موسڵ، لەوانە محەمەد سەعید فرائچی زادە ژمارەی سوپای ئێران بە ٢٠٠ هەزار سەرباز مەزندە کردووە، کەچی لونکریك ئاماژە بە ٣٠٠ هەزار سەرباز دەکات. **محمد سعيد فرائضجى** زادە، **المصدر السابق، ص١٣٨٥ " ستيفن هيمسلي لونكريك، المصدر السابق، ص١٨٣.**

(٧٩١) **سهيل قاشا، حملات نادر شا على العراق في الوثائق السريانية، مجلة (كاروان)، القسم الثاني، العدد(٧٥)، اربيل، ايار(١٩٨٩م)، ص١٥٣.** خەڵکێکی زۆر لە دانیشتووانی دەوروبەری موسڵ لە موسڵمان و مەسیحی و ئێزیدی ڕوویانکردبووە ناو شاری موسڵ بەر لە هەڵمەتەکەی نادرشا. روبرت دبليو.اولسن، المصدر السابق، ص ٢٨٠.

(٧٩٢) گوندێکە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی موسڵ بەدووری ١٦ میل . عماد عبدالسلام **رؤوف**، الموصل فی العهد **العثماني**..، ص١٠٧.

(٧٩٣) شارۆکەیەکە لە ڕۆژهەڵاتی موسڵ، دانیشتووانەکەی سریانین خەڵکەکەی بەزمانی ئارامی کۆن قسان دەکەن، چەندین کەسایەتیی دیاری مێژووی کڵێسای سریانی تێدا هەڵکەوتووە لەوانە یەعقوب بەرتلی، هەروەها ئەم گوندە بەدێرە کۆنەکانی بەناوبانگە. **سهيل قاشا، حملات نادر شا..، القسم الثاني، ص١٥٦.**

ئەلقوش[٧٩٥]، مەزارگەی شێخ عادی لە شێخان، کە چەندان کاری توندوتیژی و کاولکارییان تێدا ئەنجامدا، لەگەڵ کۆیلەکردنی چەندین ژن و منداڵ[٧٩٦].

شیاوی باسکردنە دوای ئەوەی نادرشا گەیشتە شاری موسڵ، بڕیاری ئابڵۆقەدانی شارەکەیدا لە یەکەمین هەنگاویدا بڕیاری دروستکردنی دوازدە تاوەریدا لە شێوەی گردۆڵکەی بەرز، پێکهاتوو لە خۆڵ و بەرد بەمەبەستی دانانی تۆپە ئاگرینەکانی لە بەرامبەر ئەو دوازدە تاوەرە، کە لە شاری موسڵدا هەبوون، دوای تەواوکردنی تاوەرەکان هەڵسا بەدانانی تۆپە ئاگرینەکان، کە بریتی بوون لە١٦٠ تۆپی قورس و ٢٣٠ هاوەن[٧٩٧]، هەروەها سوپای ئێران بەشێوەیەکی گشتیی چاویان خستبووە سەر باکوور و ڕۆژئاوای شاری موسڵ[٧٩٨].

لەلایەکی دیکەوە بەر لەئەنجامدانی هەر کردەیەکی سەربازی لەلایەن نادرشا دژ بەشاری موسڵ، جاریکی دیکە نێردەی تایبەتی خۆی ناردە لای والی موسڵ، داوای لێکردن ملکەچی خۆیان ڕابگەیەنن و شارەکە ڕادەستی سوپای ئێران بکەن، هەروەها ئاگەداری کردنەوە لە سزای بەرگرییەکانیان[٧٩٩]، بەڵام لەلایەن حوسێن پاشا جەلیلی بەتەواوەتی داواکارییەکەی نادرشا ڕەتکرایەوە و جەختی لەسەر بەرگرییکردن کردەوە، لە

---

(٧٩٤) لە کۆنترین و گەورەترین گوندەکانی شاری موسڵە، بەدووری ٩ میل و دەکەوێتە ناو دەشتی موسڵ، لە سەدەی هەژدەیەم ناوی تەلکیف بەتەل کیفا هاتووە، لە سەردەمی دەسەڵاتدارییەتی عوسمانی تەلکیف وەقف بووە بۆ مزگەوتی جەرجیس پێغەمبەر لە موسڵ. عماد عبدالسلام **رؤوف**، الموصل في العهد **العثماني**..، ص ص٢٣-٢٤.

(٧٩٥) شارۆکەیەکە لەباکوری موسڵ بەدووری ٥٠کم .

(٧٩٦) مەزارگەی شێخ عادی، کە مەزارێکی تایبەتە بەئێزیدییەکانی عێراق. **سهيل قاشا، حملات نادر شا..، القسم الثاني، ص١٥٦.**

(٧٩٧) عماد عبدالسلام **رؤوف**، الموصل في العهد **العثماني**..، ص١٠٧ "

Yilmaz Oztuna, Buyuk Turkiy Tarihi(Istanbul – 1983) Cilt.6, S330.

(٧٩٨) قورسایی هێزەکانی ئێران زیاتر لەسەر باکور و ڕۆژئاوای شارەکە بوو، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ڕووباری دیجلە، کە دەکەویتە ڕۆژهەڵاتی شارەکە و زەوییەکەی نزمترە لەب ەرەی ڕۆژئاوا، هەروەها بوونی قەڵای باشتابیا، کە زاڵ دەبێت بەسەر دەشتەکە لە بەرەی ڕۆژهەڵات، کە بارەگەی سەرکردایەتیی موسڵی تێدابوو، هەرچی بەشی باشوری لە کەناری ڕۆژئاوا، دەکەوێتە ئیچ قەلعە بارەگەیەکی ئینکشاری تێدابوو لەگەڵ هێزێکی تۆپخانە، زاڵبوون بەسەر دەشتی ڕۆژهەڵات لەسەر ڕووباری دیجلە. سعید الديوەچی، المصدر السابق، ص٤٩.

(٧٩٩) **محمد علي بن محمد التبريزي**، منبع پیشین، ص٢٢٢.

پەیامێکیدا ئەوە دووپاتدەکاتەوە و دەڵێت (نێوانی ئێمە و تۆ تەنیا شمشێرە، ئەگەر هەر نێردەیەکی دیکە بنێریت، ئەوە لاشەکەی بەبێ سەر بۆت ڕەوانە دەکەینەوە)[٨٠٠].

دوا بەدوای سەرنەکەوتنی هەوڵە دیپلۆماتییەکان، هێزەکانی نادرشا لە **٢٥** ئەیلوول **١٧٤٣**ز دەستیان کرد بەتۆپبارانکردنی شارەکە بۆماوەی هەشت ڕۆژ بەبێ وەستان[٨٠١]، بۆ ئەم مەبەستە یەکێك لە مێژوونووسانی موسڵ پەسنی ئەو بارودۆخە دەکات و دەڵێت "تۆپەکان لە ڕۆژدا وەك باران دەبارین، بەشەویش وەك ئەستێرەکان پەرتەوازە دەبوون لە قولایی ئاسمان:، بەڵام ئەم کارەی نادرشا کاریگەریی لەسەر توانا و وورەی بەرگرییکاران لە شاری موسڵ دروست نەکرد[٨٠٢].

نادرشا گۆڕانکاریی لە پلانە سەربازییەکەی ئەنجامدا، بەتایبەت دوای ئەوەی شاری موسڵ بەرگری توندیان نواند لە بەرامبەر هەڕەشەکانی، بۆیە سەرەتا بارەگەی **سەرکردایەتیی** لە یارمچە بۆ شوێنیکی نێزیك شاری موسڵ گواستەوە[٨٠٣]، هەروەها پاش ئەوەی گەیشتە ئەو بڕوایەی، کە تۆپبارانکردنەکە هیچ سوودێکی نابێت، بۆیە بڕیاریدا جەخت لەسەر خاڵێکی دیاریکراو بکرێتەوە لەکاتی بۆردومانەکان، بەمەبەستی دروستکردنی کونێك لە شوورای شارەکە،بۆ ئەم مەبەستە تاوەری باش تابیە[٨٠٤]کرایە ئامانج[٨٠٥].

---

(٨٠٠) سليمان صائغ، المصدر السابق، ص٢٨٣.

(٨٠١) **ياسين بن خيرالله الخطيب العمري، المصدر السابق، ص١٨٢**. لەبارەی بۆردومانکردنکردنی شاری موسڵ لە دەستپێکی گەمارۆکە شێخ ڕەسول کەرکوکلی پێی وایە حەوت ڕۆژان بەردەوام بووە، بەڵام سلێمان سائیغ سێ ڕۆژی بۆ داناوە. الشيخ رسول الكركوكلي، المصدر السابق، ص٥٠ " سليمان صائغ، المصدر السابق، ص٢٨٤.

(٨٠٢) سليمان صائغ، المصدر السابق، ص٢٨٤.

(٨٠٣) **علاء** موسى **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص١٩٢. سەبارەت بەو شوێنەی کە نادرشا لە دوای یارمچە کردیە بارەگەی سەرەکیی سوپای ئێران بڕێتی بوو لە گوندی قازییە کە لە بەرزایەکدا بوو دەکەوتە بەرامبەر موسڵ لە بەرەی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە، نادرشا ئامانجی لە هەڵبژاردنی ئەو شوێنە زیاتر بۆ سەرپەرشتیکردنی جەنگەکە بوو لەنێزیکەوە، هەروەها هەر لەو شوێنەوە توانی پردێك چێ بکات بۆ مەبەستی گواستنەوەی هێزەکەی لەو شوێنەوە بۆ موسڵ. سعيد الديوەچي، المصدر السابق، ص٥١.

(٨٠٤) دەکەوێتە باکوری شاری موسڵ، بارەگەی سەرەکیی حوسێن پاشا جەلیلی والی موسڵ بوو. علی شاکرعلی، المصدر السابق، ص٢٠٠.

(٨٠٥) المصدر نفسه، ص٢٠٠.

دوا بەدوای جێبەجێکردنی پلانە سەربازییەکەی نادرشا، بەشێکی تاوەرەکەی باش تابیە تووشی دارِمان هات بەهۆی بۆردومانە توندەکەی سوپای ئێران، دواتر بەهۆی دروستبوونی ئەو بۆشاییە لە شوورای شارەکە بەشێك لە سەربازانی ئێران، توانیان خۆیان بخزێننە ناو شارەکە، بەڵام لەلایەن سەربازانی موسڵەوە بەرەنگاری یەکدیی بوونەوە، ئاکامەکەی بەشکستی سوپای ئێران تەواو بوو[٨٠٦]، هەروەها رۆڵی والی موسڵ لە بەشداریەکانی لەگەڵ بەرگرییکاران و بەرزکردنەوەی ورەیان و هەوڵدانی زۆری بۆ چاکردنەوەی بەشە ڕووخاوەکەی شوورای شارەکە، کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر دەروونی بەرگرییکاران و خەڵکە گەمارۆدراوەکەی شارەکە چێ کردبوو[٨٠٧].

نادرشا دوای ئەوەی هەستی کرد، کە ناتوانێ شارەکە بەئاسانی داگیر بکات، بیری لە پلانێکی سەربازی دیکە کردەوە، ئەویش قۆستنەوەی کات بوو بۆ **بەرژەوەندییەکانی** خۆی بۆ ئەم مەبەستە گەمارۆی سەر شارەکەی توندتر کرد، هەروەها هەڵسا بەبڕینی ئاو لە شارەکە،ئەویش لە رێگەی گۆڕینی ڕێڕەوی جۆگەیەکی ئاوی دیجلە، کە سەرچاوەی سەرەکیی ئاوی شاری موسڵ بوو، بەمەش توانی ناخۆشی و قورسایی زۆر بخاتە سەر شانی دانیشتووانی موسڵ، جگە لەمەش هەموو ئەو رێگەیانەی بڕی کە بەشارەکەوە بەستراون[٨٠٨].

دیارە ئەو پلانەش تا ڕادەیەك ئەنجامەکانی بەدڵی نادرشا نەبوو، بۆیە هەڵسا بەپیادەکردنی شێوازیکی دیکەی سەربازی بۆ بڕینی شوورای شارەکە، ئەویش لە رێگەی دوو نەخشەی سەربازی جێبەجێ کرا، یەکیکیان برێتی بوو لە دانانی لوغم لەژێر شوورای شارەکە، بەشێوەیەك دوو دانەیان لە بەشی باکووری شار دابندرێت، دووانی دیکەش لە ڕۆژئاوای شارەکە بەرامبەر مزگەوتی قەزیب ئەلبان، کە دەکەوێتە بەرانبەر دەرگەی سنجار[٨٠٩].

سەبارەت بەنەخشەی دووەم برێتی بوو لە ئامادەکردنی هێزێکی تایبەت، پاش تەقینەوەی لوغمەکان ئەرکی ئەنجامدانی هێرشی لەناکاویان پێ راسپێردرابوو بۆ لایەکی شووراکە، لەگەڵ بەکارهێنانی پەیژەی تایبەتی بۆ چوونە ناو شار، بەمەش گرانییەکی

---

(٨٠٦) عماد عبدالسلام **رؤوف**، الموصل فی العهد **العثمانی**..، ص١٠٨.

(٨٠٧) ستيڤن هيمسلى لونگريك، المصدر السابق، ص١٨٥.

(٨٠٨) على شاكرعلى، المصدر السابق، ص٢٠١.

(٨٠٩) سعيد الديوەچى، المصدر السابق، ص٥١.

زۆر دەخەنە سەر بەرگرییکارانی موسڵ، کە بتوانن لە دوو بەرە بەرەنگاری هێزەکانی ئێران ببنەوە[٨١٠].

پلانەکەی نادرشا بۆ گرتنی شاری موسڵ شکستی هێنا، چونکە یەکێك لە لوغمەکان کە چاندرا بوو، لەژێر شوورای شارەکە تەقییەوە، زیانی گەورەی گەیاندە هێزەکانی ئێران[٨١١]، هەروەها دوو لوغمەکەی کە بەرامبەر دەرگەی سنجار دانرابوون، بەهۆی شێداریەوە هیچ زیانیکی ئەوتۆی نەبوو، کە شایەنی باسکردن بێت، بۆیە سوپای ئێران دووبارە بەناچاری پاشەکشەیان کرد، بەبێ ئەوەی هیچ دەسکەوتێکیان هەبێت[٨١٢].

جێگەی ئاماژە پێکردنە نادرشا دوای سەرنەکەوتنی پلانەکانی بۆ گرتنی شاری موسڵ، تا ماوەیەك وازی لە هێرشەکانی هێنا بۆ سەر شارەکە، بەڵام گەمارۆکەی توندترکرد، دوای ئەوە بارەگەی سەرەکیی جێهێشت و لەگەڵ بەشێك لە هێزەکەی ڕوویکردە گوندەکانی دەوروبەری موسڵ وکرداری کاولکاری تێدا ئەنجامدا، بەشێوەیەك نێزیکەی ٣٠٠ گوندی وێرانکرد، دواتر هەڵمەتەکانی بەئاراستەی دیاربەکر دەست پێکرد، هەریەکە لە زاخۆ و جەزیرەی ئیبن عومەری کاولکرد، لەوێشەوە گەڕایەوە بارەگەی سەرەکیی بۆ جێبەجێکردن و دارشتنی پلانێکی دیکە بۆ گرتنی شاری موسڵ[٨١٣].

لەو کاتەی نادرشا سەرقاڵی جەنگ بوو لەناو خاکی دەوڵەتی عوسمانی چەندین **ڕاپەڕین** و هەڵگەڕانەوە لەناو خاکی ئێران ڕوویاندا دژ بەدەسەڵاتی نادرشا، وەك هەڵگەڕانەوەی محەمەد تەقی خان فەرمانڕەوای فارس و سەرکردەی گشتیی هێزی دەریایی ئێران، هەروەها **ڕاپەڕینە**کەی محەمەد عەلی رەفسنجانی لە فارس[٨١٤] و سام

---

(٨١٠) **سهيل قاشا، حملات نادر شا..، القسم الثانى، ص١٥٤.**

(٨١١) **ياسين بن خيرالله الخطيب العمرى، المصدر السابق، ص١٨٢.**

(٨١٢) عبدالجبار محمود السامرائى، المصدر السابق، ص٢٤ " على شاكرعلى، المصدر السابق، ص٢٠١.

(٨١٣) عماد عبدالسلام **رؤوف**، الموصل فى العهد **العثمانى**..، ص١٠٨.

(٨١٤) محەمەد عەلی رەفسنجانی کەسێکی جووتیار و خەڵکی رەفسنجانە، لە ساڵی ١٧٣٠ز لە ناوچەی شوشتر شۆڕشێکی هەڵگیرساند، بەڵام لەلایەن فەرمانڕەوای شارەکە سەرکوتکرا، لە ئەنجامدا ڕوویکردە حەوێزە، دواتر لەوێشەوە چووە ژێر باڵی دەوڵەتی عوسمانی، بەیارمەتی عوس**مانییە**کان لە ناوچەی قەفقاز چەندین چالاکی نواند و لەلایەن خودی ئەحمەد پاشا جەمال ئۆغلۆ فەرمانڕەوای قارس پاڵپشتی کراوە، لەلایەکی دیکەوە ناوەکەی گۆڕی بۆ سەفی میرزا و خۆی وەك یەکێك لە کوڕەکانی شا حوسێن ناساند. امیر

میرزا لە شێروان [٨١٥]، کاریگەریی ڕاستەوخۆیان کردە سەر لەشکرکێشییەکەی نادرشا لە عێراق[٨١٦].

لەلایەکی دیکەوە نێردەیەك لە تورکستانەوە گەیشتە بارەگای نادرشا لە دەوروبەری موسڵ،پێیان ڕاگەیاند دوای ئەوەی مانگو خاقان پاشای چین ئاگاداری سەرکەوتنەکانی نادرشا کراوەتەوە، بڕیارێکی گشتاندووە بۆ هەموو هەرێمەکان، داوای لێکردوون هێزەکانیان ئامادە بکەن و ئامادەکاری تەواو بکەن بۆ هەر ڕووبەڕووبوونەوەیەك لەگەڵ سوپای ئێران[٨١٧] دیارە نادرشا نەخشەی هەبووە دوای تەواوبوونی جەنگ لەگەڵ عوسمانی هێزەکەی بەئاراستەی چین تاوبدات[٨١٨].

لە ئەنجامی ئەو بارودۆخەی، کە ڕووبەڕووی نادرشا بۆوە، لەلایەك بەرگرییەکانی شاری موسڵ، لەلایەکی دیکەوە هەڵگەڕانەوەکانی ناوەخۆیی لە ئێران بوونە هۆکارێك کە نادرشا ڕوو لە ئاشتی بکات ودەست هەڵ بگرێت لە گەمارۆدانەکەی سەر شاری موسڵ،بۆ ئەم مەبەستە داوای لە حوسێن پاشا جەلیلی کرد، کە شاندیك بنێریت بۆ بارەگەی سەرەکیی نادرشا بەمەبەستی ئەنجامدانی دانوستاندن لەسەر ئاشتی[٨١٩].

---

اهنگران، جایگاه قفقاز در سیاست نادرشاه، فصلنامه تاریخ **روابط** خارجی، شماره(٣٧)، تهران، زمستان ١٣٨٧هـ.ش، ص ص٤٤-٤٥.

(٨١٥) لە سەردەمی نادرشا، فەرمانڕەوایەتی ئازەربیجان درابوو بە ئیبراهیمی برای، دەنگۆی ئەوە بڵاوبۆوە کە گوایە کەسێك بانگەشەی ئەوە دەکات کوڕی شا حوسێنی سەفەوییە، بۆیە فەرمانڕەوای ئازەربیجان بڕیاری دەستگیرکردنیدا، بەڵام سام میرزا توانی لەو شوێنە ڕابکات و بچێتە داغستان، لەوێش لەلایەن لزگییەکان داڵدە درا و پاڵپشتیان کرد. همان منبع، ص٤٥.

(٨١٦) حبیب الله شاملوئی، منبع پیشین، ص٧١٨.

(٨١٧) محمد **کاظم** مروی وزیر مرو، جلد سوم، ص٩١١ " لکهارت، نادرشا، ص ص٢٩١-٢٩٢.

(٨١٨) محمد **کاظم** مروی وزیر مرو، جلد سوم، ص٩١١.

(٨١٩) هەندێك لە سەرچاوە فارسییەکان باس لەوە دەکەن داواکردنی ئاشتەوایی لەلایەن نادرشا نەبووە، **بگرە** لەلایەن خەڵکی موسڵەوە ئەم داوایە ئاراستەی نادرشا کراوە، چونکە توندی گەمارۆدانەکە و بۆردومانکردنی بەردەوام بارودۆخی خەڵکی لەناو شاری موسڵ بەتەواوەتی هەرەسان کردبوو. محمد حسین میمندی نژاد، منبع پیشین، ص ٨١٦ " مهدی خان استرابادی، دره نادره، ص٦٣١ .

حوسێن پاشا جەلیلی والی موسڵ هەر یەکە لە عەلی ئەفەندی قازی موسڵ و قەرە مستەفا لە کەسایەتییە دیارەکانی ئەو شارە وەك نێردەی تایبەتی خەڵکی موسڵ ناردە بارەگەی سەرەکیی سوپای ئێران لە قازییە، لەوێشەوە لەلایەن خودی نادرشا زۆر بەگەرمی پێشوازیان لێ کرا[٨٢٠]، پێی ڕاگەیاندن مەبەستی هەڵمەتەکەی بۆ سەر شاری موسڵ تەنیا بۆ نێزیککردنەوەی ئاینزای ئەهلی سونە و شیعەیە[٨٢١]، پاشان لە**٢٢** تشرینی یەکەم **١٧٤٣**ز نادرشا گەڕایەوە کەرکوك، دوای ئەوەی لەگەڵ خەڵکی موسڵ ئاشتی نامەی بەست [٨٢٢]،کە بۆ ماوەی چل ڕۆژ گەمارۆدانی ئەو شارە لەلایەن هێزەکانی ئێرانەوە بەردەوام بوو[٨٢٣]، تێیدا نێزیکەی **٣٠** هەزار کەس بوونە قوربانی[٨٢٤].

بەرگرییەکانی شاری موسڵ لە بەرامبەر سوپای ئێران توانی دەوڵەتی عوسمانی لە کێشە ناوەخۆییەکان و هەڵگیرساندنی شۆڕش و مەترسییەکانی رزگار بکات، بۆ ئەم مەبەستە هەڵسوڕاوی بەریتانی لە ئیستانبول ولیەم ئەسپینویل W. Aspinwell لەو بارەیەوە دەڵێت (بەڕزگاربوونی شاری موسڵ لە گەمارۆدان، ئەو حکوومەتە "دەوڵەتی عوسمانی" لە ناخۆشی و هەڕەشە زۆر ترسناکەکان ڕزگاری بوو، وایان هەست دەکرد هەموو شتێکیان لەدەستداوە، بەڵام بەگەیشتنی ئەو هەواڵە هەموو شتەکان و مرۆڤەکان گۆڕانکارییان بەسەردا هات و هەمووی بەیەکەوە ئارامی باڵی کێشا بەسەریاندا)[٨٢٥].

نادرشا لە شاری کەرکوك جووڵەی کرد بەئاراستەی شاری بەغدا، کە ترس و دڵەڕاوکێی زۆری لای دانیشتووانی ئەو شارە دروستکرد[٨٢٦]. لەهەمان کاتدا ئەحمەد پاشا والی بەغدا ئامادەکارییەکانی ئەنجامدا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەر گەمارۆدانێك

---

(٨٢٠) **یاسین بن خیرالله الخطیب العمری، المصدر السابق، ص ص١٨٢-١٨٣ .**

(٨٢١) **علاء** موسى **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص ١٩٤.

(٨٢٢) لكهارت، نادرشا، ص٢٩٢.

(٨٢٣) گەمارۆدانی شاری موسڵ لەلایەن سوپای ئێران لە ١٤ی ئەیلول دەستی پێکرد تاکو ٢٠ی تشرینی یەکەمی ١٧٤٣ز بەردەوام بوو.

Tony Jaques, Dictionary of Battles and Sieges(U.S.A – Greenwood Press- 2007), P.689.

)824(J. Von Hammer, A.G.E, SS.427-428.

(٨٢٥) **خليل علي مراد، المصدر السابق، ص٨.**

(٨٢٦) **محمد بهجة الاثري، المصدر السابق، ص٨٦.**

لەلایەن هێزەکانی ئێران، بەڵام نادرشا هەر بەگەیشتنی بەکازمییە نێردەیەکی تایبەتی ڕەوانەی بەغدا کرد، بۆ ئەوەی ئەحمەد پاشا دڵنیا بکاتەوە، کە ئامادەیە بۆ ئاشتی، بۆ ئەم مەبەستەش ئاڵوگۆڕی شاندەکان دەستی پێکرد[٨٢٧]، دواتر دەستی کرد بەسەردانی کردنی مەزارەکانی هەر یەکە لە موسا کازم و محەمەد جەواد و ئەبو حەنیفەی نوعمان (ر.خ)، پاشان لە بەغداوە ڕوویکردە شاری نەجەف لەوێش سەردانی مەزاری عەلی کوڕی ئەبوتالب (ر.خ)ی کرد[٨٢٨].

## ٣ ـ گەمارۆدانی شاری بەسرە لەلایەن هێزەکانی ئێران ١٧٤٣ز

ئەو کاتەی نادرشا سەرقاڵی گەمارۆی شاری موسڵ بوو، هێزێکی دیکەی ئێرانی **بەسەرکردایەتیی** قۆچە خان شەیخانلو بەفەرمانی نادرشا بۆ داگیرکردنی بەسرە ناردرابوون، لە هەمان کاتدا لەلایەن خودی نادرشا داوا لە فەرمانڕەوایانی حەویزە و شوشتر و دیزفول کرا یارمەتی پێویست پێشکێش بەو سەرکردەیە بکەن[٨٢٩].

لە١٦ ی تەمووزی ١٧٤٣ز قۆچە خان شەیخانلو لەگەڵ هێزەکەی گەیشتە حەوێزە، هەر لەوێش نامەیەکی فەرمی بەناوی خۆی ئاراستەی رۆستەم ئاغای لێپرسراوی بەسرە (متسلم)[٨٣٠] کرد، داوای لێکرد شاری بەسرە ڕادەستی سوپای ئێران بکات[٨٣١]، بۆ ئەم مەبەستە رۆستەم ئاغا لەگەڵ کەسایەتییە دیارەکانی شاری بەسرە وەك شێخ دەروێش و شێخ ئیبراهیم و چەندانی دیکە، کۆبوونەوەیەکی ئەنجامدا لەبارەی ناوەرۆکی نامەکەی فەرماندەی سوپای ئێران، دوای چەند ڕۆژێك لە گفتوگۆکردن هەمووی لەسەر ئەوە

---

(٨٢٧) **علی الوردی، المصدر السابق**، ص١٣٣.

(٨٢٨) حسن کریم جاف، المصدر السابق، ص١٠٤.

(٨٢٩) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای..، ص٣٨٣.

(٨٣٠) لە ساڵی ١٧٣٧ شاری بەسرە بووە بەشێك لە ویلایەتی بەغدا، بۆیە ئەو کەسەی کاروباری سیاسی و کارگێڕی و ئابووری لەو شارە بەڕێوە دەبرد پۆستەکەی بریتی بوو لە جێگری والی بەغدا و پێی دەوترا (متسلم). **فاضل بیات، الدولة العثمانیة في المجال العربی، الطبعة الأولی، مرکز دراسات الوحدة العربیة، بیروت، ٢٠٠٧م، ص ٣٣٢.**

(٨٣١) عماد عبدالسلام، صمود البصره...، ص٢٦ . لەبارەی دەقی نامەکەی قوچەخان شەیخانلو بگەڕێوە بۆ پاشکۆی ژمارە(٦).

ڕێککەوتن کە داواکارییەکەی قوچەخان ڕەتدەکەنەوە و پارێزگاری لە شارەکەیان دەکەن بەهەر نرخێك بێت[٨٣٢].

دوا بەدوای ڕەتکردنەوەی داواکارییەکەی فەرماندەی سوپای ئێران، لەلایەن دانیشتووانی بەسرە، هێزەکانی ئێران، کە نێزیکەی دوازدە هەزار سەرباز دەبوون، بەفەرمانی قوچەخان شەیخانلو دەستیانکرد بەپەڕینەوە لە کەنارەواکانی ڕۆژئاوای شەتولعەرەب و لەئابی ١٧٤٣ز گەمارۆی شارەکەیاندا، هەروەها لە میانەی ئەو هەڵمەتەدا هەردوو هۆزی مونتەفق و بەنولام پێوەندییان کرد بەهێزەکانی ئێران، چونکە چەند ساڵێك ئەم دوو هۆزە لە شۆڕشکردن دابوون دژ بەدەسەڵاتی عوسمانی[٨٣٣].

مستر دووریل Mr.Dorril هەڵسوڕاوی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی English East India Company [٨٣٤] لە بەسرە لەو بارودۆخەی کە باڵی کێشا بەسەر شاری بەسرە،بڕیاریدا بەزووترین کات کەشتییەکانیان ئاوەکانی شەتولعەرەب جێ بهێڵن

---

(٨٣٢) المصدر نفسه، ص ٢٦. لەبارەی دەقی وەڵامی خەڵکی بەسرە بۆ قوچەخان شەیخانلو بگەڕێوە بۆ پاشکۆی ژمارە(٧).

(٨٣٣) **علاء** موسى **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...، ص ١٩٥.** سەبارەت بەبارودۆخی شاری بەسرە لەکاتی گەمارۆدانی لەلایەن سوپای ئێران، هەڵسوڕاوی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی لە بەسرە لەبارەی خراپی ڕەوشی ئابووری تێکچوونی بازرگانی دەڵێت: "لێرە دراو بە ئاسانی دەست ناکەوێت تا ڕادەی ئەوەی ناتواندرێت خەرجییەکانی ڕۆژانەی هاووڵاتیان دابین بکرێت، هەروەها کەشتییەکان لەکاتی گەڕانەوەیان هیچ باری زێدەیان لەگەڵ نەهاتۆتەوە) .

Thabit A.J. Abdullah, Merchants, Mamluks and Murder: The Political Economy of Trade in Eighteenth Century Basra(Albany – State University of New York Press-2001), p.49.

(٨٣٤) کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی دامەزراندنەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ١٥٩٩/٩/٢٢ز کە لەلایەن بازرگانەکانی بەریتانیا پێشنیازکرا، دواتر لە١٦٠٠/١٢/٣١ز فەرمانی پاشایەتی بۆ دەرچوو، تێیدا دەسەڵات درا بەو کۆمپانیایە کە پاوانکارییە بازرگا**نییە**کان ئەنجام بدات لە هیندستان و ناوچەکانی دەوروبەری، لەلایەکی دیکەوە بەریتا**نییە**کان هەوڵیاندا کەنداو بخەنە ناو ئەو بازنەوە بەمەبەستی پارێزگاریکردن لە دەسەڵاتەکەیان لە هیندستان، لە ساڵی ١٦١٥ز هەر یەکە لە ریچارد ئیستیل و گرۆتەر توانیان بگەنە ئەسفەهان و فەرمانێك لە شا عەباسی گەورە وەربگرن بەپێدانی جیاوك و پێشوازیکردن لە نوێنەرانی بازرگانی ئینگلیزی، هەروەها ئەم کۆمپانیایە لە ساڵی ١٦٢٢ز یارمەتیدەری ئێرا**نییە**کان بوون لەدەرکردنی پورتوگالییەکان لە هورمز : محمد حسن العيدروس، **تاريخ الخليج العربي الحديث والمعاصر، الطبعة الثانية، عين للدراسات والبحوث الانسانية والاجتماعية، القاهرة، ١٩٩٨م، ص٣٢** " شواليه شاردن، منبع پيشين، ص١٩١٣.

و لێی نێزیك نەبنەوە، لە هەمان کاتدا خۆشی هەوڵیدا لە ڕێگەی کەشتییە تایبەتییەکەی (فرقاتە)[٨٣٥] لەوەشارە بڕوات، بەڵام لەلایەن دەریاوانە عارەبەکان توانیان ڕێگەی پێ بگرن و بیگەڕێننەوە، دواتر مستەر دووریل بە فەرمانی ڕۆستەم ئاغا دەستگیرکرا، پاش ئەوەی ئامادە نەبوو کەشتییەکەیان پێ بدات[٨٣٦].

لەلایەکی دیکەوە عەبدوڵا کوڕی فەرەج فەرمانڕەوای حەوێزە لەکاتی گەمارۆدانی شاری بەسرە لەلایەن سوپای ئێرانەوە، نامەیەکی ئاراستەی کاربەدەستانی بەسرە کرد، تێیدا داوای ملکەچبوونی لێکردن و ئامۆژگاریکردن بەوەی دەست هەڵگرن لەبەرگرییکردن، لەهەمان کاتدا ئاگەداری کردنەوە لەو نەهامەتی و دەردەسەرییەی کە تووشی دەبنەوە بەهۆی بەرگریی کردنەکەیان، بەڵام جارێکی دیکە کاربەدەستانی بەسرە جەختیان کردەوە لەسەر پارێزگاریکردن لە شارەکەیان و داواکارییەکانیان ڕەتکردەوە[٨٣٧].

هەرچەندە هێزەکانی ئێران گەمارۆی شارەکەیان دابوو، بەڵام لەو ماوەیەدا نەیانتوانی هیچ چالاکییەکی بەرچاو بنوێنن، سەرەڕای زۆری ژمارەی سەربازانی هێزی ئێران، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ بەردەست نەبوونی تۆپی ئاگرین بۆ بڕینی شووورای شارەکە، هەرچەندە داوایان لەنادرشا کرد بۆ ئەم مەبەستە، بەڵام لەکاتی خۆیدا پێداویستییەکان نەگەیشتن[٨٣٨].

نەبوونی تۆپی ئاگرین و نەگەیشتنی لەکاتی خۆیدا،دەرفەتێکی باش بوو، بۆ بەرگرییکارانی بەسرە، کە بۆماوەیەك خۆیان بگرن بەرامبەر بەهێرشەکانی سوپای ئێران، بەڵام بەگەیشتنی تۆپە ئاگرینەکان لە یازدەیەمین ڕۆژی کۆتایی گەمارۆدانەکە، بۆردومانکردنی شارەکە دەستی پێکرد،کە شەو و ڕۆژ بەردەوام بوو، چەند شوێنیکی گرینگ کەوتنە بەر ڕەحمەتی تۆپەکانی ئێران لەناو شاری بەسرە، لەوانە کونسوڵخانەی فەرەنسا،لەگەڵ ئەنجامدانی هێرشێکی بەربڵاو بۆ سەر شارەکە، بەڵام سەرکەوتنیان

---

(٨٣٥) فرقاتە وشەیەکی ئیتاڵییە (**fregatta**) جۆرێکە لەکەشتی بچووکی جەنگی. **علاء** موسى **کاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص ١٩٥.

(٨٣٦) علي شاكرعلي، المصدر السابق، ص٢٠٤ " لكهارت، نادرشا، ص ص٢٩٦-٢٩٧.

(٨٣٧) لەبارەی دەقی نامەکەی فەرمانڕەوای حەوێزە بۆ کاربەدەستانی بەسرە، هەروەها لەبارەی وەڵامی خەڵکی بەسرە بگەڕێوە بۆ: عماد عبدالسلام، صمود البصره...، ص ص٢٩-٣٢ .

(٨٣٨) لكهارت، نادرشا، ص٢٩٧.

بەدەست نەهێنا بەهۆی نەبوونی هیچ پێوەندییەك لەنێوان هێزی دەریایی و هێزی وشکانی[٨٣٩].

دوا بەدوای ئەم ڕووداوە، هێزەکانی ئێران ڕوویانکردە دەوروبەری شاری بەسرە، چەندین کرداری کوشتن و بڕین و تالآنکردنیان ئەنجامدا، بەتایبەت لە گوندی سەبیلیات و شارۆچکەی زوبیر[٨٤٠]، هەروەها لە کانوونی یەکەم **١٧٤٣**ز هێزەکانی ئێران کۆتا هێرشیان ئەنجامدا، بۆ ئەم مەبەستە زۆر بەتوندی بۆردومانی شاری (بەسرە)یان کرد، دواتر هێرشێکی بەربلاویان ئەنجامدا، بەلآم لەکۆتایدا هەوڵەکانیان بێ هودەبوو، چونکە لەلایەن بەرگرییکارانی بەسرە بەرپەرچ درانەوە و نەیانتوانی شارەکە داگیر بکەن[٨٤١].

لەو کاتەی شاری بەسرە ڕووبەڕووی هێرشە یەك لەدوای یەکەکانی سوپای ئێران دەبۆوە، فەرمانێکی بەپەلەی نادرشا لە٨ ی تشرینی دووەم **١٧٤٣**ز گەیاندرایە سەرکردەی هێزەکانی ئێران لە بەسرە،کە تێیدا داوای وەستانی جەنگ و هەڵگرتنی گەمارۆی سەر شاری بەسرەی کرد، دوای ئەم فەرمانە هێزەکانی ئێران لە**٢٧**ی هەمان مانگ دەستیانکرد بەپاشەکشەکردن لە شاری بەسرە بەئاراستەی حەوێزە، دوای ئەوەی ئەم هێزە زیاتر لەسێ مانگ گەمارۆی شاری (بەسرە)یان دابوو[٨٤٢].

دەکرێت بڵێین، هەرچەندە نادرشا هەوڵەکانی چڕکردەوە بۆ سەپاندنی داواکارییەکانی بەسەر دەوڵەتی عوسمانی لە ڕێگەی جەنگەوە، بەلآم دوای ئەوەی جەنگەکەی دەستپێکرد هیچ ئامانجێکی بەدی نەکرد، تەنیا ئەوە نەبێت جارێکی دیکە بگەڕێتەوە سەر مێزەکانی گفتوگۆ لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، لەلایەکی دیکەوە ئەنجامدنی ئەو جەنگە بەسەرەتای کۆتایی نادرشا دادەنرێت، چونکە چەندین **ڕاپەڕین** هەڵگەڕانەوە سەرتاسەری ئێرانی گرتەوە، بەرئەنجامەکەی بەکوژرانی نادرشا کۆتایی پێهات[٨٤٣]، سەرەڕای ئەوەش شکستخواردنی نادرشا لەگرتنی شاری موسڵ هیواکانی تێکشکاند، چونکە نادرشا لە

---

(٨٣٩) همان منبع، ص٢٩٨.

(٨٤٠) **علاء موسى كاظم نورس، الصراع العثماني – الفارسي واثره ....**، ص٦٥.

(٨٤١) عماد عبدالسلام، صمود البصره...، ص٢٧.

(٨٤٢) حاج ميرزا حسن حسينى فسائى منبع پيشين، ص٥٦٤ " **علاء** موسى **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ....**، ص ١٩٦.

(٨٤٣) ابراهيم خليل احمد، خليل على مراد، المصدر السابق، ص٥٦.

هەولّی ئەوەدا بوو دەسەلاّتی ئیمپراتۆریەکەی درێژ بکاتەوە بۆ ولاّتی شام و کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست، ئەم کارەشی لەوە سەرچاوەی گرتبوو کە وەك لاساییکەرەوەیەکی تەیموور لەنگ بێت[٨٤٤]، بۆیە لەنێوان سالاّنی ١٧٣٧- ١٧٤٠ توانی ئەفغانستان و هیندستان و ئاسیای ناوەڕاست بخاتە ژێر دەسەلاّتی خۆی، دواتریش فرەوانخوازییەکانی لە عێراق و ولاّتی شام و ئەنادۆلّ دەست پیّ بکات، بەلاّم شکستخواردنی لە گرتنی شاری موسلّ هیواکانی جێبەجیّ نەبوون.

---

(٨٤٤) **خليل علي مراد، المصدر السابق، ص٩.**

## تەوەری سێیەم:

## قووڵبوونەوەی کێشە ئاینزاییەکان و ڕێککەوتننامەی کرند ١٧٤٣ ـ ١٧٤٦

### أ – کۆنگرەی نەجەف:

دوای ئەوەی نادرشا لەگەڵ خەڵکی موسڵ پەیمانی ئاشتی بەست، ڕوویکردە شاری بەغدا، لەوێشەوە چوو بۆ شاری نەجەف[٨٤٥] بەمەبەستی زیارەتکردنی مەزاری عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ر.خ)، هەروەها بینینی ئەو گومەزە کە فەرمانی دا بوو بە زێڕ زاخاو بدرێت[٨٤٦]، پاشان نادرشا لەشاری نەجەف ڕوویکردە شاری کەربەلا، لەوێش نامەیەکی ئاراستەی ئەحمەد پاشای والی بەغدا کرد، تێیدا داوایکرد زانایەکی سونە ئاینزا ڕەوانەی کەربەلا بکات بۆ بەشداریکردن لە مونازەرەی زانایانی شیعە ئاینزا و نەهێشتنی ئەو تێڕوانینە خراپانەی نێوانیان[٨٤٧]، بۆ ئەم مەبەستە شێخ عەبدوڵا سویدی[٨٤٨] لەلایەن ئەحمەد پاشای والی بەغدا دەسنیشانکرا بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە[٨٤٩].

---

**علی الوردی، المصدر السابق**، ص١٣٣-١٣٤

(٨٤٦) **عبدالله بن الحسين السويدي العباسي، مؤتمر النجف:تعليق محب الدين الخطيب، مطبعة البصری، بغداد، بدون تاريخ، ص١٥** "

Abdurrahman Ates, A.G.E, S.100.

(٨٤٧) الشيخ رسول الكركوكلی، المصدر السابق، ص٥١ .

جێگەی ئاماژە پێکردنە نادرشا لە هەڵمەتەکەی بۆ سەر عێراق ژمارەیەکی زۆری زانایانی ئاینی لە ئێران و بەڵخ و بوخارا و ئەفغانستان لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، هەروەها هەر لە نەجەف داوای لە زانایانی ئاینی شیعە و سونە لە کەربەلا و حیلە و بەغدا و کازمییە کرد، بۆ ئامادەبوونیان، تاکو لە ڕێگەی ئەو نێزیکبوونەوەی نێوان زانایانی هەردوو ئاینزا سنوورێك بۆ یەکلایی کردنەوەی خاڵە جیاوازەکانی هەردوو ئاینزا بدۆزرێتەوە[٨٥٠].

لەلایەکی دیکەوە مێژوونووس عەلا نورس پێی وایە جەختکردنەوەی نادرشا لە بەستنی ئەو کۆنگرەیە و لەیەك نێزیکردنەوەی زانایانی شیعە ئاینزا و سونە ئاینزا لە ئەنجامی ئەو نسکۆیە بوو، کە لە هەڵمەتەکەی بۆ سەر شاری موسڵ دووچاری بۆوە[٨٥١]، بەڵام بەگوێرەی بۆچوونەکەی هانوی، کە جەختی لەسەر دەکاتەوە ئەو بیرۆکەیە مێژووییەکی پێشینەی هەیە و نەخشەی بۆ داڕێژراوە[٨٥٢].

---

(٨٤٨) ئەبو بەرەکات شێخ عەبدوڵا کوڕی حوسێن کوڕی مەرعی کوڕی ناسرەدین بەغدادیە، لە ساڵی ١١٠٤کۆچی ـ١٦٩٢ز لە گەڕەکی کەرخ لەدایکبووە، هەر لە تەمەنی منداڵی باوکی لەدەست داوە، لەلایەن مامەی دایکییە و پەروەردەکراوە، لای چەندین زانانی ئەو سەردەمە زانست و مەعریفەی وەرگرتووە، وەك ئەبوتەیب شێخ ئەحمەد بن ئەبی قاسم، شێخ محەمەد بن عەقیلە مەکی و شێخ محەمەد ئەفەندی موفتی حەنەفییە و چەندانی دیکە، ئەو زانایە لە ساڵی ١١٧٠کۆچی ـ١٧٥٧ز لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووە. ابو **الفضل** عابدینی، **معرفی الحجج القطعية لاتفاق الفرق الاسلامية** (نادرشاه وحدت اسلامی)، **مجله** اینه پژوهش، شماره (١١٢)، قم، مهروابان(١٣٨٧هـ.ش)، ص ص٩٠-٩١.

(٨٤٩) عباس العزاوي، المصدر السابق، **الجزء** الخامس، ص٢٩٦.

(٨٥٠) ابو **الفضل** عابدینی، **منبع** پیشین، ص ٨٩ " لە کەربەلا گەورە زانای شیعە ئاینزای عێراق نەسروڵا حائیری لەلایەن نادرشا بۆ ئەم مەبەستە بانگهێشت کرا. **علي الوردي، المصدر السابق**، ص١٣٤.

(٨٥١) **علاء** موسى **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص ١٩٦.

(٨٥٢) نادرشا لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٧٤١ز فەرمانی دەرکرد بەوەرگێڕان و شرۆڤەکردنی پەڕتووکە ئاسمانییەکان بۆ سەر زمانی فارسی، بۆ ئەم مەبەستەش میرزا مەهدی ئەستەرئابادی کرایە بەرپرسی یەکەمی ئەو کارە، لەلایەکی دیکەوە هەر لەهەمان ساڵدا نادرشا لەکۆبوونەوەیەکی لەگەڵ پیاوانی ئاینی سەرجەم ئاینە ئاسمانییەکان بەڕوونی پێی ڕاگەیاندن، **نیازی** وایە ئاینزاییەکی نوێ بێنێتە ئاراوە، کە بیروڕای هەر سێ

لە١٢ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٧٤٣ز کۆنگرە لە شاری نەجەف گرێدرا[٨٥٣]، بەسەرۆکایەتی شێخ عەبدوڵا سویدی، کە لەلایەن نادرشا داوای لێکرابوو بەشداربێت وەك کەسێکی ناوبژیکەر نەوەك وەك لایەنی گفتوگۆکەر[٨٥٤]، لە دەستپێکی کۆنگرەکە نادرشا لە وتارێکی کورتدا داوای لە ئامادەبووان کرد، بەهەر شێوەیەك بێت چارەسەری جیاوازیی و ناکۆکییەکانی نێوان موسڵمانان بکەن و کینە و دوژمنایەتی نەهێڵن، هەروەها جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ئێرانییەکان موسڵمانن و باوەڕیان بەئسوڵی ئیسلامی هەیە، بۆیە پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانان بەچاوی ڕێز و یەکسانییەوە سەیریان بکات[٨٥٥].

نادرشا ئاینزای پێنجەم وەك هەر چوار دەستەکەی دیکەی سونە ئاینزا بەمافێکی ڕەوای ئێرانییەکانی دانا، لەهەمان کاتدا جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە پێویستە لە کەعبەی پیرۆزیش وەك هەر چوار دەستەکەی دیکە لایەکیان (رکن) هەبێت[٨٥٦]، پاش وتارەکەی دەستکرا بەگفتوگۆکردن لەسەر کێشە ئاینزایەکان، لە سەرەتادا جۆرە گرژییەك و لێك دوورکەوتنەوەیەك چێ بوو لەنێوان بەشداربووان، ئەمەش بووە هۆکارێك کە نادرشا تووڕەبێت، بۆ ئەم مەبەستە وتەیەکی هەیە کە دەڵێت (ئەگەر خودا تاقانەیە پێویستە هەموو ئاینەکان یەك بن)[٨٥٧].

---

ئاینەکەی تێدا کۆکرابێتەوە. ئەم بۆچوونەش تەنیا هانوی ئاماژەی پێ کردووە، هیچ سەرچاوەیەکی دیکە ئاماژە بەو ڕووداوە ناکەن.

Jonas Hanway, Op.Cit, PP.218-219.

(٨٥٣) سەبارەت بەشداربووانی کۆنگرەی نەجەف، لایەنی ئێرانی کە حەفتا زانای شیعە بوون بەسەرۆکایەتی مەلا باشی عەلی ئەکبەر، هەروەها حەوت زانای ئەفغانی بەشداربوون بەسەرۆکایەتی مەلا هەمزە قەلجائی، سەبارەت بەزانایانی تورکستان، کە ئەوانیش حەوت زانا بوون بەسەرۆکایەتیی خەواجە هادی ناسراو بەبەحری عیلم.بۆ زانیاریی پتر بارەی ناوی زانایانی بەشداربوو بگەڕێوە بۆ : الشيخ رسول الكركوكلي، المصدر السابق، ص٥٥.

(٨٥٤) لکهارت، نادرشا، ص٢٩٤" **عبدالله بن الحسين السويدي العباسي، المصدر السابق، ص٣٥.**

(٨٥٥) محمد حسين ميمندى نژاد، منبع پيشين، ص ٨١٧.

(٨٥٦) همان منبع، ص ٧١٨.

(٨٥٧) حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص١٠٦.

سەبارەت بەگفتوگۆی زانایان بەتایبەت لەنێوان مەلاباشی و خەواجە هادی زۆر لە کێشە جیاوازەکانی نێوان هەردوو ئاینزای سونە و شیعەی گرتەوە، لەوانە پرسی زەواجی موتعە و بەرز ڕاگرتنی عەلی کوڕی ئەبو تالێب لەسەر ئەبوبەکری سدیق (ر.خ) و چەندین کێشەی دیکە[858]، بەڵام وەڵامدانەوەکانی مەلاباشی و نەرمی نواندنی دەقاودەق لەسەر خواست و ویستی نادرشا بووە[859]، چونکە نادرشا هەوڵیداوە بەهەر شێوەیەك بێت دانپێدانانی ئاینزای جەعفەری دەستەبەر بکات.

لەڕۆژی دووەمی گفتوگۆکان، بەئامادەبوونی زانایانی نەجەف، هەردوولایەن گەیشتنە ڕێگەچارەیەك و بەڵگەنامەیەکیان مۆرکرد، کە ناسراوە بەبەڵگەنامەی نەجەف، تێیدا سەرزنشتی ڕەفتار و کارەکانی شا ئیسماعیلی یەکەمیان کرد، بەهۆی سەپاندنی ئاینزای شیعەی دوازدە ئیمامی لە ڕێگەی هێز و توندوتیژییەوە، هەروەها دان پێدانان بەهەر چوار خەلیفەی ڕاشدین یەك لەدوای یەك ،لەبەرانبەریشدا دان پێدانانی زانایانی سونە ئاینزا بەوەی کە ئیمام جەعفەر لە وەچەی پێغەمبەر محەمەدە (د.خ)[860]، لەگەڵ جەخت کردنەوە لەسەر داواکارییەکانی کۆنگرەی موغان[861].

لەلایەکی دیکەوە زانایانی سونە ئاینزا گەواهی ئەوەیاندا کە خەڵکی ئێران هیچ جیاوازیەکی ئاینییان نییە لەگەڵ چوار دەستەکەی دیکەی سونە ئاینزا، هەروەها لە پێڕەوکەرانی تەریقەتی جەعفەری هەژمارکران، دواتر ئەم گەواهییە لە مەزاری ئیمام عەلی کوڕی ئەبوتالێب هەڵواسراو کۆپییەکی بۆ دەرباری عوسمانی ڕەوانە کرا[862]، پاشان گوهر شا بیگم خێزانی نادرشا بڕی سەد هەزار نادری پێشکێش کرد بۆ نۆژەنکردنەوەی دیواری گۆڕەپان و هەردوو منارەکەی مەزارگەی ئیمام موسا کازم[863].

---

(٨٥٨) الشيخ رسول الكركوكلي، المصدر السابق، ص٥٦.

(٨٥٩) **علي الوردي، المصدر السابق**، ص١٤٠.

(٨٦٠) لكهارت، نادرشا، ص٢٩٤.

(٨٦١) سەبارەت بەبڕیارەکانی کۆنگرەی نەجەف بگەڕێوە بۆ : میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای..، ص ص٣٩٠-٣٩١.

(٨٦٢) حبيب الله شاملوئی، منبع پيشين، ص ص٧١٧-٧١٨.

(٨٦٣) **محمد علي بن محمد التبريزي**، منبع پيشين، ص٣٣٥.

ڕێککەوتننامەی نەجەف تا ڕادەیەك چارەسەرێکی مام ناوەندی بۆ کێشە ئاینزایەکان دانا،لەو بارەیەوە عەلی وەردی وەسفی کۆنگرەکە دەکات و دەڵێت: **"لەو جۆرە لە مێژووی ئیسلامدا یەکەمین کۆنگرە بوو، رەنگە دوا کۆنگرەش بووبێت"**[٨٦٤]، هەروەها سەرکەوتنی کۆنگرەی نەجەف نادرشای خۆشحاڵ کرد، لە راستیدا مافی خۆیەتی شانازی بەسەرکەوتنی کۆنگرەکە بکات و پێی خۆشحاڵ بێت، چونکە کارێکی مەزن بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەش نادرشا خاڵێکی گرینگی فەرامۆش کرد، ئەویش ئەوەبوو، کە کۆنگرەکە ناتوانێت کاریگەرییەکی هەمیشەیی هەبێت، لەکاتێکدا میر و زانایانی موسڵمانان هەر هەموویان هاوکای یەکدیی نەکەن بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی، چونکە کێشەیەك کە مێژووییەکی دوورودرێژی هەبێت لەنێوان ئەو دوو گرووپەدا تەنیا بەنووسینەوەی کۆنووسێك و مۆرکردنی هەروا بەئاسانی لەناو ناچێت[٨٦٥].

سەبارەت بەکۆنگرەی نەجەف کە لە مانگی شەوال **١١٥٦**کۆچی/**١٢**ی کانوونی یەکەم **١٧٤٣**ز بەسترا، واتە نێزیکبوونەوە بوو لە کاتی حەج، نادرشا ویستی ئەو دەرفەتە بقۆزێتەوە، بۆیە سەید نەسروڵا حائیری وەك ئیمامی ئێرانییەکان دیاری کرد و ڕەوانەی مەکەی کرد، لەگەڵ پێدانی کۆپییەکی کۆنووسی ڕێککەوتننامەی نەجەف بۆ میری مەکە، لەگەڵ گەیشتنی بەمەکە رێگەی پێدرا لە گۆشەی شامی نوێژ بکات و وتار بخوێنێتەوە[٨٦٦].

لەلایەکی دیکەوە هەڵچوونی خەڵکی مەکە بووە هۆکارێك کە شەریف مەسعود میری مەکە نامەیەك ئاراستەی سوڵتان بکات و لەو ڕووداو و پشێوییانە ئاگەداری بکاتەوە، بۆیە فەرمان لە سوڵتانی عوسمانی دەرچوو بەدەستگیرکردنی حائیری و ڕادەستکردنی بە ئەسعەد پاشا عەزم میری حەجی شام بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆی بیبات بۆ

---

(٨٦٤) **علی الوردی، المصدر السابق**، ص١٣٤.

(٨٦٥) **المصدر نفسه**، ص ص١٤١-١٤٢.

(٨٦٦) **علاء** موسى **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص١٩٨.

شام و له قەڵای دیمەشق زیندانی بکات، ئەو ڕووداوە، بەیەکەمین نسکۆی دەستپێشخەرییەکانی کۆنگرەی نەجەف دادەنرێت[٨٦٧].

دەکرێت بڵێین سەرەڕای گرینگی ئەو کۆنگرەیە، بەڵام سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، لەوانەیە بارودۆخی سیاسیی رۆڵی سەرەکیی بینیبێت لەو نێزیك بوونەوەیە، ئەویش باڵادەست بوونی نادرشا و هەژموونی سوپاکەی لەناو خاکی عوسمانی کە زۆرێك لە ناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەلایەن سوپای ئێرانەوە داگیرکرابوو، لەلایەکی دیکەوە ئەو نێزیکبوونەوە نەبووە جێگەی ڕەزامەندیی شیعە ئاینزاکان لە ئێران و سونە ئاینزاکان لە دەوڵەتی عوسمانی، چونکە ئەو نێزیکبوونە ئاینزایە نەیتوانی ڕەگوڕیشەی خۆی داکوتێت لە ناواخنی دڵەکان، بگرە خوێندنەوەیان بۆ یەکدی لەناخەوە خراپ خۆی حەشاردابوو، بۆیە ئەگەر ڕێککەوتننامەی ئاینزایشیان مۆرکرد، بەڵام کارێکی هەڕەمەکی بوو.

## ب ـ پەرەسەندنەکانی ناوچەی قارس و ڕێککەوتننامەی کرند(٨٦٨) ١٧٤٦ز

دەوڵەتی عوسمانی بەوردی چاوەدێری باردۆخی ناوەخۆیی ئێرانی دەکرد، هەروەها لەدوای دەرفەتێك دەگەڕا بۆ ئەوەی دەست بخاتە ناو کاروباری ناوەخۆیی ئێرانەوە، بۆ ئەم مەبەستە ئەحمەد پاشا جەمال ئوغلوی فەرمانڕەوای قارس لەلایەن حکوومەتی عوسمانییەوە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە دەست نیشانکرا[٨٦٩].

لەلایەکی دیکەوە ڕاسپاردەی حکوومەتی عوسمانی بۆ والی قارس برێتی بوو لە پێشکێش کردنی هەموو جۆرە یارمەتییەك بۆ سەفی میرزا لە جووڵانەوە و هەڵگەڕانەوەکانی دژ بەدەسەڵاتی نادرشا، دوای ئاگەدارکردنەوەی نادرشا لە چالاکییەکانی والی قارس، کە ئەو کات لە نێزیك هەمەدان خەریکی ئاهەنگێڕان بوو

---

(٨٦٧) عباس العزاوي، المصدر السابق، **الجزء** الخامس، ص٢٧٠ . سەبارەت بەچارەنووسی سەید نەسروڵا حائیری بگەڕێوە بۆ: **علی الوردی، المصدر السابق**، ص١٤٥.

(٨٦٨) کرند یاخود گردان دەکەوێتە هەرێمی ساوغ بولاغ بە دووری ٩٠کم رۆژئاوای باکوری تەهران. **علاء** موسی **کاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص٢٠١.

(٨٦٩) **عبدالعظيم رضائی**، منبع پیشین، ص٣٤.

بەبۆنەی جەژنی نەورۆز، ڕاستەوخۆ لە ڕێگەی نێردەیەکی خۆی ئاگەدارکردنەوەیەکی توندی ئاراستەی والی قارس کرد، داوای لێکرد دەست هەڵگرێت لە چالاکییە دوژمنکارییەکانی بەرانبەر بەئێران، هەروەها ڕێز بگرێت لە دانوستاندنەکانی نێوان نادرشا و سوڵتانی عوسمانی[٨٧٠].

شایەنی باسکردنە لەو بارودۆخەدا سەفی میرزا هەوڵەکانی خۆی چڕکردبۆوە بۆ جووڵاندنی هەستی خەڵك، بەتایبەت لە چەندین ناوچەی جیا جیای ئازەربیجان بۆ **راپەڕین** و هەڵگەڕانەوە دژ بەدەسەڵاتی نادرشا، بەڵام هەواڵی دوورخستنەوەی ئەحمەد پاشا جەمال ئوغلۆ و دانانی ئەحمەد پاشا والی بەغدا وەك فەرمانڕەوای قارس لەلایەن حکوومەتی عوسمانییەوە تا ڕادەیەك دڵنیای بەخشییەوە بەنادرشا، کە ئەو کات لە ناوچەی ئەبهەر بوو، چونکە ئەو کەسایەتییە لەلایەن نادرشاوە ڕێز و بایەخی تایبەتی خۆی هەبووە[٨٧١].

لەلایەکی دیکەوە هەر لەگەڵ دەست بەکاربوونی ئەحمەد پاشا وەك والی قارس، نادرشا لە یەکەمین هەنگاویدا فەرمانیدا بەفەرمانڕەوای شێروان، دیلە عوسمانییەکان ئازاد بکات، وەك دەربڕینێك بۆ نیازی ڕاستەقینەی نادرشا بۆ ئاشتی، هەروەها نامەیەکی ئاراستەی والی نوێ کرد، تێیدا پابەندبوونی ئێرانی بەڕێککەوتننامەی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی دووپاتکردەوە[٨٧٢].

دەهەمبەردا ئەحمەد پاشا وەڵامی نادر شای دایەوە، کە ئەو لەلایەن حکوومەتی عوسمانییەوە دەسەڵاتی پێ نەدراوە بۆ ئەنجامدانی ئاشتی، بگرە بۆ مەبەستی پێشکێش کردنی یارمەتی و کۆمەکی سەفی میرزا لەلایەن حکوومەتی عوسمانی ڕاسپێردراوە، تاوەکو ماف و دەسەڵاتی شەرعی بۆ بگەڕێنێتەوە، کە لەلایەن خودی نادرشا بەزۆر زەوت کراوە، ئەم وەڵامدانەوەیە لەلایەن نادرشا بەڕاگەیاندنی جەنگ هەژمارکرا، بۆیە لە ڕێگەی فەرمانڕەوای شێروان پەیامێکی هەڕەشە ئامێزی ئاراستەی والی قارس کرد، تێیدا ئاگەداری کردەوە بەم زووانە دەبێتە میوانی خودی ئەحمەد پاشا و سەفی میرزای هاوڕێی[٨٧٣].

---

(٨٧٠) لکهارت، نادرشا، ص ص٣٠٨-٣٠٩.

(٨٧١) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای..، ص٤٠١.

(٨٧٢) محمد حسین میمندی نژاد، منبع پیشین، ص ٨٣٧.

(٨٧٣) همان منبع، ص٨٣٨.

نادرشا دوای ئاڵوگۆڕکردنی نامەکان، ڕێگەی گرتەبەر بەئاراستەی قارس(٨٧٤)، بەڵام لە ڕێگەدا هەواڵی دەستگیرکردنی سام میرزای پێگەیشت لەلایەن تەهمورس خان فەرمانڕەوای کاخت لە گورجستان پاش ئەوەی هێزەکەی لە ناوچەی یاغشانی نێزیك شماخی لەبەرامبەر سوپای ئێران تووشی شکست هات بەناچاری ڕوویکرد بووە گورجستان(٨٧٥)، هەر لەوێشەوە لەسەر فەرمانی نادرشا چاوەکانی سام میرزا دەرهێنرا و پاشان ناردیانەوە بۆ ئەحمەد پاشا، لەگەڵ پەیامێکی هەڕەشەئامێز، تێیدا داوا کرابوو لە ئەحمەد پاشا خۆی ئامادە بکات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای ئێران لە قارس(٨٧٦).

لە ٢٩ی تەمووزی ١٧٤٤ز نادرشا گەیشتە ناوچەی قارس، هەروەها لەکاتی بڕینی ڕێگەی ئەرزەروم چەند ناوچەیەکی گرینگی داگیرکرد، پاشان دەستیکرد بەپەلاماردانی قەڵای قارس، سەرەڕای شەڕێکی سەخت، بەڵام نەیتوانی دەست بگرێت بەسەر ئەم

---

(٨٧٤) سەبارەت بەهەنگاوەکانی لەشکرکێشیی سوپای ئێران بۆ ناوچەی قارس بگەڕێوە بۆ پاشکۆی ژمارە (١١).

(٨٧٥) دوای هەڵگەڕانەوەی سام میرزا و کاریگەرییەکانی لەسەر بارودۆخی ناوەخۆی ئێران، بووە هۆکارێك کە نادرشا لە هاوینی ساڵی ١٧٤٣ز داوا لە هەر یەکە لە محەمەد عەلی خان فەرمانڕەوای دەربەند و حەیدەر خان فەرمانڕەوای شێروان بکات، کۆتایی بەهەڵگەڕانەوەکانی سام میرزا بهێنن، بۆ ئەم مەبەستە فەرمانڕەوای شێروان بۆ پێوەندیکردن بە محەمەد عەلی خان ڕوویکردە دەربەند، بەڵام لە ڕێگە لە نێزیك دەربەند کەوتە ناو بۆسەی سوپای سام میرزا و محەمەد کوڕی سەرخای لزگی، کە تێیدا فەرمانڕەوای شێروان دەستگیر دەکرێت و دواتر دەکوژرێت، هەرچەندە سوپای سام میرزا پاش ئەو سەرکەوتنە نەیتوانی ئاق سوی سەنتەری شاری شێروان داگیر بکات، بەڵام بووە هۆکارێك بۆ هەڵگەڕانەوە و ڕاپەڕین لە چەندین ناوچەی دیکە بەمەش زۆرێك لە دانیشتوانی ناوچەکە ڕوویان لە سام میرزا ومحەمەد کوڕی سەرخای لزگی کرد، ئەم ڕووداوە نادرشای ناڕەحەت کرد، بۆیە لە فەرمانێکدا داوای لە ئاشوورخان ئەفشار سەرکردەی هێزی ئازەربیجان بەهاوکاری هەر یەکە لە فەرمانڕەوایانی ئورومییە و گەنجە بەپاڵپشتی نەسروڵا میرزای کوڕی کرد کۆتایی بەم هەڵگەڕانەوانە بهێنن، بۆیە ئەم سوپایە لە ناوچەی یاغشان لە نێزیك شماخی بەرەنگاری سوپای سام میرزا بوونەوە و توانیان بەسەریاندا سەرکەون، لە ئەنجامدا محەمەد کوڕی سەرخای بەبریندارى ڕوویکردە داغستان و سام میرزاش ڕوویکردە گورجستان لەوێش لەلایەن تەهمورس خان بەهاوکاری کوڕەکەی توانیان دەستگیری بکەن. لکهارت، نادرشا، ص ص٣٠٠-٣٠٢.

(٨٧٦) عباس اقبال اشتیانی، باقر عاقلی، منبع پیشین، ص ص٦٢٨-٦٢٩. لەپاداشتی دەستگیرکردنی سام میرزا، نادرشا لە فەرمانێکدا کە لە مانگی ڕەبیعی دووەمی ساڵی ١١٥٥ك دەرچووە، بڕیاریدا تەهمورس خان وەك فەرمانڕەوای گورجستان دەست بەکاربێت. سرهنگ دوم محمد کشمیری، چند سند تاریخی، مجله بررسیهای تاریخی، شماره (٧٨)، ، نشریه ستاد بزرگ ارتشتاران — کمیته تاریخ **نظامی**، تهران، مهروابان ١٣٥٧ه.ش، ص٢٤٣. سەبارەت بەدەقی فەرمانی نادرشا بۆ دیارکردنی تەهمورس خان وەك فەرمانڕەوای گورجستان بگەڕێوە بۆ :پاشکۆی ژمارە(٨).

قەڵایە بەهۆی بەرگرییکردنی توندی سوپای عوسمانی، بۆیە بەناچاری پاشەکشەی کرد[٨٧٧]، پاش ڕێکخستنەوەی سوپاکەی جارێکی دیکە پەلاماردانەکەی دەست پێکردەوە، ئەمجارەیان توانی تاڕادەیەکی زۆر لە قەڵاکە نێزیك ببێتەوە و قایمکاری سەربازی دامەزراند، کە زیاتر لە چوار هەزار کرێکاری تەفلیسی بۆ ئەم مەبەستە هاوکاری سوپای ئێران بوون، پاشان گەمارۆیەکی توندی خستە سەر شارەکە، بەڵام هاتنی زستان ڕێگربوو لەبەردەم هەوڵەکانی نادرشا بۆیە بڕیاری پاشەکشەیدا بەرەو ئەرپاچای لە ناوچەی بەردەع[٨٧٨].

شیاوی باسکردنە نادرشا دوای مانەوەی سێ هەفتە لەبەردەع پاش پەڕینەوەی لە پردی جەواد لەسەر ڕووباری کرو، ڕووی کردە ناوچەی داغستان، لەوێش سوپاکەی دابەشکردە سەر چوار قۆڵ، بەمەبەستی لێدانی هەڵگەڕاوە لزگییەکان و تەمبێ کردنی یاخیبووانی داغستان، سەرەڕای خراپی باردۆخی کەش و سەرماوسۆڵی، بەڵام نادرشا بەتوندی بنکە و بارەگەی لزگییەکانی بۆردومانکرد، هەروەها بەتوندترین شێوازیش کەوتە وێزەی یاخیبووانی ناوچەکە، لە ئاکامدا سەرۆك هۆز و کەسایەتییە دیارەکانی داغستان بەناچاری ملکەچبوونی خۆیان بۆ نادرشا ڕاگەیاند[٨٧٩].

لەلایەکی دیکەوە نادرشا دوای کردە سەربازییەکانی لە ناوچەی داغستان، لە١٤ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٧٤٥ز ڕوویکردە دەربەند، دواتر گەڕایەوە ناوچەی بەردەع بۆ

---

(٨٧٧) **علاء** موسى **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص١٩٩ "

Henry Mortimer Durand, Nadir Shah , London,1908, P.621 "J.Von Hammer,A.G.E, S.429.

(٨٧٨) لکهارت، نادرشا، ص ص٣١٠-٣١١ . سەبارەت بەتوندی هێرشەکانی سوپای ئێران و بەردەوامی گەمارۆی سەر شاری قارس، بووە هۆکارێك کە ئەحمەد پاشا یەکێك لە ئەفسەرە دیارەکانی خۆی بەناوی عەبدولرەحمان پاشا بنێرێتە لای نادرشا و دڵنیای بکاتەوە لەوەی کە ئەحمەد پاشا **نیازی** وایە شارەکە ڕادەستی نادرشا بکات، لەکاتێکدا بڕیار لە حکوومەتی عوسمانی بۆی بێت، لەگەڵ ئەوەش نادرشا ئارەزووی هەبووە لەسەر ئاگربەست، بۆ ئەوەی سوود لەو دەرفەتە وەربگرێت بۆ سەرکوتکردنی لزگییەکان لە داغستان، بۆیە بەشێکی سوپاکەی بۆ گەمارۆدانی شارەکە جێهێشت و خۆشی گەڕایەوە ئەرپاچای. میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای..، ص ص٤٠٤-٤٠٥.

(٨٧٩) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای..، ص٤٠٥.

ماوەیەکی دیاریکراو لەو ناوچەیە مایەوە، پاشان لەگەڵ هێزەکەی بەرەو ناوچەی شکی ڕۆیشت،کە ئەم ناوچەیە ناسراوە بەدەوڵەمەندەیەکەی لە ڕووی خۆراك و ئالیك، لەوێش پێداویستیی سوپاکەی لە کەلوپەل و خۆراك ئامادە کرد و بەرەو یەریڤان بەڕێکەوت، بەڵام نادرشا لە ڕێگەدا نەخۆش کەوت[٨٨٠]، دوای چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی بەردەوامی بەلەشکرکێشییەکەیدا و لە تەمووزی ساڵی **١٧٤٥**ز گەیشتە شوێنی دیاریکراو[٨٨١].

لەو بارودۆخەدا، حکوومەتی عوسمانی خەریکی ئامادەکردنی هێزێکی زەبەلاح بوو، بەمەبەستی بەرەنگاربوونەوەی سوپای ئێران و ناچارکردنیان بەپاشەکشەکردن بۆ ناو خاکی ئێران، بۆ ئەم مەبەستە لەلایەن حکوومەتی عوسمانی سەدری ئەعزەمی پێشوو محەمەد پاشا یکن وەك سەرکردەی گشتیی هێزی عوسمانی دیارکرا، هەروەها داوا لە هەریەکە لە نورەدین سەلیم فەرمانداری قەرم و عەبدوڵا پاشا والی دیاربەکر و عەبدولجەلیل زادە حوسێن پاشا والی موسڵ کرا ڕوو لە تخوبەکانی ئێران بکەن، بەمەبەستی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سوپای ئێران و نەنواندنی هیچ نەرمییەك لە بەرامبەریان[٨٨٢].

هەر بەبیستنی هەواڵی نێزیك بوونەوەی سوپای عوسمانی لەقارس،نادرشا هەڵسا بەدەستنیشانکردنی نەسروڵا میرزا بۆ **سەرکردایەتیی** کردنی بەشێکی سوپای ئێران، ڕەوانەکردنی بۆ دەوروبەری شاری موسڵ بەمەبەستی بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ عەبدوڵا پاشای والی دیاربەکر،خۆشی ڕوویکردە دەشتی موراد تەپە لە یەریڤان، دەهەمبەردا

---

(٨٨٠) لکهارت، نادرشا، ص٣١٢ .نەخۆشییەکەی نادرشا برێتی بوو لە نەخۆشی (**استسقاء**)، نیشانەکانی برێتین لە داخستنی ڕیخۆڵەکان و هەڵئاوسانی جگەر، هەرچەندە لەلایەن بازن پزیشکی تایبەتی خۆی مۆڵەتی دوو مانگ داواکرا، بۆ ئامادەکردنی دەرمانەکان بەمەبەستی چارەسەرکردنی، بەڵام ئەم داوایە لەلایەن نادرشا ڕەتکرایەوە، تەنیا مۆڵەتی (٢٥ تا ٣٠) ڕۆژی پێیدا، لەکۆتایدا توانی چارەسەری بکات. بۆ زانیاریی پتر لەبارەی نەخۆشییەکە و ڕۆڵی بازنی پزیشك لە چارەسەرکردنی نادرشا بڕوانە: بهرام افراسیابی، منبع پیشین، ص ص٨٢١-٨٢٢.

(٨٨١) نورالله لارودی، منبع پیشین، ص٢١٢.

(٨٨٢) الشیخ رسول الکرکوکلی، المصدر السابق، ص ص٦٤-٦٥.

محەمەد پاشا یکن گەیشتە شوێنی دیارکراو،بەمەبەستی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ نادرشا[٨٨٣].

جێگەی ئاماژە پێکردنە لە سەرەتادا لەنێوان هەردوو هێز لە دەشتی موراد تەپە چەند بەگژداچوونەوەیەکی سەرەتایی ڕوویدا، بەڵام جەنگی ڕاستەقینە لە١٠ی ئابی ١٧٤٥ز دەستی پێکرد،کە چوار ڕۆژی خایاند، تێیدا جەنگەکە بەسوودی نادرشا و سوپاکەی تەواو بوو[٨٨٤]، دوای پاشەکشەی سوپای عوسمانی بۆ بارەگە سەرەکییەکەیان لە قارس، پشێوی و هەڵگەڕانەوە کەوتە ناو سوپا، لە ئاکامدا محەمەد پاشا یکن سەرکردەی گشتیی سوپای عوسمانی لەلایەن سەربازە هەڵگەڕاوەکان کوژرا [٨٨٥].

دوای شکست خواردنی سوپای عوسمانی لە دەشتی مورادتەپە، نادرشا وازی لە ڕاوەدونانی سوپا تێکشاوەکەی عوسمانی هێنا، دووبارە سیاسەتی گەمارۆدانی خستە ئەجێندای کارەکانی، بۆ ئەوەی ناچاریان بکات خۆیان بەدەستەوە بدەن، هەروەها لەکاتی گەمارۆدانی شاری قارس هەواڵی سەرکەوتنی نەسروڵا میرزا بەسەر عەبدوڵا پاشای والی دیاربەکری پێگەیشت، کە زیاتر دڵی نادرشای خۆشکرد[٨٨٦]، بۆ ڕۆژی دواتر لە ڕێگەی سیخوڕەکانی توانی هەواڵی پشێوی و ئاڵۆزی بارودۆخی سوپای عوسمانی لەناو شاری

---

(٨٨٣) حاج میرزا حسن حسینی فسائی منبع پیشین، ص٥٦٨ " **عبدالعظیم رضائی**، منبع پیشین، ص٣٤.

(٨٨٤) میرزا مهدی خان استرابادی، دره نادره...، ص٧٥٩.

(885)P. SYKES, Op. Cit, P.269 "

سرجان ملکم، جلد دووم، منبع پیشین، ص٣٦ " **علی الوردی، المصدر السابق**، ص١٤٥.

لەبارەی کوژرانی محەمەد پاشا یکن لەلایەن سەربازە هەڵگەڕاوەکانی عوسمانی، لە سەرچاوە فارسییەکان ئاماژەیەکی دیکە هەیە پێچەوانەی ئەم بۆچوونە، پێیان وایە لەکاتی جەنگدا لە دەشتی موراد تەپە بریندار دەبێت و بەهۆی ئەو برینداریەوە گیان لەدەست دەدات. حاج میرزا حسن حسینی فسائی، منبع پیشین، ص ٥٦٩ " حبیب الله شاملوئی، منبع پیشین، ص٧١٩.

(٨٨٦) کەلیمولای تەوەحودی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٧. بۆ زانیاریی پتر لەبارەی ڕەوت و پەرەسەندنەکانی جەنگی نەسروڵا میرزا بەهاوکاری کوردانی خۆراسان لەگەڵ عەبدوڵا پاشای والی دیاربەکر بەهاوکاری ئەحمەدخان کوڕی سوبحان وێردی خانی ئەردەڵان لە نێزیك موسڵ بگەڕێوە بۆ: محمد حسین میمندی نژاد، منبع پیشین، ص٨٥١ " **محمد علی بن محمد التبریزی**، منبع پیشین، ص ص٢٤٥-٢٤٦.

قارس وەربگرێت دوای لەدەستدانی سەرکردەکەیان، ئەمەش هاندرێکی باش بوو بۆ نادرشا، کە بڕیاری هێرشێکی کتوپڕ بدات بۆ سەر سوپای عوسمانی[٨٨٧].

نادرشا لە ئەنجامی هێرشە کتوپڕەکەی توانی زەبرێکی کوشندە ئاراستەی سوپای عوسمانی بکات، کە تێیدا ژمارەیەکی زۆری سەربازانی عوسمانی بەدیل گیران[٨٨٨]، هەروەها توانی دەست بگرێت بەسەر زۆرێك لە کەلوپەلی سەربازی بەجێماوی عوسمانی[٨٨٩]، سەبارەت بەزیانی گیانی لەنێوان هەردوولا، هانوی وا مەزەندە دەکات کە نێزیکەی دوازدە هەزار سەرباز لەلایەنی عوسمانی لەو جەنگە کوژرابێت بەرامبەر بەهەشت هەزار سەربازی ئێرانی[٨٩٠].

سەرەڕای سەرکەوتنەکانی بەسەر سوپای عوسمانیدا، نادرشا لەخۆبایی نەبوو، بگرە سەرکەوتنەکەی کردە ئامرازێك بۆ ئاشتی کردن لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی[٨٩١]، لە یەکەمین هەنگاویدا هەڵسا بەنادرنی نێردەیەکی تایبەتی بۆ لای حاجی ئەحمەد پاشا سەرکردەی سوپای عوسمانی لەبارەی گفتوگۆکردن لەسەر ئاشتیکردن و کۆتایی هێنان بەجەنگ، لەگەڵ جەختکردنەوەی لەسەر چەند مەرجێکی نوێ و دوورکەوتنەوەی لە مەرجەکانی پێشووتری وەك داواکارییە ئاینییەکان، بگرە ئەمجارە جەختی کردەوە لەسەر وازهێنانی دەوڵەتی عوسمانی لەهەر یەکە لە بەغدا و نەجەف و بەسرە و کوردستانی عوسمانی بۆ ئێران[٨٩٢].

---

(٨٨٧) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای..، ص٤٠٩.

(٨٨٨) نادرشا توانی لەو جەنگە نێزیکەی چل و سێ هەزار سەربازی عوسمانی بەدیل بگرێت، چل هەزار دیلی گواستەوە بۆ تاران، سێ هەزار دیلەکەی دیکەی ڕەوانەی تەوریز کرد. کەلیمولڵای تەوەحودی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٧.

(٨٨٩) میرزا مهدی خان استرابادی، جهانگشای...، ص٤٠٩.

(890) Jonas Hanway, Op.Cit, P.253.

(٨٩١) لەوانەیە هۆکاری ئەو دەستپێشخەرییەی نادرشا بۆ ئاشتی کردن زیاتر بگەڕێتەوە بۆ خراپی و ناسەقامگیری بارودۆخی ناوەخۆی وڵات بەهۆی ئەو ڕاپەڕین و نارەزایانەی کە دەسەڵاتی نادرشا و حکومەتەکەیان خستبووە مەترسییەوە.

Ibid, P.254.

(٨٩٢) لکهارت، نادرشا، ص ص٣١٣-٣١٤.

لەلایەکی دیکەوە داواکارییەکانی نادرشا لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی بەتوندی ڕەتکرایەوە[٨٩٣]، ئامادەکاری پێویستی سەربازی لەلایەن حکوومەتی عوسمانی ئەنجام درا پاش کۆکردنەوەی سوپا لە ڕۆم ئیلی و ئەنادۆڵ و قەرم ئامادەکردنیان بەباشترین پێداویستییە سەربازییەکان بەمەبەستی هێرشکردنە سەر سوپای ئێران،[٨٩٤]، هەروەها هەڵسان بەدیارکردنی عەلی پاشا حەکیم ئوغلو وەك فەرمانڕەوای قارس لە جێگەی حاجی ئەحمەد پاشا[٨٩٥].

شیاوی باسکردنە لەمیانەی ئەو گرژی و ئاڵۆزیەی نێوان هەردوو دەوڵەت، نادرشا لە١٢ی کانوونی دووەمی ١٧٤٦ز فەتح عەلی خان تورکمانی وەك نێردەی تایبەتی خۆی ڕەوانەی ئیستانبول کرد، ئەرکی ئەو نێردەیەش گەیاندنی چەند نامەیەکی هەریەکە لە نادرشا و موعیر ئەلمەمالیك [٨٩٦] و مەلاباشی بۆ هەریەکە لە سوڵتانی عوسمانی و سەدری ئەعزەم و شێخی ئیسلام بوو[٨٩٧]، هەروەها فەتح عەلی خان تورکمان بەر لە گەیشتنی بۆ ئیستانبول، لە شاری بەغدا نامەیەکی تایبەتی نادرشای گەیاندە ئەحمەد پاشا، کە تێیدا نادرشا داوای لە والی بەغدا کردبوو ڕۆڵی ناوبژیکەر ببینێت لە چارەسەرکردنی کێشەکان لەنێوان هەردوو دەوڵەت[٨٩٨].

دوا بەدوای گەیاندنی نامەکان لەلایەن فەتح عەلی خان تورکمان بەشوێنی دیاریکراو[٨٩٩]، ناوەرۆکی نامەکان لەلایەن حکوومەتی عوسمانی لێکۆڵینەوەی وردی لەسەر کرا، پاشان ڕەزامەندی تەواویاندا بۆ چوونە ناو دانوستاندن لەگەڵ لایەنی ئێرانی بەمەبستی ڕێکەوتن و کۆتایی هێنان بەجەنگ، چونکە نادرشا لە نامەکەیدا بەتەواوەتی وازی هێنابوو لەو داواکاری و مەرجە توندانەی کە عوسمانییەکانی هەرەسان کردبوو، بۆ

(٨٩٣) حسن كريم جاف، المصدر السابق، ص١٠٨.

(٨٩٤) الشيخ رسول الكركوكلي، المصدر السابق، ص٦٧.

(٨٩٥) لكهارت، نادرشا، ص٣١٤ .

(٨٩٦) برێتییە لە پۆستی سەرۆك وەزیران و بەرامبەر بە پۆستی سەدر ئەعزەمی دەوڵەتی **عوسمانییە**.

(٨٩٧) **علاء** موسى **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص٢٠٠.

(٨٩٨) عباس العزاوي، المصدر السابق، **الجزء** الخامس، ص٣٧٢.

(٨٩٩) سەبارەت بەناوەڕۆکی نامەکان بگەڕێوە بۆ : الشيخ رسول الكركوكلي، المصدر السابق، ص ص٦٧-٧٠.

ئەم مەبەستە دەسەڵاتی تەواو درا بە نەزیف ئەفەندی لەلایەن حکوومەتی عوسمانی بۆ ئەنجامدانی دانوستاندن لەگەڵ ئێران[900].

لەلایەکی دیکەوە بۆ جێبەجێکردنی هەنگاوەکانی ئاشتی لەنێوان هەردوو دەوڵەت، نەزیف ئەفەندی وەك نێردەی تایبەتی حکوومەتی عوسمانی گەیشتە ئێران و لەگەڵ نادرشا کۆبوونەوەی ئەنجامدا[901]، پاشان دەستکرا بەگفتوگۆ کردن لەسەر کێشە و گرفتەکانی نێوان هەردوو وڵات کە پێنج ڕۆژ بەردەوامی هەبوو لەنێوان نەزیف ئەفەندی بەهاوکاری وەلی ئەفەندی نووسەری دیوان لە بەغدا لەگەڵ هەریەکە لە حەسەن عەلیخان موعیر ئەلمەمالیك و میرزا مەهدی خان ئەستەرئابادی نووسەری دیوان و مێژوونووسی نادرشا، لە کۆتایدا لە ئەیلوولی **١٧٤٦**ز هەردوولا گەیشتنە چارەسەرێکی گونجاو بۆ کێشەکان و ڕێکەوتن لە نێوانیان ئەنجام درا[902].

ئەو ڕێکەوتنەی نێوان هەردوولا ناسراوە بەڕێککەوتننامەی کرند، کە پێشەکییەك و سێ بەند و پاشکۆیەك لەخۆ دەگرێت، لە گرینگترین خاڵەکانی جەخت دەکرایەوە لەسەر قبووڵکردن و گەڕانەوە بۆ ئەو سنوورەی کە بەگوێرەی ڕێککەوتننامەی زەهاو لەنێوان شا سەفی و سوڵتان مورادی چوارەم لە ساڵی **١٦٣٩**ز دیارکراوە[903]، هەروەها بەگوێرەی ڕێککەوتننامەکە لەسەر کاربەدەستانی عوسمانی پێویست کرا، ئاسایش و ئارامی بۆ حاجیانی ئێرانی دەستەبەر بکەن و بیانگەیەننە شوێنی دیاریکراو[904]، سەرەڕای جەخت کردنەوەیان لەسەر قەدەخەکردنی سەودیی کڕین و فرۆشتنی دیلەکانی

---

(٩٠٠) **علاء** موسى **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص٢٠١.

(٩٠١) لكهارت، نادرشا، ص٣١٤.

(٩٠٢) **علاء** موسى **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص٢٠١ "

J. Von Hammer, A.G.E, S.432.

(٩٠٣) منوچهر پارسا دوست، منبع پيشين، ص ٥٤ "

J.C. Hurewitz, Op.Cit ,PP.51-52.

(٩٠٤) عباس اقبال اشتيانى، باقر عاقلى، منبع پيشين، ص٦٢٩.

جەنگ و پێشکێش کردنی کارئاسانی بۆ ئەو دیلانەی ئارەزووی گەڕانەوەیان هەیە بۆ وڵاتەکانیان[٩٠٥].

کۆنووسی ڕێککەوتننامەکە دوای ئەوەی لەلایەن سوڵتانی عوسمانی ڕەزامەندیی لەسەر درا، لەلایەن والی سیواس حاجی ئەحمەد پاشا کسریە گەیاندرایە نادرشا[٩٠٦]، لەگەڵ نامەیەکی تایبەتی سوڵتان کە بۆ نادرشا نێردرابوو[٩٠٧]، لەبەرامبەریشدا نادرشا دوای ئەوەی ڕەزامەندیی نیشاندا لەسەر کۆنووسی ڕێککەوتننامەکە لەگەڵ چەند دیارییەکی گران بەها لە ڕێگەی مستەفا خان شاملو ڕاوێژکاری تایبەتی نادرشا بەیاوەری میرزا مەهدی خان گەیاندرانە ئیستانبول[٩٠٨]، دواتر ڕێککەوتننامەکە بەشێوەیەکی فەرمی لە٢١ی ئازاری ساڵی ١٧٤٧ز لەنێوان هەردوو دەوڵەت واژۆکرا، بەمەش کۆتایی هات بەململانێ و جەنگەکانی نێوانیان[٩٠٩].

دەکرێت بڵێین ئەو ڕێککەوتننامەیە وەك دەرفەتێك بوو بۆ نادرشا، چونکە بارودۆخی ناوەخۆیی وڵات لەوپەڕی خراپی دابوو بەهۆی زۆری ناڕەزاییەکانی خەڵك و **راپەڕین** هەڵگەڕانەوەکان لە زۆرینەی ناوچەکانی ئێران بەهۆی سەپاندنی باجی زۆر و سەودایی توندی کاربەدەستانی حکوومەت[٩١٠]، بۆ ئەوەی نادرشا زاڵ بێت بەسەر ئەو

---

(٩٠٥) اصغر جعفر ولدانی، منبع پیشین، ص١٩. سەبارەت بەپاشکۆی ڕێککەوتننامەی کرند چەند خاڵێکی لەخۆدەگرت، لەوانە ڕێزگرتنی ئاینزایی لەنێوان هەردوولا، هەروەها جەختکردنەوە لەسەر ئەنجامدانی سەودایی باش لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی لەبەرامبەر زیارەتکەرانی ئێرانی بۆ شوێنە پیرۆزەکانی ناوخاکی عوسمانی، لەگەڵ دوورکەوتنەوەی هەردوو وڵات لە دالدەدانی نەیار و هەڵاتووەکانی یەکدیی، هەروەها ڕێگەخۆشکردن بۆ کاری بازرگانی و تەگەرە نەخستنە بەردەم بازرگانان لە ڕێگەی سەپاندنی باجی زۆر. منوچهر پارسا دوست، منبع پیشین، ص ٥٥.

(٩٠٦) **علاء** موسى **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص٢٠٣.

(٩٠٧) لەبارەی دەقی نامەکەی سوڵتانی عوسمانی بۆ نادرشا بگەڕێوە بۆ : الشيخ رسول الكركولي، المصدرالسابق، ص ص٨٦-٨٩.

(٩٠٨) **محمد علی بن محمد التبريزی**، منبع پیشین، ص٢٥١.

(٩٠٩) **علاء** موسى **كاظم** نورس، **العراق في العهد العثماني ...**، ص٢٠٤.

(٩١٠) لەبارەی شێواز و ڕەفتارەکانی کاربەدەستانی دەوڵەت بەرامبەر بەناڕەزاییەکانی خەڵکی ئێران بگەڕێوە بۆ :حبيب الله شاملوئی، منبع پیشین، ص ص٧٢٠-٧٢١.

بارودۆخەدا پێویست بوو لەدەوڵەتی عوسمانی دڵنیا بێتەوە، ئینجا دەتوانێت بپرژێتە سەر بارودۆخی ناوەخۆیی، باشترین چارەسەر بۆ ئەم کارە ڕێکەوتن بوو لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی[٩١١]، هەروەها لەوانەیە ئەم ڕێککەوتننامەیە لە هزری نادرشا وەك ئاگربەستێك بووبێت، چونکە سرووشتی نادرشا وابوو ئەگەر بۆی بکرایە هەوڵی دەدا ئارەزوو و **بەرژەوەندییە**کانی جێبەجێ بکات، بەڵام کوژرانی نادرشا لەو ماوەیەدا دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگێکی دیکەی سەرتاسەری رزگار کرد، چونکە پاش کوژرانی نادرشا پشێوی وڵاتی گرتەوە، بەمەش دەوڵەتی عوسمانی نێزیکەی چارەکە سەدەیەك ١٧٤٧ تاکو ١٧٧٥ لە هەڕەشە و مەترسییەکانی ئێران دوورکەوتەوە.

(911) Henry Mortimer Durand, Op. Cit, P.263.

# بەشی چوارەم

# سیاسەتی نادرشا بەرامبەر بە ناوچەی کەنداو

## تەوەری یەکەم:

دامەزراندنی هێزی دەریایی ئێران و هەوڵە بەراییەکانی فرەوانخوازی

## تەوەری دووەم:

چالاکی و هەڵمەتەکانی یەکەم و دووەمی سوپای ئێران بۆ عومان ١٧٣٧-١٧٣٩

## تەوەری سێیەم:

چالاکی و لەشکرکێشی سێیەمی ئێران بۆ عومان١٧٤٠-١٧٤٣

له سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوی، بەهۆی سەرقاڵبوونی (شا)یەکانیان بەکێشە ناوەخۆیی و دەرەکییەکان، نەتوانرا بەشێوەیەکی جدی بپرژێنە سەر کێشەکانی کەنداو، سەرەڕای سەپاندنی دەسەڵاتیان لە ڕێگەی کۆکردنەوەی باج لەسەر ئەو ناوچەیە لەلایەن فەرمانڕەواکانی دوورگە و کەنارکانی کەنداو دوپات دەکردەوە، هەرچەندە لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی شا عەباسی یەکەم، ئێران تاڕادەیەك کرانەوەی بازرگانی هەبووە لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژئاوا، بەتایبەت ئینگلتەرا، ئەم ئاڵوگۆڕە بازرگانییە تا ڕادەیەك بووە هۆکارێك بۆ ئەوەی شا عەباس چاوخشاندنەوەیەك بەناوچەی کەنداو بکات، بەڵام لە دوای مردنی شا عەباس مافی ئێران لە کەنداو لەلایەن (شا)یەکانی دوای خۆی کەمتر لەبەر چاو گیرا، ئەمەش کاردانەوەی خراپی هەبوو لەسەر هەموو کردە بازرگانییەکانی ئێران لەکەنداو[912].

ئێران وەك هێزێکی کاریگەر لە کەنداو بوونی نەبووە تەنیا لەو ساڵانەی دوایی نەبێت بەشێوەیەکی دیاریکراو، سەرەڕای بوونی سنوورێکی فرەوان لە کەنداو هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ کەمی شارەزابوونی تاکی ئێرانی بەکاروباری دەریا و بەڕێوەبردنی کەشتیگەلی دەریایی، هەروەها سەرقاڵبوونی حکوومەتە یەك لە دوایەکەکانی ئێران بەکێشەکانیان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی لە ڕۆژئاوا و باکووری ڕۆژئاوا، لەگەڵ بوونی پرسی مەترسی رووسیا لە باکوور و هێزێکی دەریایی عارەبی لە کەنداو لە سەدەی هەژدەیەم، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت ئێران بەیەکجاری دەستبەرداری کەنداو ببێت و گرینگی پێ نەدات، چونکە دەرکەوتنی چەند فەرمانڕەوایەکی بەهێزی ئێران و رۆڵیان لە گرینگیدان بەکەنداو بەتایبەت دامەزراندنی هێزی دەریایی جارێکی دیکە ئومێدیان بەئێران بەخشیەوە، لەگرینگترین هەوڵدانەکانیش لەمێژووی نوێی ئێران بۆ ئەم مەبەستە برێتییە لە هەوڵەکانی نادر شا **١٧٣٦- ١٧٤٧** لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەیەم و ناسرەدین شا **١٨٤٨ – ١٨٩٦** لە چارەکی کۆتایی سەدەی نۆزدە[913].

---

(٩١٢) جواد موسوی دالینی، لیدا مودت، چرایی چگونگی تأسیس ناوگان دریایی نادرشا در خلیج فارس، مجله ( تاریخ پـژوهی)، سالۛ( دهم)، شماره ( ٣٦، ٣٧)، پایزو زمستان(١٣٨٧هـ.ش)، ص٤٣ ؛ خانبابا بیانی، گوشـهای از تـاریخ دیبلماسـی ایـران، مجلـه بررسیهای تاریخی، شماره (٦، ٥)، ، نشریه ستاد بزرگ ارتشتاران – کمیته تاریخ **نظامی**، تهران، اسفند ١٣٤٥هـ.ش، ص١٠.

**(٩١٣) خليل على مراد، ( الاطماع الايرانيية في الخليج العربى) في، مصطفى نجار واخرون، تـاريخ الخلـيج العربى الحديث والمعاصر، الطبعة الأولى، مطبعة جامعة بصرة، بصرة، ١٩٨٤م، ص١٩٩.**

## تەوەری یەکەم:

## دامەزراندنی هێزی دەریایی ئێران و هەوڵە بەراییەکانی فرەوانخوازی

### أ- هۆکارەکانی دامەزاراندنی هێزی دەریایی ئێران:

ئێرانییەکان بەشێوەیەکی گشتیی ئارەزوویان بەژیانی دەریاوە نەبووە، بەشێوەیەك دوورکەوتبوونەوە کە نەیان دەتوانی گۆڕانکاریی لە ئارەزووەکانیان بکەن و بەئاراستەی کاری دەریاوانی بڕۆن[٩١٤]، هەر بۆیەش بیرسی سایکس زۆر بەڕوونی هۆکارەکان ئاشکرا دەکات و دەیبەستێتەوە بەکاریگەرییەکانی هۆکاری سرووشتی لەسەر ئارەزوەکانی مرۆڤ کاتێك دەڵێت: "هیچ شتێك نییە لەوە باشتر بۆمان ڕوون بکاتەوە کە کاریگەریی هۆکارە سرووشتیەکان لەسەر ئارەزو و ڕەفتاری مرۆڤەکان چۆن دەبێت، باشترین نموونەش ئێرانییەکانن، کە چەندە بە ئاشکرا رق و کینەی خۆیان بەبەردەوامی لەسەر دەریا دەردەبڕن، زیاتریش ئەو دوورکەوتنەوە دەگەڕێتەوە بۆ بەربەستە شاخاوییە بەرزەکان کە لە دەریای دابڕاندوون"[٩١٥].

---

(٩١٤) **نزار عبداللطيف الحديثى، العلاقات العربيه - الفارسيه، الطبعة الأولى، دار واسط، بغداد، ١٩٨٢م، ص٥٢.**

(٩١٥) وەرگیراو لە **كاظم باقر على، البحرية الفارسية في الخليج العربي، رسالة ماجستير مقدمة الى قسم التاريخ ـ كلية الاداب ـ جامعة البصرة، ١٩٨٣م، ص٣٧.**

شیاوی باسکردنه شا عەباسی یەکەم کە سەردەمەکەی بەسەردەمی زێڕین هەژماردەکرێت، توانی لە رێگەی یارمەتییەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی بەندەری گمبرون، کە دواتر بەبەندەری عەباس ناسرا لە دەست پورتوگالییەکان دەرباز بکات، جگە لەمەش لە ساڵی **١٦٢٢**ز هەریەکە لە دوورگەکانی قشم و هورمز هەروەها دواتر بەحرێن لەژێر دەسەڵاتیان دەربهێنێت و بیخاتەوە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی سەفەوی[(٩١٦)].

لە دوای مردنی شا عەباسی یەکەم بەشێوەیەکی گشتیی دەوڵەتی سەفەوی مۆمی داگیرساوی بەرەو کزبوون و خامۆشی رۆیشت، بەتایبەتی دوای هاتنی ژمارەیەك لە (شا)ی لاواز کە زۆرینەیان کاروباری وڵاتیان بەلاوە نابوو[(٩١٧)]، کەمتر گرینگیان دەدا بەناوچەی کەنداو[(٩١٨)] بەشێوەیەك لە سەردەمی شا سلێمان هۆڵەندییەکان دەستیان گرت بەسەر دوورگەی قشم، هەروەها فشارەکانی کەشتیگەلی یەعاربە لە بەندەر عەباس هیچ کاردانەوەیەکی نەنواند بەرامبەر بەم ڕووداوانە[(٩١٩)].

هەروەك لە پێشوودا ئاماژەمان پێکردووە، شا حوسێن لە دوای شا سلێمان دەسەڵاتی وەرگرت، کاروباری وڵات لە سەردەمی ئەو (شا)یە لە دەست پیاوانی ئاینی بووە، کە سەردەمەکەی بە توندڕۆیی شیعەگەری ناوزەد دەکرێت، کە تیایدا بە توندترین شێوە ڕەفتار لەگەڵ **سونە** ئاینزاکان کراوە بەشێوەیەك داپڵۆسینی **سونە** ئاینزاکان گەیشتە ڕادەیەکی زۆر کە بوو بە فاکتەرێك بۆ ئەوەی بارودۆخی ناوەخۆیی ئێران بەرەو خراپی بڕوات بەهۆی سەرهەڵدانی **ڕاپەڕین** و هەڵگەڕانەوە لە زۆرینەی ناوچە و هەرێمەکانی، هەروەها دووچاری هێرشی دەرەکیی ببێتەوە لەلایەن ئەفغانە غەلزائییەکان لە قەندەهار و دەوڵەتی یەعاربە لەعومان.

لەو سەردەمەدا چەندین هۆزی عارەبی لە کەنداو دەرکەوتبوون کە هێرش و پەلامارەکانیان بۆ سەر کەنارەکانی کەنداو چڕ کردبۆوە، لە بەهێزترینیان هۆزەکانی

---

(٩١٦) عبدالحسين زرين كوب، منبع پيشين، ص٦٩٤-٦٩٥ . لەبارەی داگیرکاری پورتوگالییەکان بۆ ناوچەکە و تێکچوونی پێوەندییەکانیان لەگەڵ شا عەباسی یەکەم بگەڕێوە بۆ: راجر سيوری، منبع پيشين، ص ص١١٠-١١٤.

(٩١٧) شواليه شاردن، منبع پيشين، ص١٨٦٧.

(٩١٨) جواد موسوی دالينی، ليدا مودت، منبع پيشين، ص٤٣.

(٩١٩) عبدالعزيز سليمان نوار، المصدر السابق، ص ٧٨ .

قەواسم[920] بوو کە لەژێر هەژموونی دەوڵەتی یەعاربە دابوون کە دەسەڵاتیان درێژ دەبۆوە لە باکوور و باشووری کەنداوی عارەبی و مەسقەت تاکو دەریای عارەبی[921].

ململانێی نێوان سەرۆك هۆزە عارەبییەکان لە ناوچەکە، بەتایبەت لەنێوان شێخ جەبارە فەرمانڕەوای بەحرێن و سوڵتان کوڕی سەیفی دووەم و بلعارەب کوڕی حەمیرلەعومان، زۆرجار دوورگە و کەنارەکانی کەنداو لەنێو ئەو کێشمەکێشمەدا دەگوازرایەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی لایەك[922]، لەو بارودۆخەدا، لە ساڵی ١٧١٧ز عومانییەکان[923] توانیان دوورگەی قشم و لارك و لە چەنگی سەفەوییەکان دەربهێنن،

---

(٩٢٠) ناوی ئەم هۆزانە دەگەڕێتەوە بۆ ناوی شێخەکەیان کە ناوی قاسم بـووە، گوایـە چـادرێکی لـە جلفـار هەڵداوە کە جێگەی بینینی هەموو کەشتییەکان بووە، کە بەو ناوچەیە گوزەریان کردووە، بۆیە جلفار بە ڕەئس ئەلخەیمە ناسراوە، سەبارەت بە ڕەچەڵەکی ئەو هۆزە لەنێوان **مێژوونووسان** ڕاڤەی جیاوازی بۆ کـراوە، هەنـدێك پێیان وایە دەگەڕێنەوە بۆ نەجدییەکان، لەلایەکی دیکەوە هەندێکی دیکە پێیان وایە لە عارەبـەکانی هۆلـەن، کە نیشتەجێی کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی کەنداون، بۆچوونێکی دیکە جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەو کۆمەڵەیە لـە عێراقەوە هاتوون و لەو ناوچەیە نیشتەجێ بوونە، سەردەمی گەشانەوە و دیارکەوتنی ئەو هۆزە زیاتر لە ساڵی ١٧٤١ز لــە ســەردەمی راشــد کــوڕی مەتــەر دەردەکــەوێت، بەتایبــەت دوای ئــەوەی تــوانی ســوود لــە لێکهەڵوەشانەوەی دەوڵەتی یەعاربە وەربگرێت و حوکمڕانی خۆی لەسەر جلفار توند بکات. **محمد نصر مهنـا، الخليج العربى الحديث والمعاصر( دراسه تاريخية تحليلية)، المكتـب الجـامعى الحـديث، الاسـكندرية، ٢٠٠٨م، ص٢٠٣ " صالح محمد العابد، دور القواسم في الخليج العربى (١٧٤٧ – ١٨٢٠م)، مطبعة العـانى، بغـداد، ١٩٧٦م، ص ص ٦٤ -٦٧ "محمد خير حصريه و زكى السمان، عمان ارض البطولات ومقبرة الغزاة، الطبعة الثانيية، مكتب سلسلة البحوث العربية، دمشق، ٢٠١٢، ص٦٨.**

(٩٢١) حاج میرزا حسن حسینی فسائی منبع پیشین، ص٤٩٥.

(٩٢٢) جواد موسوی دالینی، لیدا مودت، منبع پیشین، ص٤٤ " **سليم طه التكريتـى، المقاومـة العربيـة في الخليج العربى، دار الرشيد للنشر، بغداد، ١٩٨٢م، ص٨٣.**

(٩٢٣) ڕەگوڕیشەی ناوی عومان دیار **نییە**، هەندێك پێیان وایە ئـەم نـاوە بـەواتای ئاشـتی دێـت، هەرچـی (ياقوت الحموى)یە کە لە سەدەی ١٣ ژیاوە لە معجم بلدان جەخت لەوە دەکاتەوە کە وشەی عومان وەرگـیراوە لە وشەی ( **العمن، عامن، عمون**) واتە مانەوە و جێگیر بوون لە شوێنێك، هەروەها باس لەوەش دەکرێت کـە ناوی عومان لەناوی کەسێك وەرگیراوە بەناوی (**عمان بن سبأ بن يفثان بن ابراهيم خليل**)، ئـەم کەسـایەتییە یەکەمین عارەبی نیشتەجێی ئەو ناوچەیە بووە دوای ڕووخانی بەنداوی مـەئرەب. **شـهاب الـدين ابـى عبـدالله**

هەروەها ئابلۆقەی دوورگەی هورمز بدەن تاکو مردنی ئیمام سوڵتان کوڕی سەیفی دووەم لە ٢٠ی نیسانی١٧١٩ز، بەڵام سەرهەڵدانی شەڕی ناوەخۆ لە عومان لەسەر دەسەڵات تاڕادەیەك پاشەکشەیەك لە هێز و دەسەڵاتی عومان لە ناوچەکان بەدیکرا(٩٢٤).

هەرچەندە لەتیف عەلی خان داغستانی فەرمانڕەوای هەرێمی فارس لەساڵی ١٧٢٠ز بۆ دوورخستنەوەی ئەبازییەکان (یەعاربە) ڕوویکردە بەندەر عەباس بەمەبەستی گەڕاندنەوەی دوورگە و بەندەرەکان لە چەنگی ئەو هێزە عارەبییە، بەڵام شاڵاوەکانی میر مەحمودی ئەفغانی بەرەو کرمان بووە بەربەست لەبەردەم ئەنجامدانی ئەو کارە(٩٢٥).

بارودۆخی کەنارەکانی کەنداو هەر بەو شێوەیە مایەوە، تاکو دەرکەوتنی نادر قوولی لە گۆڕەپانی ڕووداوەکان لە ئێران، کە توانی ماوەی حوکمڕانی حەوت ساڵەی ئەفغانەکان کۆتایی پێبهێنێت و عوسمانییەکان لە ناوچە داگیرکراوەکان دەربکات، هەروەها لە ڕێگەی ڕێککەوتننامەی سیاسیی توانی رووسیای تەزاری ناچار بکات بەکشانەوەیان لە شارە داگیرکراوەکانی باکوور، کە لە بەشی یەکەمی لێکۆڵینەوەکە ئاماژەی پێکراوە.

سەدەی هەژدەیەم پەرەسەندنی فرەوانی بەخۆیەوە بینی، چونکە بەسەدەی پەرەسەندنی هێزی دەریایی ئێران لەلایەك و هۆزە عارەبییەکانی کەنداو لەلایەکی دیکەوە دادەنرێت، ئەم پەرەسەندنە و گەشەکردنەی ئێران لە ڕووی دەریاییەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سیاسەتەی تەهماسب قوولی کە لەو بوارەدا گرتیەبەر(٩٢٦)، یەکێك لە گرینگترین هۆکارەکانی بووە هاندەر بۆ تەهماسب قوولی کە گرینگی بەلایەنی هێزی

---

**یاقوت بن عبدالله الحموی الرومی البغدادی، معجم البلدان، المجلد الرابع، دار صادر، بیروت، ١٩٩٣م، ص ١٥٠ " وندل فیلیبس، تاریخ عمان، ترجمة: محمد امین عبدالله، الطبعة الخامسة، وزارة التراث والثقافة، مسقط، ٢٠٠٣م، ص٦.**

(٩٢٤) **مجموعة مؤلفین، دراسات في تاریخ الخلیج العربی الحدیث، الطبعة الأولی، دار الوراق للنشر المحدودة، بیروت، ٢٠٠٨م، ص ص ٥٢-٥٣ .**

(٩٢٥) نصرالله فلسفی، ایران وعلاقاتها الخارجیه فی العصر الصفوی(٩٠٦-١١٤٨ﻫ/١٥٠٠-١٧٣٦م)، ترجمه وتقدیم:محمد فتحی یوسف الریس، **دار الثقافة للطباعة والنشر**، القاهره، ١٩٨٩م، ص١٩٨. لەبارەی شاڵاوەکانی میر مەحمود ئەفغانی بگەڕێوە بۆ: دەروازە.

(٩٢٦) **عبدالامیر محمد امین، القوی البحریة في الخلیج العربی في القرن الثامن عشر، مطبعة اسعد، بغداد، ١٩٦٦م، ص١٢.**

دەریایی ئێران بدات، برێتی بوو لەو هێرش و پەلامارانەی هێزە دەرەکییەکان بۆ کەنارەکانی ئێران و داگیرکردنی دوورگەکانی، دەستەوەسانی هێزەکانی ئێران لە بەرامبەر ئەو هێرش و پەلامارانە، کە نادرشا پێی وابوو شەرمەزارییە بۆ ئێران کە خاوەن کەناراوێکی درێژ و بەرفرەوانە و لە هەموو لایەکەوە وڵاتانی بیانی دێن کەناراوەکانی داگیردەکەن، کەچی ئێران لە بەرامبەر ئەو پەلامارانەدا هیچ وەڵامێکی نییە بۆ بەرپەچدانەوەیان[٩٢٧].

تەهماسب قوولی گەیشتە ئەو بڕوایەی بەبێ دامەزراندنی هێزی دەریایی ناتوانێت ئەو هەڕەشانە لە وڵاتەکەی دووربخاتەوە و مەبەستە فرەوانخوازییەکانیشی لە کەنداو جێبەجێ بکات[٩٢٨]، هەروەها دەیویست لەو ڕێگەیەوە دوو مەبەست بپێکێت، یەکێکیان پارێزگاریکردن لە موڵکەکانی ئێران لە کەناراوەکانی دەریای قەزوین و کەنداو، لەگەڵ گەڕاندنەوەی ڕۆڵی چالاکانەی ئەو وڵاتە لەو شوێنانە، مەبەستەکەی دیکەیش جەختکردنەوە لەسەر پەرەپێدانی سامان و داهاتی ئێران لە ڕێگەی هاندانی بازرگانی بیانی[٩٢٩].

دەستپێکی بیرکردنەوەکانی تەهماسب قوولی بۆ دامەزراندنی کەشتیگەلی دەریایی ئێران، دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکاری سەرەکی، یەکێکیان وابەستەیە بەجەنگی کۆتایی هێنان بەدەسەڵاتی ئەفغانەکان لە ئێران، چونکە لەبەرئەنجامی شکستی ئەفغانەکان بەشێکیان لە ڕێگەی دەریاوە ڕوویانکردبووە عومان[٩٣٠]، ئەویدیی پێوەندیی ڕاستەوخۆی هەیە بەهەڵگەڕانەوەکەی محەمەد خان بلوج لە شیراز، چونکە دوای سەرکوتکردنی هەڵگەڕانەوەکە لەلایەن تەهماسب قوولی، ناوبراو ڕوویکردە لار و لەوێشەوە پەنای بردە لای عارەبەکانی هۆلە[٩٣١] لە دوورگەی کیش[٩٣٢].

---

(٩٢٧) محمد حسین میمندی نژاد، منبع پیشین، ص٣٩٦.

(٩٢٨) **محمد حسن العیدروس، التدخل الفارسي في الشؤون العمانية، مجلة ( دراسات الخليج والجزيرة العربية)، العدد(٥٥)، ذو القعدة(١٤٠٨هجري)، ص١٥٧.**

(٩٢٩) **صالح محمد العابد، المصدر السابق، ص٥٤.**

(٩٣٠) ج.ج. **لوريمر، المصدر السابق، ص١٣٨.**

(٩٣١) هۆلە ناوێکی گشتییە لەوکاتە بەهەموو ئەو هۆزانە دەوترا کە دەکەوتنە نێوان بەندەر عەباس و بەندەری بوشەهر و چەند ناوچەیەکی دیکە لە کەنداو، بەحرێن شوێنی سەرەکییان بوو، چالاکییەکانی عارەبە

تەهماسب قوولی لە ئەنجامی پەنابردنی محەمەد خان بلوج بۆ لای عارەبەکانی هۆلە، نامەیەکی تایبەتی ئاراستەی بریکارەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی هۆڵەندی[933] و کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی کرد، تێیدا داوای لە هەردوو کۆمپانیا کرد، کەشتییەکانیان بخەنە بەر دەست سوپای ئێران بەمەبەستی دەستگیرکردنی محەمەد خان بلوج[934].

بەرپرسانی هەردوو کۆمپانیاکە داواکەی تەهماسب قولیان ڕەت نەکردەوە، چونکە پێیانوابوو ڕەتکردنەوەی داواکارییەکە دەبێتە هۆکارێك بۆ تێکچوونی پێوەندییەکانیان لەگەڵ ئێران، هەروەها هیواخوازبوون بەوەی تەهماسب قوولی قەرەبووی ئەو زیانەیان بۆ بکاتەوە کە لە ئەنجامی داگیرکاری ئەفغانەکان تووشیان هاتبوو، ئەویش بەپێدانی جیاوگەی زیاتر، بەڵام تەهماسب قوولی بەڵێنی پێدان لە داهاتوودا داواکارییەکانیان بۆ جێبەجێ بکات [935]، بۆیە هەردوو کۆمپانییەکە هەریەکەیان دوو کەشتییان

---

هۆلەکان لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەم ڕوو لەفرەوانی بوو، لەنێو هاوسێکانیان بە ئازایەتی ناویان دەرکردبوو، بەڵام لەگەڵ سەدەی ١٩ ئەم هۆزانە ڕێکخستنی هۆزایەتی و ئارەزووە جەنگاوەریەکانیان لەدەستدا. بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: **صالح محمد العابد، المصدر السابق، ص٦٥.**

(٩٣٢) **محمد حسن العيدروس، المصدر السابق، ص١٥٧.**

(٩٣٣) بازرگانە هۆڵەندییەکان لەساڵی ١٥٩٢ز دوای کۆبوونەوەیان لە ئەمستەردامی پایتەخت بڕیاری دامەزراندنی ئەو کۆمپا**نییە**یاندا، دواتر لە ڕێگەی فەرمانێك کە لەلایەن ئەنجومەنی گەل لە ١٦٠٢/٣/٢٠ز دەرچوو، بەگوێرەی ئەم فەرمانە دەسەڵاتی تەواو بەخشرایە کۆمپانیاکە بۆ ئەوەی قۆرخکارییە بازرگا**نییە**کانی بکات لە ڕۆژهەڵات و دەسەڵاتی فرەوانی پێ بەخشرا بۆ بەستنی پەیماننامە لەگەڵ وڵاتان و داگیرکردنی ناوچەکان و دروستکردنی قەڵا و قایمکارییەکان و ئامادەکردنی سوپا و ڕاگەیاندنی جەنگ بۆ ئەوەی بتوانێت بەهەر شێوەیەك لە ڕکابەریدا بێت لەگەڵ کۆمپانیای هێزە ئەورووپییەکان لە ناوچەکە: **محمد حسن العيدروس، المصدر السابق، ص٣١.**

(٩٣٤) محمد حسين قدوسی، منبع پيشين، ص٢٤٢.

(٩٣٥) **ج.ج.لوريمر، المصدر السابق، ص١٤٤.**

خستەبەردەستی لەتیف عەلی خان، کە لەو ڕێگەیەوە توانرا محەمەد خان بلوچ دەستگیر بکرێت[٩٣٦].

لێرەدا دەکرێت بڵێین هەڵگەڕانەوەکەی محەمەد خان بلوچ سەرەتای دەستپێکی دامەزراندنی هێزی دەریایی ئێرانە، چونکە ڕاستەوخۆ دوای ئەو ڕووداوە ئامادەکارییەکان بۆ دامەزراندنی کەشتیگەلی ئێرانی لە هزری تەهماسب قوولی گەڵاڵە بوو، بۆیە هەر زوو کەوتە هەوڵی جێبەجێکردنی ئامادەکارییە بەراییەکان بۆ ئەم پڕۆژەیە.

## ب- ئامادەکارییەکان بۆ دامەزراندنی هێزی دەریایی ئێران

سەبارەت بە ئامادەکارییەکان بۆ دروستکردنی کەشتیگەلی ئێرانی، تەهماسب قوولی لە سەرەتای ساڵی ١٧٣٤ز هەڵسا بەناردنی شاندێکی تایبەتی بە**سەرکردایەتیی** لەتیف عەلی خان کە وەك سەرکردەی دەریایی ئێران لەلایەن تەهماسب قوولی دەستنیشانکرابوو بۆ بەندەرعەباس، بەمەبەستی کڕینی دوو کەشتی لە هەردوو کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی و هۆڵەندی[٩٣٧].

هەرچەندە داواکارییەکەی تەهماسب قوولی لە سەرەتادا لەلایەن هەردوو کۆمپانیاکە ڕەتکرایەوە، هەر لایەکیان بەبیانووی جیاواز خۆیان لە بابەتەکە دزیەوە، سەبارەت بە ئینگلیزەکان بەبیانووی ئەوەی کەشتییەکان خاوەنی تایبەتی خۆیان هەیە، ئەو دەسەڵاتەیان نییە سەودایی کڕین و فرۆشتنی لەسەر بکەن، چونکە ئەم کۆمپانیایە موڵکی حکوومەت نەبوو، بگرە سەر بەکەرتی تایبەت بوو، هەرچی هۆڵەندییەکانە زوو

---

**(٩٣٦) عدنان هرير جودة الزبيدي، عمان وسياسة نادر شاه التوسعية، رسالَة ماجستير مقدمة الى قسم التاريخ ـ كلية الاداب ـ جامعة بغداد، ١٩٨٣م، ص٨٤"**

Michael Axwathy, Nader Shah And Persian Naval Expansion in the Persian Gulf (1700-1747), Journal Of The Royal Asiatic Society, 20 January 2011, P.34.

**(٩٣٧) عبدالامير محمد امين، القوى البحرية في ...، ص١٢.**

ڕەتیان کردەوە پێیان وابوو دەبێت ڕاوێژ بەسەرکردەکانیان بکەن و ئەم بابەتە لە دەسەڵاتی ئەواندا نییە، چونکە کۆمپانیاکە موڵکی حکوومەتی هۆڵەندی بوو[٩٣٨].

لە ڕاستیدا ڕەتکردنەوەی داواکارییەکەی تەهماسب قوولی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی ئەو مەترسییانەی هەردوو کۆمپانیاکە لە دەوڵەتی عوسمانی، چونکە پێیان وابوو پێشکێش کردنی هەر یارمەتییەك بەئێران دەبێتە هۆی ڕەنجاندنی دەوڵەتی عوسمانی، هەروەها لە ئاکامی ئەو کارەش ئەگەر ئەنجامی بدەن **بەرژەوەندییە** سیاسی و ئابووریەکانیان دەکەوێتە مەترسییەوە، چونکە عوسمانییەکان هەڵوێستی توند وەردەگرن بەنیازی تۆڵەکردنەوە لە هەردوو کۆمپانیاکە[٩٣٩].

هەوڵەکانی لەتیف خان لەڕازیکردنی هەردوو کۆمپانیاکە بێهودە بوو، هەرچەندە فشاری زۆریشی خستە سەر نوێنەری کۆمپانیاکان لە بەندەر عەباس[٩٤٠]، بەرئەنجام سەرنەکەوتنی لەتیف خان لە هەوڵەکانی بووە هۆکارێك کە محەمەد تەقی خان فەرمانڕەوای هەرێمی فارس بێتە ناو بازنەی گفتوگۆکان، هەرچەندە لەلایەن نوێنەرانی هەردوو کۆمپانیاکە هەمان وەڵامی پێشووی پێدرا، بەڵام دواتر توانی بەڵێنیان لێ وەربگرێت کە چوار کەشتی لە کارخانەی کەشتی سازی لە بەندەری سوراتی هیندستان بەیارمەتی کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی بەناوی دەوڵەتی ئێران دروست بکەن[٩٤١]، بۆ ئەم مەبەستەش محەمەد تەقی خان بڕێك لە پارەی دیاری کراوی وەك پێشەکی بۆ دروستکردنی کەشتییەکان دا بە نوێنەری کۆمپانیاکە لەگەڵ واژۆکردنی هەردوولا لەسەر گرێ بەستی نێوانیان[٩٤٢].

سەرەڕای بوونی دوو کۆمپانیای گەورە کە برێتی بوون لە کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی و کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی هۆڵەندی، چەندین کۆمپانیای بچووکتری دیکە هەبوون، کە زۆرجار کەشتییەکانیان بەکرێ دەدایە دەزگە بازرگانییە

---

(٩٣٨) لورنس لكهارت، نيروى دريايى نادر شا، ترجمه: اديب **طوسى**، مجله( وحيد)، شماره(٦٨)، مرداد(١٣٨٤ه.ش)، ص٦٤٧.

(٩٣٩) جواد موسوى دالينى، ليدا مودت، منبع پيشين، ص٤٧.

(٩٤٠) لورنس لكهارت، نيروى دريايى...، ص٦٤٩.

(٩٤١) جواد موسوى دالينى، ليدا مودت، منبع پيشين، ص ص٤٧-٤٨.

(٩٤٢) همان منبع، ص٤٨.

گەورەکان، هەر ئەمەش وایکرد لەتیف خان خۆی لەم کۆمپانیا بچووکانە نێزیك بکاتەوە، بەرئەنجام توانی دوو کەشتی جەنگی گەورە بکڕێت[٩٤٣].

جێگەی ئاماژە پێکردنە زۆرێك لە دەریاوانە عارەبەکان، چەند کەشتییەکیان بە لەتیف خان فرۆشت، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ترسیان لە داهاتووی خۆیان، نەوەك لەداهاتوودا لەلایەن ئێران کەشتییەکانیان دەست بەسەردا بگیرێت و ڕێگەی کارکردنیان پێ نەدرێت[٩٤٤]، هەروەها هەندێك لە سەرۆك هۆزە عارەبەکانی کەنداو چەندین پێداویستیی پێویست بەدروستکردنی کەشتی وەك دیاری بەخشییانە هێزی دەریایی ئێران[٩٤٥]، لەو **هەلومەرجەدا** لە کۆتاییەکانی ئازاری ساڵی **١٧٣٥**ز لەتیف خان توانی شێخ ڕاشد فەرمانڕەوای باسیدو ڕازی بکات، بەفرۆشتنی دوو کەشتی بە ئێران، بەمەش کۆی گشتیی کەشتییەکانی هێزی دەریایی ئێران بوون بەچوار کەشتی[٩٤٦].

سەبارەت بەکەشتییەکانی کارخانەی کەشتی سازی لە بەندەری سورات، لە پایزی **١٧٣٦**ز دوو کەشتی جەنگی لە سورات گەیشتنە کەناراوەکانی ئێران لە کەنداو، کە هەر یەکەیان کێشی چوارسەد تەن دەبوو، هەروەها ئامادەکرابوو بەتۆپی ئاگرین، لە مەراسیمێکدا بەئامادەبوونی محەمەد تەقی خان فەرمانڕەوای هەرێمی فارس و لەتیف خان سەرکردەی گشتیی هێزی دەریای ئێران و پیاوماقوڵان و بازرگانانی دەوڵەت لەلایەن نوێنەری کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی ڕادەستی لایەنی ئێرانی کرا، بەهای

---

(٩٤٣) علی زرین قلم، سرزمین بحرین از دوران باستان تا امروز، کتابفروشی سیروس، تهران، **١٣٣٧**هـ.ش، ص٩١. لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٧٣٤ز ڕووداوێك هاتە پێش کە بووە مایەی نیگەرانی کۆمپانیا گەورەکان لە بەندەر عەباس ئەویش بڵاوبوونەوەی هەواڵی فروشتنی دوو کەشتی بە لەتیف خان للایەن دوو کەسایەتیی یەکەمیان کەسێك بوو بەناوی ویدل Weddle کە خاوەنی کەشتییەك بوو بەناوی **patna** وکەشتییەکەی دیکە بەناوی **Ruperall** کە خاوەنەکەی ناوی کوك Cook بوو فرۆشران. لورنس لکهارت، نیروی دریایی...، ص ص٦٤٨-٦٤٩ .

(٩٤٤) جواد موسوی دالینی، لیدا مودت، منبع پیشین، ص٤٨ " **محمد نصر مهنا، المصدر السابق، ص١١٧.**

(٩٤٥) مینورسکی، ایران در زمان نادر شا، ترجمە: رشید یاسمی، دنیای کتاب، تهران، ١٣٨١هـ.ش، ص٣٦٣.

(٩٤٦) لورنس لکهارت، نیروی دریایی...، ص٦٤٩ "

R.J. Barendse, Arabian seas 1700-1763: The western Indian Ocean in the eighteen century , Volume. I, Leiden,The Netherlands, Boston:Brill, 2009,P.294.

ئەو کەشتییانەش بەبڕی حەوت هەزار تومان کە ئەو کات بەرامبەر ٢٣٥٠٠ باون بوو خەملێندرا[٩٤٧].

نادرشا لە ڕێگەی فەرمانێکەوە داوای لە لەتیف خان کرد، هەرچی زووە هەڵسێت بەفرەوانکردنی بەندەری بوشەهر[٩٤٨]، لەهەمان کاتدا بیکاتە بنکەیەك بۆ کەشتیگەلی ئێرانی، لەگەڵ کارخانەیەکی دروستکردنی چەك و تەقەمەنی بۆ کەشتییە جەنگییەکان لە بەندەر عەباس دابمەزرێنێت[٩٤٩]، هەروەها بەندەری بوشەهر وەك بارەگەی سەرەکیی هێزی دەریایی ئێران دەستنیشانکرا، لە سەرەتادا ئەو بەندەرە قەڵایەکی کۆنی پورتوگالییەکانی تێدابوو، کەلەلایەن لەتیف خان بەفەرمانی نادر شا نۆژەنکرایەوە و چەند باڵەخانەیەکی دیکەیش دروستکران[٩٥٠]، دواتر ناوی بەندەرەکە لە بوشەهر گۆڕدرا بۆ بەندەری نادری[٩٥١].

لەلایەکی دیکەوە نادر شا نەخشەی کێشا بۆ دروستکردنی کەشتیگەلی دەریایی لە کەناراوەکانی ڕۆژهەڵات لە دەریای خەزەر، بەمەبەستی باڵادەستبوونی ئێران بەسەر ئەو

---

(٩٤٧) علی زرین قلم، منبع پیشین، ص٩٧ " ویلم فلور، هلندیان در جزایر خارگ، ترجمە: ابوالقاسم سری، توس، تهران، ص١٣٧١هـ.ش، ص٢٨٤.

(٩٤٨) ناوی بوشەهر یاخود ئەبوشەهر لە سەرچاوە کۆنە جوگرافییەکان بەهیچ شێوەیەك نەهاتووە، هەندێك پێیان وایە وشەی بوشەهر لەبوم ئەردەشیر وەرگیراوە، لە سەردەمی نادرشا ئەو کاتەی بەحرێن کەوتە دەست سوپای ئێران، فەرمانڕەوایەتی بەحرێن و ناوچەکانی دەوروبەری درا بە شێخ ناسر کوڕی مەزکور، ئەویش هەڵسا بەگواستنەوەی کاروباری بازرگانی لە ریشەهر کە فەرسەخێك لە بوشەهرەوە دوورە، لەبەر باشی لەنگەرەکانی بۆ کەشتییە بازرگانی**یە**کان، چونکە لەنگەرەکانی ریشەهر زۆر باش نەبوون بۆ کەشتییەکان بەتایبەت لەکاتی هەڵکردنی لافاو بای توند، دواتر ناوچەی بوشەهر بەهۆی باشی شوێنەکەی و زیادبوونی ئاڵوگۆڕی بازرگانی گرینکی و بایەخی زیادی کرد. **محمد حسین سعادت**، تاریخ بوشهر، تصحیح و تحقیق: عبدالرسول خیراندیش، عماد الدین شیخ الحکمایی، چاپ اول، **میراث** مکتوب باهمکاری نشر کازرون**ییە**، تهران، ١٣٩٠هـ، ش، ص١٧.

(٩٤٩) علی زرین قلم، منبع پیشین، ص١٠٠ " **محمد رضا حافظ نیا**، خلیج فارس و نقش و استراتژیك تنگە هرمز، سمت، تهران، ١٣٧١هـ.ش، ص٢٢٦.

(٩٥٠) لکهارت، نادرشا، ص١٣١ " جواد موسوی دالینی، لیدا مودت، منبع پیشین، ص٥٠.

**(٩٥١) احمد مصطفى ابو حاكمة، تاريخ الكويت الحديث( ١٧٥٠م – ١٩٦٥م)، الطبعة الأولى، ذات السلاسل، الكويت، ١٩٨٤م، ص٤٢.**

دەریایە، هەروەها بتوانێت لەو ڕێگەیەوە کۆمەك و خۆراك بەئاسانی بۆ هێزەکەی ڕەوانە بکات، کە بەرەنگاریی لەزگییەکان دەبوونەوە[٩٥٢].

جان ئالْتون J.Alton کە دواتر بە جەمال بیگ ناوبانگی دەرکرد، ئەو کەسایەتییە ئینگلیزیە بوو، کە یارمەتیدەر و نەخشە داڕێژەری نادرشا بوو بۆ کۆنترۆڵکردنی دەریای خەزەر، هەر بۆیەش لەلایەن نادرشا لە ساڵی ١٧٤٣ز کرا بەسەرۆکی هەموو کەشتی سازانی ئێران[٩٥٣]، هەروەها دامەزراندنی سەنتەری کاری کەشتی سازی لە لەنگرود لەلایەن جان ئالتون بووە هۆکارێك کە لەلایەن ڕووسەکانەوە بەچاوێکی دوژمنانە چاوەدێری کار و چالاکییەکانی بکەن[٩٥٤]، هەرچەندە بۆ ماوەیەك نادر شا سوودی وەرگرت لە جان ئالتون، بەتایبەت لە ڕەوانەکردنی ژمارەیەکی زۆر لە کارگەرانی کەشتی سازی بۆ بوشەهر، بەڵام بەکوژرانی نادرشا ئەو پڕۆژە گەورەیە بەئەنجام نەگەیاندرا[٩٥٥].

زۆرێك لە بەڵگەنامە عارەبی و فارسییەکان ژمارەی کەشتییە دەریاییەکانی ئێران لە سەردەمی نادر شا بە٥٠ — ٦٠ کەشتی لە جۆری کەشتی گەورە و بچووك ئاماژە پێ دەکەن[٩٥٦]، بەڵام ئەوەی لە ئاماژەکانی کارمەندانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی باسکراوە، لە بەندەری عەباس هێزی دەریایی ئێران خاوەن ٣٠ کەشتی بووە[٩٥٧]، کەواتە بەشێوەیەکی گشتیی ژمارەی کەشتییەکانی ئێران لەنێوان ٤٠ — ٤٥کەشتی بووە.

دەکرێت بڵێین هەوڵەکانی نادر شا بۆ دەستەبەرکردنی کەشتی و دامەزراندنی هێزی دەریایی، زیاتر بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی لە کەناراوەکانی کەنداو، هەروەها بۆ مسۆگەرکردنی هەوڵە فرەوانخوازییەکانی لە ناوچەکە بوو، چونکە گەیشتبووە ئەو

---

(٩٥٢) جرج.ن.کرزن، **ایران و قضیه ایران**، ترجمە:غلامعلی وحید مازندرانی، جلد دوم، چاپ سوم، انتشارت علمی و فرهنگی، تهران، ١٣٦٧هـ.ش، ص٤٧١ "

P. SYKES, Op. Cit, P.366.

(٩٥٣) بیژن بیگلری، یك خارجی در خدمت نیروی دریایی نادرشاه، مجله یغما، شماره ٣٤٠، تهران، دی ١٣٥٥هـ.ش، ص٦٠٥ ؛ عبدالهادی حائری، منبع پیشین، ص١٩٥.

(٩٥٤) **رضا** زاده **شفق، المصدر السابق، ص٧٨.**

(٩٥٥) همان منبع، ص٦٠٦.

(٩٥٦) جواد موسوی دالینی، لیدا مودت، منبع پیشین، ص٥٠.

(٩٥٧) **کاظم باقر علی، المصدر السابق، ص٣٦.**

بڕوایەی کە لە دوای ئەو هەنگاوانە زۆر بەئاسانی دەتوانێت پرۆژە فرەوانخوازییەکانی کە لە هزری خۆیدا نەخشەی بۆ کێشابوو جێبەجێ بکات وەك داگیرکردنی بەسرە و بەحرێن، دواتریش عومان بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی.

## ج- هەوڵە بەراییەکانی هێزی دەریایی ئێران لەکەنداو

١- هەڵمەتەکانی هێزی دەریایی ئێران بەمەبەستی داگیرکردنی بەسرە ١٧٣٥ز:

یەکەمین هەنگاوی فرەوانخوازی تەهماسب قوولی لە ڕێگەی دەریاوە بەئاراستەی بەسرە بوو، بەتایبەت دوای ئەو گرژی و ئاڵۆزیەی کە لە نیسانی ساڵی ١٧٣٥ز لەنێوان بەشێك لە هۆزە عارەبییەکان و دەوڵەتی عوسمانی هاتبووە ئاراوە، باشترین هەلیدا بەئێرانییەکان کە ئەو بارودۆخە بۆ خۆیان بقۆزنەوە و هێرش بکەنە سەر شاری بەسرە[٩٥٨].

هەرچەندە ڕێککەوتننامەی ئاشتی لەنێوان والی بەغدا و نادرشا لە ئارادابوو، کەچی نادرشا دووبارە هەڵمەتەکانی بەرامبەر بەعێراق دەست پێکردەوە، بەڵام ئەمجارەیان قورسایی هەڵمەتەکەی خستە سەر بەسرە، بۆ ئەم مەبەستە لە نیسانی ١٧٣٥ز بە**سەرکردایەتیی** لەتیف خان بەیاوەری سێ کەشتی لە جۆری (غراب)[٩٥٩] و لەگەڵ چەندین کەشتی دیکە، هاوکات لەگەڵ هێزێکی وشکانی کە پێك دەهاتن لە هەشت هەزار جەنگاوەر ڕوویان لە شاری بەسرە کرد[٩٦٠]. هەرچەندە پێ دەچێت زیادەڕۆیی لە ژمارەی کەشتییەکاندا هەبێت، چونکە لە ساڵی ١٧٣٥ز کۆی گشتیی کەشتی ئێرانی لە چوار دانە تێپەڕی نەکردووە بەگوێرەی لێکدانەوەی لۆکهارت کە لە پێشتر ئاماژەمان پێکردووە.

لەتیف خان پاش هاتنە ناو ئاوی شەتولعەرەب ڕوویکردە بەسرە، بێ ئەوەی چاوەڕوانی هێزە وشکانییەکە بکات، چونکە پێی وابوو دەتوانێ سەرکەوتن مسۆگەر

---

(٩٥٨) لکهارت، نادرشا، منبع پیشین، ص١٣١ " **عدنان هرير جودة الزبيدي، المصدر السابق، ص٨٧** .

(٩٥٩) غراب یاخود گراب وشەیەکی عارەبی ڕەسەنە، ئەم جۆرە کەشتییە بە فرەوانی لە سەدەی ١٦، ١٧، ١٨ لە کەناراوەکانی مالابار و و دەریایی سوور و کەنداو بەکارهاتوون، ئەم جۆری کەشتییە لە رووی قەبارە جیاوازیی تێدا بەدی دەکرێت، بەشێوەیەك جۆری قەبارە گەورە، هەروەها جۆری بچووکیشی هەیە، بەشێوەیەکی گشتیی کەشتی غراب ئەو کەشتییەیە کە خاوەن سێ ستوونە. **عبدالامير محمد امين، القوى البحرية في ...، ص١٢.**

(٩٦٠) **علاء موسى كاظم نورس، الصراع العثمانى – الفارسي واثره ...**، ص ص٥٨-٥٩.

بکات، بێ ئەوەی پێویستی بەپاڵپشتی هێزی وشکانی بێت[٩٦١]، لەلایەکی دیکەوە والی بەسرە دوای ئەوەی ئاگەدارکرایەوە لە هەڵمەتە چاوەڕوان نەکراوەکەی هێزی ئێران، بەپەلە داوای لە مارتن فرینچ Martin French هەڵسوراوی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی لە بەسرە کرد بەپێدانی ئەو دوو کەشتییەی Royal George و Dean کە لە بەندەری بەسرە لەنگەریان گرتبوو[٩٦٢].

دیارە ئەم داواکارییە لەلایەن مارتن فرینچ بەدوودڵیەوە ڕەتکرایەوە، چونکە مەترسی تۆڵەسەندنەوەی فارسەکانی هەبوو، بەڵام کەشتییەکان بەزۆری لەلایەن والی بەسرە دەستیان بەسەردا گیرا، دواتر بەڕێکران بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێزی دەریایی ئێران[٩٦٣].

لەمیانەی بەرەنگاربوونەوەی هەردوو هێز لە شوێنێکی بەرتەسك لە ئاوی شەتولعەرەب، لە جەنگێکی توند کە سێ ڕۆژی خایاند، دوای ئەوەی کەشتییە ئینگلیزییەکان پاش هەڕەشەی والی بەسرە، بەبێ ویستی خۆیان کەوتنە ناو جەنگێکی نەویستراو، کە ئاکامەکەی بەشکانی هێزی دەریایی ئێران کۆتایی هات و پاشەکشەیان کرد بەئاراستەی بەندەری بوشەهر[٩٦٤]، شکست خواردنی هێزی دەریایی ئێران لەلایەن نادرشا زۆر بەتوندی ئیدانە کرا، یەکەمین کاردانەوەشی لادانی لەتیف خان بوو لە پۆستەکەی، چونکە پێی وابوو لەتیف خان هۆکاری شکست خواردنەکەی سوپای ئێران بووە، لەهەمان کاتدا لۆمەی کرد بەوەی چاوەڕوانی هێزی وشکانی نەکردووە[٩٦٥].

دەکرێت بڵێین هەڵەکانی لەتیف خان و گوێڕایەڵ نەبوونی بەو پلانەی کە دارێژرا بوو بۆ داگیرکردنی شاری بەسرە لەلایەك و بوونی دوو کەشتی ئینگلیزی لە بەندەری بەسرە لەلایەکی دیکەوە، دیاری و خەڵاتێکی گەورەی بەخشییە دەسەڵاتدارانی بەسرە

---

(٩٦١) محمد حسین قدوسی، منبع پیشین، ص٢٥٤.

(٩٦٢) **عبدالامیر محمد امین، القوی البحریة في ...، ص١٣.**

(٩٦٣) علي شاكر علي، المصدر السابق، ص١٩٤ " لكهارت، نادرشا، ص١٣٢.

(٩٦٤) محمد حسین قدوسی، منبع پیشین، ص٢٥٤ " اصغر جعفر ولدانی، منبع پیشین، ص١٨.

(٩٦٥) لكهارت، نادرشا، ص١٣٢. لە دوای ئەم ڕووداوە تا ڕادەیەك بەرژەوەندییەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی لە ئێران کەوتنە بە هەڕەشە و تانە لێدان، بەواتایەکی دیکە بەدرێژایی فەرمانڕەوایی نادرشا پێوەندییەکانی لەگەڵ کۆمپانیای ناوبراو ساردبوو. عبدالهادی حائری، منبع پیشین، ص١٩٤.

بەتایبەتی و دەوڵەتی عوسمانی بەگشتی، چونکە ئەم دوو ئامرازە بوونە هۆکار بۆ ئەوەی شاری بەسرە لە داگیرکردن لەسەر دەستی سوپای ئێران ڕزگاری ببێت.

٢- داگیرکردنی بەحرێن ١٧٣٦ز:

شکستخواردنی سوپای ئێران لە دەستگرتنیان بەسەر بەسرە، نەبووە بەربەست لەبەردەم هەوڵە فرەوانخوازییەکانیان لە کەنداو، چونکە هەر لە سەرەتای ساڵی ١٧٣٦ز بەفەرمانی نادرشا جارێکی دیکە هەوڵەکان بەگەڕخران بۆ بەهێرشکردنە سەر بەحرێن[٩٦٦]، چونکە نادرشا پێی وابوو بەحرێن خاڵێکی گرینگە لە سیاسەتە فرەوانخوازییەکانی ئێران لە کەنداودا، هەروەها سەنتەرێکی باشە بۆ ڕاوکردنی **مرواری**[٩٦٧]، هەر بۆیە چەند ڕۆژێك لە دوای مەراسیمی تاجگوزاری لە موغان، نادرشا فەرمانی بەمحەمەد تەقی خان فەرمانڕەوای هەرێمی فارس کرد، بۆ گەڕاندنەوەی بەحرێن بۆ ژێر شکۆی دەوڵەتی ئێران[٩٦٨].

نادرشا لە هەوڵی ئەوەدا بوو بەهەر جۆرێك بێت بەحرێن بخاتەوە ژێر دەسەڵاتی، چونکە لەساڵی ١٧١٧ز شێخ جەبارەی فەرمانڕەوای بەحرێن لەبەر خراپی باردۆخی ئێران لەو کاتدا توانی بووی دەسەڵاتی خۆی بەسەر بەحرێن و دوورگەی کیش و بەشێك لە کەناراوەکانی ئێران بسەپێنێت، هەروەها بانگەشەکردن بۆ فەرمانڕەوایی خۆجێیەتی لەناوچەکە[٩٦٩].

سەبارەت بەلەتیف خان دووبارە پاش مەراسیمی موغان لەلایەن نادرشا گەڕاندرایەوە سەر پۆستەکەی پێشووی[٩٧٠]، هەروەها ئەرکی هێرشکردنە سەر بەحرێنی پێ ڕاسپێردرا، بۆ ئەم مەبەستە لەتیف خان توانی خاوەنی کەشتی ئینگلیزی بەناویNormtom Berland کە لە بەندەری بوشەهر لەنگەری گرتبوو، ناچار بکات بەفرۆشتنی کەشتییەکەی بە٥٠٠٠ تومان کە

---

(٩٦٦) **عبدالامیر محمد امین، القوی البحریة في ...، ص١٥.**

(٩٦٧) **محمد نصر مهنا، المصدر السابق، ص١١٦.**

(٩٦٨) **احمد مصطفی ابو حاکمه، تاریخ شرق الجزیرة العربیة ١٧٥٠-١٨٠٠م نشا وتطور الکویت والبحرین، ترجمة محمد امین عبدالله، بیروت، بدون تاریخ، ص٥٥** " محمد جواد مشکور، منبع پیشین، ص٢٥٣.

(٩٦٩) جواد موسوی دالینی، لیدا مودت، منبع پیشین، ص٥١.

(٩٧٠) عیسی گلوردی، جغرافیای جزایر ایرانی خلیج فارس ( بوموسی، تنب بزرگ و تنب کوچك)، انتشارات سازمان جغرافیایی نیروهای مسلح، تهران، ١٣٨١هـ.ش، ص١٠٢.

ئەو کات بەرامبەر بوو بە ١٧هەزار پاون پاش ئەوەی هەڕەشەی لێکرد کە دەست دەگرێت بەسەر کەلوپەلەکانی ناو کەشتییەکە[(٩٧١)].

دوای ئەو ڕووداوە لەتیف خان بەسوپایەکی چوار هەزار سەربازییەوە ڕوویکردە بەحرێن، کە ئەو کات شێخ جەبارە فەرمانڕەوای بەحرێن بەمەبەستی بەجێگەیاندنی فەریزەی حەج ڕوویکردبووە مەککە[(٩٧٢)]، کەسێکی لە جێگەی خۆی دانابوو وەك فەرمانڕەوای ناوچەکە، بەڵام هێزەکانی ئێران توانیان قەڵاکانی بەحرێن داگیربکەن، هەرچەندە بەرگرییەکی توندیش لەلایەن خەڵکی ناوچەکە دژ بەسوپای ئێران ئەنجامدرا، بەڵام بێهودە بوو[(٩٧٣)].

لەتیف خان بۆ ئەم هێرشە پشتی بەست بەهێزێکی عارەبی کە دانیشتوی کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی کەنداو بوون، وەك عارەبەکانی مەتاریش و بوشەهر و هۆلە، هەروەها شێخ عەبەس و براکەی شێخ ناسر مەزکور کە لە عارەبەکانی مەتاریش بوون کرانە فەرمانڕەوای بەحرێن[(٩٧٤)]، هەرچەندە سوپای ئێران سەرکەوتوو نەبوو لەدەستگیرکردنی شێخ جەبارە، بەڵام توانیان دەسەڵاتی ئێران جارێکی دیکە بگەڕێننەوە سەر بەحرێن، کە لە ساڵی ١٧١٧ز لەدەستیاندا بوو، هەروەها کلیلی قەڵاکانی بەحرێن بەدیاری بۆ نادرشا نێردران، دواتر بنکەی سەربازی ئێران لە ناوچەکە جێگیر کرا[(٩٧٥)].

داگیرکردنی بەحرێن لەلایەن سوپای ئێران، بووە هاندەرێك بۆ نادرشا تاکو هەوڵە فرەوانخوازییەکانی چڕتر بکاتەوە لە ناوچەکەدا، بۆیە هەر دوای داگیرکردنی بەحرێن بیرکردنەوە لە داگیرکردنی عومان دەبێتە کاری سەرەکیی نادرشا، چونکە ئێران بەداگیرکردنی عومان دەسەڵاتی تەواوی دەخاتە سەر کەنداو، بەو پێیەی عومان گرینگترین هێزی لۆکاڵی بووە لە ناوچەکە و کەشتیگەلییەکەشی بەهێزترین کەشتیگەلی دەریایی بووە لە سەدەی حەڤدەدا [(٩٧٦)].

---

(٩٧١) **رضا** شعبانی، **میرزا محمد تقی...**، ص ص٢٢١-٢٢٢ ؛ لورنس لکهارت، نیروی دریایی ...، منبع پیشین، ص٦٥٠.

(٩٧٢) محمد حسین سعادت، منبع پیشین، ص٥٥.

(٩٧٣) **عباس اقبال اشتیانی، مطالعاتی در باب بحرین و جزایرو سواحل خلیج فارس**، چاپ اول، **اساطیر، تهران، ١٣٨٤ه.ش، ص٧١٠** "

Michael Axwathy, Nader Shah…, P.35.

(٩٧٤) **محمد نصر مهنا، المصدر السابق، ص١١٦" سليم طه التكريتي، المصدر السابق، ص٨٣.**

٩٧٥)حاج میرزا حسن حسینی فسائی منبع پیشین، ص٥٣٩ " عیسی گلوردی، منبع پیشین، ص١٠٣.

(٩٧٦) **عبدالامير محمد امين، القوى البحرية في ...، ص١٥.**

## تەوەری دووەم:

## چالاکی و هەڵمەتەکانی یەکەم و دووەمی سوپای ئێران بۆ عومان ١٧٣٧-١٧٣٩

کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەیەم و سەرەتاکانی سەدەی هەژدەیەم بەسەردەمی زێڕینی عومان هەژمار دەکرێت، چونکە لەو ماوەیەدا عومانییەکان لە ململانێی بەردەوام دابوون لەگەڵ پورتوگالییەکان، کە توانیان زۆر ناوچە لە هیندستان و ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا لەژێر چەنگیان دەربهێنن، یەکێك لە گرینگترین هۆکار کە یارمەتیدەری عومانییەکان بوو بۆ گەشەکردنی دەسەڵاتی سیاسییان لە ناوچەکە برێتی بوو لەو کەشتیگەلە دەریاییە بەهێزەی کە عومانییەکان پشتیان پێ دەبەست، هەروەها ڕۆڵی ئیمام سەیف کوڕی سوڵتانی یەکەم ١٦٩٢ — ١٧١١ لەو ماوەیەدا کە توانی عومانییەکان لە یەك بەرەدا کۆبکاتەوە [٩٧٧].

هەروەها لەڕووی سیاسەتی دەرەوەشدا توانی جگە لە کەنداو هەژموونی خۆیان لەسەر زۆرێك لە بەندەر و دوورگەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا وەك ممباسە و دوورگەی سەوز و کلوە بسەپێنن بەشێوەیەك عومانییەکان هەژموونیان بەتەواوی لەسەر کەناراوەکانی کەنداو و کەناراوەکانی دۆڵی سند لە ڕۆژهەڵات و کەناراوەکانی ڕۆژهەڵاتی

---

(٩٧٧) طارق نافع الحمداني، الخليج والجزيرة العربية بين القرن السادس عشر والقرن العشرين، الطبعة الأولى، دار الوراق، بغداد، ٢٠٠١م، ص ص ٣٤-٣٥.

ئەفریقیا لە ڕۆژئاوا درێژ دەبۆوە[٩٧٨]، لەهەمان کاتدا لە ڕووی ئابوورییەوە مەسقەت ببووە سەنتەری سەرەکیی دابەشکردنی بازرگانی لە کەنداو، هەروەها وەك بەندەرێکی سەرەکیش لە ئۆقیانووسی هیندی، لەلایەکی دیکەوە عومانییەکان هەر لە سەردەمی ئیمام سوڵتان کوڕی سەیفی دووەم ١٧١١-١٧١٨ توانیان لە ساڵی ١٧١٧ز دەست بگرن بەسەر بەحرێن کە لەژێر شکۆی ئێراندا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەر لە هەمان ساڵدا کۆنترۆڵی دوورگەی قشم و لارك و هورمزیان کرد[٩٧٩].

دەکرێت بڵێین فرەوانبوونی دەسەڵاتی عومانییەکان مەترسی زۆری لەسەر ئێران دروستکرد، بەڵام بەمردنی ئیمام سوڵتان کوڕی سەیفی دووەم باردۆخی سیاسیی عومان تێکچوو بەهۆی چێبوونی ناکۆکی و ململانێ لەسەر دەسەڵات، لە بەرامبەریشدا ڕۆڵی نادرشا لە یەکخستنەوە و گەڕاندنەوەی شکۆمەندیی دەسەڵاتی ناوەندی لە ئێران و هەوڵەکانیشی بۆ جێبەجێکردنی پرۆژە فرەوانخوازییەکانی وایکرد لە داهاتوودا عومان ببێتە ئامانجی سەرەکیی لەشکرکێشییەکانی سوپای ئێران.

### أ- هۆکارەکانی چاوتێبڕینی نادرشا لەعومان:

داگیرکردنی بەحرێن لەلایەن سوپای ئێران، بووە هاندەرێك بۆ ئەوەی ئارەزووەکانی نادرشا ڕوو لەزیادبوون بکات بەئاراستەی داگیرکردن و دەست بەسەرداگرتنی کەنداو[٩٨٠]، هەروەها لە دوای دەرفەتێك دەگەڕا بۆ ئەوەی جارێکی دیکە چالاکییە دەریاییەکانی بنوێنێت، بۆ ئەم مەبەستە عومانی کردە ئامانج بۆ ئەنجامدانی چالاکییە دەریاییەکانی[٩٨١].

---

(٩٧٨) سعيد بن محمد الهاشمي، المصدر السابق، ص٢٦٠.

(٩٧٩) ابو سليمان بن محمد بن عامر ابن راشد المعولي، قصص واخبار جرت في عمان، تحقيق: عبدالمنعم عامر، مطابع سجل العرب، القاهرة، ١٩٧٩م، ص١٢٢ "

Selection from the Records of the Bombay Government, No.XX IV,Historical and other Information connected with the province of Oman,Muscat,Bahrain,and other places in the Persian Gulf,( Bobay , Bobay Education society press- 1856),P.5.

بۆ بەکارهێنانی ئەو سەرچاوەیە لە داهاتوودا تەنها ئاماژە دەکەین بە (Selection from the Records...)

(٩٨٠) ماكس فون اوبنهايم، رحلة الى مسقط عبر الخليج، مراجعة وتدقيق: محمود كبيبو، الطبعة الثانية، دار الوراق للنشر، بغداد، ٢٠٠٩م، ص ص٧٩-٨٠.

(٩٨١) محمد حسن العيدروس، التدخل الفارسي ....، ص١٥٧.

داگیرکردنی عومان هیوای سەرەکیی نادرشا بوو، چونکە لە ڕێگەی دەستگرتنی بەسەر عومانەوە دەتوانێت باڵادەستبوونی ئێران بەسەر هەموو کەنداودا مسۆگەر بکات[(٩٨٢)]، هەروەها زاڵبوونی ئێران بەسەر هێزی دەریایی عومان، دەبێتە سەرکەوتنێکی مەزن بۆ ئێرانییەکان، چونکە داگیرکردن و زاڵبوونیان بەسەر عومان دەبێتە هۆکارێك کە ئێران لە بەهێزترین هێزی دەریایی لە ناوچەکە ڕزگاریان ببێت، بەمەش ئێران دەتوانی شکۆی دەریایی خۆی زامن بکات بێ ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ هیچ ڕکابەرێك لە ناوچەکەدا[(٩٨٣)].

عومانییەکان لەو ماوەیەدا بەهێزترین هێزی دەریایی بوون لە ئاوەکانی ڕۆژهەڵات، ئەوەی زیاتر یارمەتیدەریان بوو، توانیان جۆرێکی نوێ لە کەشتی چێ بکەن لەسەر شێوازی ئەورووپی پێشکەوتوو، لە هەمان کاتدا وازهێنان و دوورکەوتنەوەیان لە کەشتییە کۆنباوەکان[(٩٨٤)]، بۆ ئەم مەبەستە کاپتن شارلز لوکیرCharles lokyer لەئایاری ١٧٠٦ز سەردانی مەسقەت دەکات، زۆر بەڕاشکاوانە باس لە هێزی دەریایی عومان دەکات و دەڵێت: "کەشتییەکانیان لە سورات چێکرابوون، کە ١٤ کەشتی جەنگی و ٢٠ کەشتی بازرگانی لەوێ هەبوون، لەنێو ئەم کەشتییانەدا بەشێوەیەگی گشتیی هیچ کامیان بەدی ناکرێت کە کەمتر لە٢٠ تۆپی ئاگرینی هەڵگرتبێت"[(٩٨٥)].

لەلایەکی دیکەوە ئەلکسەندەر هاملتون گەڕیدەی ئینگلیزی لە ساڵی ١٧١٥ز کە سەردانی مەسقەتی کردووە زۆر بەڕوونی باس لە پێکهاتەی کەشتیگەلی عومانی لەو کاتەدا دەکات و دەڵێت: "یەك کەشتی خاوەن ٧٤ تۆپی ئاگرین و دوو دانەیان خاوەن ٦٠ تۆپی ئاگرین و دانەیەکیان خاوەنی ٥٠ تۆپی ئاگرین بوون، هەروەها ١٨کەشتی دیکە کە لە ڕووی قەبارەوە بچووکتر بوون هەر دانەیەکیان ١٢ -٣٢ تۆپی ئاگرینی

---

(٩٨٢) **تشارلز بلجريف، ساحل القراصنة، ترجمة: عيسى امين، الطبعة الأولى، مؤسسة العربيـة للدراسـات والنشر، بيروت، ٢٠٠٥، ص٤٩.**

(٩٨٣) **عبدالامير محمد امين، القوى البحرية في ....، ص١٥" عبداللطيف الرحى، فؤاد شهاب، قيام الدولة البوسعيدية (الاسباب والنتائج)، مجلة ( المؤرخ العربى)، العدد(٤٩)، الامانة العامة المؤرخين العرب، بغداد، (١٤١٤ه)، ص٣٥.**

(٩٨٤) **طارق نافع الحمدانى، المصدر السابق، ص٣٣.**

(٩٨٥) **المصدر النفسه، ص٣٥.**

هەڵگرتبوو، لەگەڵ ئەوانەش هەندێك كەشتی لە جۆری ترانكی[(٩٨٦)] و كەشتی سەوڵدار كە هەر یەكەیان توانای هەڵگرتنی ٤-٨ تۆپی ئاگرینیان هەبوو"[(٩٨٧)].

سەبارەت بەهێزە دەریایەكەی عومان، زۆرینەی كات مەترسی بوونە لەسەر كەناراوەكانی ئێران، بەشێوەیەك هەر كاتێك هێرشیان كردبێتە سەر كەناراوەكانی ئێران، هیچ بەربەستێك و بەرەنگاربوونەوەیەكی پێویست لەلایەن ئێرانییەكان بەئەنجام نەگەیاندراوە، هەر لە كۆتاییەكانی سەدەی حەڤدە ئێرانییەكان بەیارمەتی پورتوگالییەكان بەرەنگاری عومانییەكان بوونەوە، بەڵام خۆیان نەگرت بەرامبەر بەعومانییەكان[(٩٨٨)]، ئەمەش وایكرد هەریەكە لە ئینگلیزەكان و هۆڵەندییەكان خۆیان بەدوور بگرن لە ئەنجامدانی هەر كارێكی هاوشێوەی پورتوگالییەكان دژ بە عومان[(٩٨٩)].

مەترسییەكانی ئێران لە هەڕەشە و پەلاماردانەكانی عومانییەكان بۆ سەر كەناراوەكانی ئێران لە باشور، بووە هۆكارێك كە پاڵ بەنادرشا بنێت تۆڵە لە عارەبەكانی كەنداو بكاتەوە، لە سەرووی هەمووشیانەوە عومانییەكان، چونكە گەیشتە ئەو بڕوایەی هەڕەشە و مەترسییەكانی عومانییەكان كۆتایی نایەت تاكو عومانییەكان ملكەچ نەكات، ئەویش لە رێگەی داگیركردنی مەسقەتەوە بەئەنجام دەگات[(٩٩٠)].

لەلایەكی دیكەوە شوێن و پێگەی عومان لە ناوچەكە پاڵنەرێكی باش بوو بۆ هاندانی نادرشا كە چاوبڕێتە عومان، چونكە پێگەی جوگرافی و هەڵكەوتەی عومان كە دەڕوانێتە سەر سێ رێگەی ئاوی گرینگ وەك دەریای عارەبی و و ئۆقیانوسی هیندی و كەنداو، ئەمەش وایكردووە دەسەڵاتی بەسەر گرینگترین رێگەی بازرگانی دەریایی و

---

(٩٨٦) جۆرێكی دیكەی كەشتییە كە لەنیوەی یەكەمی سەدەی هەژدەیەم بەكارهێنانی بەربڵاوی هەبووە، بەڵام ئێستەكە ئەم جۆرە كەشتییە باوی نەماوە، شێوەی بەكارهێنانی ڕاوەستاوەتە سەر چارۆگە و سەوڵ لێدان، لەهەمان كاتدا لەو ماوەیە بۆ كاری جەنگی و بازرگانی بەكارهاتووە. **عبدالامير محمد امين، القوى البحرية في ...، ص١٢.**

(٩٨٧) وەرگیراو لە: **صالح محمد العابد، دور القواسم...، ص٤١.**

(٩٨٨) **سليم طه التكريتي، المصدر السابق، ص ص٥٢-٥٤.**

(٩٨٩) **عبدالامير محمد امين، القوى البحرية في ...، ص١٥.**

(٩٩٠) **عائشة علي السيار، دولة اليعاربة في عمان وشرق افريقيا، الطبعة الأولى، بيروت، ١٩٧٥م، ص١٩٣.**

وشکانیدا هەبێت لە کەنداو بۆ ئەورووپا و ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا[٩٩١]، بەواتایەکی دیکە داگیرکردنی عومان لەلایەن سوپای ئێران واتە زاڵبوون بەسەر شا دەماری بازرگانی ناوچەکەیە[٩٩٢].

بارودۆخی عومان لەو کات دەرفەتێکی باش بوو بۆ نادرشا کە ئاواتەکەی جێبەجێ بکات، چونکە ململانێ و ئاڵۆزییەکان لەسەر دەسەڵات باڵی کێشابوو بەسەر عومان، بەتایبەت دوای مردنی ئیمام سوڵتان کوڕی سەیفی دووەم ١٧١٧-١٧١٨کە پێنجەمین فەرمانڕەوای یەعاربەکان بوو، وڵات تووشی نالەباری و شەڕی ناوەخۆیی بۆوە لەسەر دەسەڵات لەنێوان بەرەی هەناوی و غافری[٩٩٣].

یەکێك لە گرینگترین هۆکارەکانی چێبوونی ناکۆکی و ململانێ لەنێو هۆزە عومانییەکان دەگەڕێتەوە بۆ کێشەی وەرگرتنی دەسەڵات لە دوای مردنی سوڵتان کوڕی سەیفی دووەم لە ساڵی ١٧١٨، هەرچەندە ئەوکات سەیف کوڕی سوڵتان تەمەنی بچووك بوو، بۆیە لەلایەن هەندێك کەس ڕەتکرایەوە کە ئیمامەتی پێ بدەن، بگرە پێیان باش بوو موهەنا کوڕی ماجد ١٧١٩-١٧٢٠ببێتە ئیمامی عومان، لەلایەکی دیکەوە کەسانێك هەبوون ئیمامەتی سەیف کوڕی سوڵتانیان قبووڵ بوو، بۆیە لەنێو هۆزەکان شەڕ بەرپابوو، کە ئەنجامەکەی بەکوژرانی موهەنا کوڕی ماجد تەواو بوو، ئەم ڕووداوەش بڵێسەی جەنگی ناوەخۆیی لە عومان قووڵتر کردەوە[٩٩٤].

دوای کوژرانی ئیمامی نوێ، سەیف کوڕی سوڵتانی دووەم (ئیمامەتی دووەم١٧٢٠-١٧٢٢ز دەستنیشانکرا وەك ئیمام، بەڵام لەژێر وسایەی بلعارەب کوڕی سوڵتان، دواتریش خۆی وەك ئیمام فەرمانڕەوای گرتە دەست ١٧٢٢-١٧٢٣، بەڵام بەهۆی ئاڵۆزی و ململانێیەکان لە ناوەخۆدا دوورخرایەوە، جارێکی دیکە سەیف کوڕی

---

(٩٩١) **احمد الشامی، العلاقات التجارية بين دول الخليج العربی وبلدان الشرق الاقصی واثر ذلك علی الجوانب الحضارية فی العصور الوسطی، مجلة المؤرخ العربی، العدد ١٢، بغداد، ١٩٨٠م، ص٨٧.**

(٩٩٢) **عدنان هرير جودة الزبيدي، المصدر السابق، ص٩٣.**

(٩٩٣) **محمد مرسی عبدالله، امارات الساحل و عمان والدولة السعودية الاولی(١٧٩٣-١٨١٨م)، جزء الاول، المكتب المصری الحديث، القاهرة، ١٩٧٨م. ص٦٤ " طارق نافع الحمدانی، المصدر السابق، ص٣٨.**

(٩٩٤) **جمال زكريا قاسم**، تاريخ الخليج العربی **الحديث** والمعاصر، المجلد الاول، دارالفكر العربی، بدون مكان، ١٩٩٧م، ص ص١٢٢-١٢٥ " **صالح محمد العابد، دور القواسم...، ص٤٣.**

سوڵتانی دووەم (ئیمامەتی سێیەم ١٧٢٣-١٧٢٤ز وەك ئیمام دیاری کرا کەچی ئەمجارەیان لەژێر وسایەی محەمەد کوڕی ناسری غافری ١٧٢٤-١٧٢٨ز ئەویش وەك بلعارەب کوڕی سوڵتان دەسەڵاتی بۆ خۆی قۆرخکرد، بەڵام ڕەتکردنەوەی زۆرینەی هۆزەکانی بەئیمامەتی نوێ، دووبارە جەنگ هەڵگیرسایەوە ئاکامەکەی محەمەد کوڕی ناسری غافری لە ساڵی ١٧٢٨ز لە قایمکارییەکانی سەحار کوژرا، پاش ئەم ڕووداوە جارێکی دیکە سەیف کوری سوڵتانی دووەم دەستنیشانکرا وەك ئیمام (ئیمامەتی چوارەم ١٧٢٨- ١٧٣٢ [٩٩٥]، بەڵام بەیعەتدان بەناوبراو کێشەکەی چارەسەر نەکرد، بگرە ململانێ هەر بەردەوام بوو تا کار گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە سەیف کوڕی سوڵتانی دووەم هانا بۆ یارمەتی دەرەکی ببات بەمەبەستی پارێزگاریکردن لە دەسەڵاتەکەی[٩٩٦] .

ململانێی هەردوو تیرەی (غافری و هەناوی) لە عومان لە ساڵی ١٧٣٦ز گەیشتە ئەوپەڕی توندوتیژی، دواتر لە ڕێگەی یەکێك لە بەرەکانی ململانێیەکە داوا لە نادر شا کرا بۆ یارمەتیدانی[٩٩٧]، ئەم داواکردنە بارودۆخەکەی ئامادەکرد بۆ لەشکرکێشیی ئێران بۆ سەر عومان و بەدیهاتنی ئارەزوو و ئاواتەکانی نادر شا[٩٩٨].

**ب- هەنگاوەکانی لەشکرکێشیی سوپای ئێران بۆ عومان ١٧٣٧-١٧٣٩:**

هەنگاوەکانی لەشکرکێشیی هێزی دەریایی ئێران لەو کاتەوە پێ دەنێتە قۆناخی جێبەجێکردن کە ئیمام سەیف کوڕی سوڵتانی دووەم ١٧٢٨-١٧٤٣داوای لە ئێرانییەکان کرد، بۆ یارمەتی دانی دژ بەشۆڕشگێرانی وڵاتەکەی[٩٩٩]، هەرچەندە بەر لە هانابردنی سەیف کوڕی سوڵتانی دووەم بۆ ئێرانییەکان بەمەبەستی پارێزگاریکردن لە دەسەڵاتەکەی لە عومان، لەساڵی ١٧٣٥ز ڕوویکردە میری بلوج بەمەبەستی

---

(٩٩٥) بۆ زانیاری لەبارەی ململانێیە ناوەخۆییەکانی عومان بەتایبەت لەنێوان هەردوو تیرەی غافری و هەناوی بڕوانە: **سعید بن محمد الهاشمی، المصدر السابق، ص ص٢٨٣- ٢٩٠.**

(٩٩٦) **صالح محمد العابد، دور القواسم...، ص٤٥.**

(٩٩٧) **محمد حسن العیدروس، التدخل الفارسی ...، ص١٥٧.**

(٩٩٨) **عبداللطیف الرحمی، فؤاد شهاب، المصدر السابق، ص٣٣ " تشارلز بلجریف، المصدر السابق، ص٥٠.**

(٩٩٩) **عبدالامیر محمد امین، القوی البحریة في ...، ص ص١٥-١٦.**

یارمەتیدانی[1000]، دوای ئەوەی گەیشتە ئەو بڕوایەی کە خەریکە دەسەڵاتەکەی لەلایەن (بلعارەب کوڕی حەمیر)[1001]ی ئامۆزای لەناودەچێت [1002].

دوا بەدوای بەرەنگار بوونەوەی هەردوو هێز لە نێزیك زۆنگاوەکانی ئەلبریمی لە ناوچەی ئەلجەوف، کە بلعارەب کوڕی سولْتان برای سەیف کوڕی سولْتانی دووەم **سەرکردایەتیی** هەردوو هێزی بلوجی و هێزە پاڵپشتیکەرە عومانییەکەی دەکرد، لە بەرامبەر هێزەکەی بلعارەب کوڕی حەمیر تووشی شکستێکی سەخت بوونەوە[1003]، ئەمەش بووە سەرەتایەك بۆ سەیف کوڕی سولْتانی دووەم کە پەنابەرێت بۆ هێزێکی دەرەکیی بۆ ئەوەی کۆمەکی بکات لە مانەوەی دەسەڵاتی[1004]، هەروەها دوای کوژرانی میری بلوج بەشێکی زۆری بلوجییەکان بڕیاری مانەوەیاندا لە عومان نەگەڕانەوە بۆ مەکران، لە گوندێك لە هەرێمی زاهیرە نیشتەجێ بوون[1005].

لە ئەنجامی شکستخواردنی فەرمانڕەوای مەسقەت لە بەرامبەر بلعارەب کوڕی حەمیر، بەناچاری هانای برد بۆ نادرشا لە ڕێگەی لەتیف خان، بەمەبەستی یارمەتیدانی بۆ لەنێوبردنی نەیارەکانی، ئەو هەنگاوەی سەیف کوڕی سولْتان دەلالەتێکە بۆ نەبوونی هیچ هەستێك بەرامبەر بەبەرژەوەندی وڵاتەکەی، لەهەمان کاتدا لاوازی ئیرادەی ئەو

---

(١٠٠٠) **سالَم بن حمود بن شامس السيابى، عمان عبر التاريخ، ط٤، ج٤، ٢٠٠١م، ص٩٧.**

(١٠٠١) بلعارەب کوڕی حەمیر کوڕی سولْتان کوڕی سەیف کوڕی مالك کوڕی بلعارەب یەعروبییە، وەك ئیمامی نوێ دانرا، پاش ئەوەی لە نزوی بەیعەتی پێدرا پاش لادانی سەیف کوڕی سولْتانی دووەم لە دەسەڵات لە ساڵی ١٧٣٢ز، چەند شەڕێکی ئەنجامداوە لەگەڵ سەیف کوڕی سولْتان و لایەنگرانی. بۆ زانیاریی پتر بگەڕێوە بۆ: نورالدين عبدالله بن حميد السالمى، تحفه الاعيان بسيره اهل عمان، **الجزء الثاني**، مكتبه الامام نورالدين السالمى، **مسقط**، ١٩٩٥م، ص ص١١٧-١٢٤ "

Patricia Risso , Oman and Muscat: An Early modern History, London, Croom Helm Ltd, 1986,PP.39-40.

(١٠٠٢) **محمد حسن العيدروس، التدخل الفارسى ...، ص١٥٩.**

(١٠٠٣) **حميد بن محمد بن رزيق العبيدانى النخلى، الفتح المبين في سيرة السادة البوسعيديين، الجزء الأول، الطبعة الأولى، عرض ودراسة: عبدالله محمد جمال الدين، المطابع العالمية(روى)، سلطنة عمان، ١٩٩٥م، ص٢٩.**

(١٠٠٤) محمد حسن العيدروس، **تاريخ الخليج**...، ص ص١٠٣-١٠٤.

(١٠٠٥) محمد مرسى عبدالله، المصدر السابق، ص٦٨.

کەسە دەردەخات، کە دەرفەتێکی زێڕینی پێشکێش بەئێران کرد بۆ ئەوەی عومان داگیربکات[١٠٠٦].

پاش ئاگەدارکردنەوەی نادرشا لە بارودۆخی عومان و داواکارییەکەی سەیف کوڕی سوڵتان لەلایەن لەتیف خان، هەنگاوی پێویست هاوێژرا بۆ ئەم بابەتە لەلایەن نادرشا، کە برێتی بوو لەدەرکردنی فەرمانێك بۆ ئامادەکاریکردن، بەمەبەستی ئەنجامدانی لەشکرکێشیی بۆ عومان[١٠٠٧]، ساڵی ١٧٣٧ز موراد خان بەفەرمانی نادر شا وەك نێردەی ئێران گەیشتە عومان، بۆ ئەوەی سەیف کوڕی سوڵتان دڵنیا بکاتەوە لە ڕازیبوونی نادرشا لەسەر داواکارییەکەی[١٠٠٨]، هەروەها نادرشا پاش ئەو هەنگاوانە داوای لە فەرمانڕەوای فارس کرد، بەزووترین کات هێزی دەریایی ئامادەبکات و ئاراستەی عومانی بکات، بۆ ئەم مەبەستە لەتیف خان و هێزەکەی کە لە بەندەر عەباس جێگیربوون **جووڵە**یانکرد بەئاراستەی عومان[١٠٠٩].

هێزی ئێران بە**سەرکردایەتیی** لەتیف خان لە١٤ی ئازاری ١٧٣٧ز لە بەندەر عەباس بەڕێکەوتن[١٠١٠]، پێکهاتەی سوپاکەی برێتی بوو لە چوار کەشتی گەورە و دوو (غەراب) و چەند کەشتییەکی بچووك، لەگەڵ کەشتی فەتح شاهی زیاتر بۆ گواستنەوەی کەلوپەلی هێزی ئێرانی بەکاردەهات کە ٥٠٠٠ سەرباز و ١٥٠٠ وڵاخ، لەخۆگرتبوو[١٠١١]، هەروەها لەگەڵ چەندین دەریاوان و جەنگاوەری عارەبی لە هۆزی هۆلە لە پێکهاتەی سوپای ئێران بوون، لەگەڵ دوو کەسی ئینگلیزی کە ئەرکی

---

(١٠٠٦) پیروز مجتهد زاده، امنیت و مسایل سرزمینی در خلیج فارس، ترجمه: امیر مسعود اجتهادی، مرکز چاپ وانتشارات وزارت امور خارجه، تهران، ١٣٨٠هـ.ش، ص٧٦ " **مصطفى عقيل الخطيب، التنافس الدولي في الخليج العربي ١٦٢٢-١٧٦٣م، بيروت، ١٩٨١، ص٢٧٧ " عبدالامير محمد امين، القوى البحرية في ...، ص ص١٥-١٦.**

(١٠٠٧) لورنس لكهارت، نيروى دريايى...، ص٦٥١.

(١٠٠٨) **عدنان هرير جودة الزبيدي، المصدر السابق، ص٩٤.**

(١٠٠٩) جواد موسوى دالينى، ليدا مودت، منبع پيشين، ص٥٢.

(١٠١٠) سەبارەت بەهەنگاوەکانی لەشکرکێشیی سوپای ئێران بۆ عومان لە ساڵی ١٧٣٧ز بگەڕێوە بۆ پاشکۆی ژمارە (١٢).

(١٠١١) على زرين قلم، منبع پيشين، ص٩٥ " لورنس لكهارت، نيروى دريايى...، ص٦٥١ "
Michael Axwathy, Nader Shah…, P.36.

**سەرکردایەتیی** دوو کەشتی ئێرانیان پێدرابوو، کە دەریاوان و جەنگاوەرە عارەبەکانی هەڵگرتبوو[١٠١٢].

دوای چەند ڕۆژێك لە دەرچوونی کەشتیگەلی ئێران لە بەندەر عەباس، گەیشتنە بەندەری خورفکان[١٠١٣]، توانیان دەستی بەسەردابگرن، دواتر ڕوویانکردە جلفار (**رأس الخيمة**)، لەوێشەوە بەگەرمی لەلایەن سەیف کوڕی سوڵتانی دووەم پێشوازیان لێکرا، لەگەڵ پێدانی دیارییەك بە لەتیف خان[١٠١٤]هەروەها لەدوای گەیشتنی سوپای ئێرانی بە جلفار یەکەمین ڕووبەڕووبوونەوە ڕوویدا، لەگەڵ هێزێکی عومانی بە**سەرکردایەتیی** ڕەحمەی کوڕی مەتەر، کە تێیدا هێزە عومانییەکە شکستی خوارد، بەمەش تەواوی جلفار کەوتە دەست لەتیف خان و کردییە بارەگی سەرەکیی کەشتیگەلی ئێرانی[١٠١٥]، هۆکاری دەستنیشانکردنی جلفار لەلایەن لەتیف خان وەك بارەگەی سەرەکیی کەشتیگەلی ئێران دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر نێزیك بوونی لە بەندەر عەباس، کە ئەمەش دەبێتە ئاسانکارییەك بۆ گواستنەوە و گەیشتنی یارمەتییەکان بۆ هێزی ئێران بەکەمترین ماوە[١٠١٦].

دوا بەدوای سەرکەوتنی سوپای ئێران لە جلفار و کۆنترۆڵکردنی ناوچەکە، بلعارەب کوڕی حەمیر سەرکردەی شۆڕش لە عومان لە ساڵی ١٧٣٧ بەهێزێکی گەورە لە نەزوا بەڕێکەوت بەمەبەستی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سوپای ئێران[١٠١٧]، لە حوزەیرانی هەمان ساڵدا شەڕێکی توند لەهەرێمی ئەلزاهیرە بەتایبەت لە ناوچەی (فلج السمينى) باکووری

---

(١٠١٢) **عائشة علي السيار**، المصدر السابق، ص١٦٤.

(١٠١٣) **محمد مرسى عبدالله، المصدر السابق، ص٦٩.**

(١٠١٤) على زرين قلم، منبع پيشين، ص٩٥ " **محمد حسن العيدروس، التدخل الفارسى ...، ص ص١٦٠-١٦١** . سەبارەت بەدیارییەکەی سەیف کوڕی سوڵتان بۆ لەتیف خان بریتی بوو لە بڕێك پارە کە بە ٤٠٠٠ پاوەن ئیسترلینی مەزندەکراوە. **عبدالرحمن بن على السديس، المصدر السابق، ص٣٤١.**

(١٠١٥) **فالح حنظل، المفصل في تاريخ الامارات العربية المتحدة، الجزء الأول، الامارات العربية المتحدة، بدون تاريخ، ص١٦٦** "

John Hansman, Julfar An Arabian Port, London- Royal Asiatic Society,1985,P.14

(١٠١٦) عدنان هرير جوده الزبيدى، المصدر السابق، ص٩٧.

(١٠١٧) **سالَم بن حمود بن شامس السيابى، المصدر السابق، ص٩٨.**

شاری ئەلبریمی ڕوویدا، کە بەشکانی سوپای بلعارەب کوڕی حەمیر کۆتایی پێهات، دوای لە دەستدان و کوژرانی ژمارەیەکی زۆر لە جەنگاوەرەکانی لە گۆڕەپانی جەنگ پاشەکشەی کرد[١٠١٨].

سوپای ئێران دوای سەرکەوتنی بەسەر بلعارەب کوڕی حەمیر، بەردەوامیدا بەلەشکرکێشییەکانی بۆ ناوەوەی عومان، توانی دەستبگرێت بەسەر شاری زەنك و ئەلغبی و عەبری کە بەبێ شەڕ ملکەچبوونی خۆیان ڕاگەیاند بۆ سوپای ئێران [١٠١٩]، بەڵام سوپای ئێران لەسەودایی‌کردنی لەگەڵ خەڵکی ناوچە داگیرکراوەکان توندوتیژی زۆری ئەنجامداوە، بەشێوەیەك کوشتن و ئەشکەنجەدان و ڕەفتاری ناشیرین کاری ڕۆژانەی ئەم هێزە بووە، زۆرجار دەستگیرکراوەکانیان دەنارده بازاڕەکانی شیراز وەك کۆیلە کڕین و فرۆشتنیان لەسەر کراوە [١٠٢٠].

دەستگرتنی سوپای ئێران بەسەر زۆرینەی ناوچە گرینگەکانی عومان، هێزەکان لە قەڵاکانی ئەو ناوچانە جێگیرکران، کە دەستیان بەسەردا گیرابوو [١٠٢١]، لەلایەکی دیکەوە ڕەفتار و سەودایی سوپای ئێران لە ناوچەکە بووە هۆکارێك کە سەیف کوڕی سوڵتان بکەوێتە بەر لۆمە و تانەی خەڵکی عومان، لە بەرامبەر ئەو سیاسەتە هەڵەیەی گرتیەبەر لە پشت بەستنی بەهێزێکی دەرەکیی بۆ گەڕاندنەوەی دەسەڵاتەکەی[١٠٢٢].

لەتیف خان پاش ئەنجامدانی کردە سەربازییەکانی و دەستگرتنی بەسەر زۆرێك لە ناوچە گرینگەکانی عومان، گەڕایەوە جلفار بەمەبەستی ڕێکخستنەوەی هێزەکەی[١٠٢٣]، لەوێش بەئاشکرا ڕایگەیاند کە فەرمانڕەوای ڕەهای سەربازییە لە عومان و دەوروبەری[١٠٢٤]، ئەم لێدوانەی لەتیف خان کاریگەریی دروستکرد لەسەر ساردبوونەوە و بەردەوام نەبوونی

---

(١٠١٨) **محمد حسن العيدروس، التدخل الفارسي ...، ص١٦١ " عبدالامير محمد امين، القوى البحرية في ...، ص١٦٩.**

(١٠١٩) **عبدالرحمن بن على السديس، المصدر السابق، ص٣٤٢.**

(١٠٢٠) **حميد بن محمد بن رزيق العبيدانى النخلى، المصدر السابق، ص٣٠ " سعيد بن محمد الهاشمى، المصدر السابق، ص٢٩٥.**

(١٠٢١) جواد موسوى دالينى، ليدا مودت، منبع پيشين، ص٥٢ " **عائشة علي السيار**، المصدر السابق، ص١٩٥.

(١٠٢٢) **عبدالرحمن بن على السديس، المصدر السابق، ص٣٤٢.**

(١٠٢٣) **فالح حنظل، المصدر السابق، ص١٦٦.**

(١٠٢٤) محمد حسن العيدروس، **تاريخ الخليج**...، ص١٠٤.

هاوپەیمانییەکەی لەگەڵ سەیف کوڕی سوڵتان، چونکە سەیف کوڕی سوڵتان گەیشتە ئەو بڕوایەی کە مەبەستی ئێران لە یارمەتیدانی بۆ گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی تەنیا پەردەپۆشکردنی سیاسەتێکی لەمێژینە و شاراوەی (نادرشا)یە بۆ داگیرکردنی عومان، لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانی بەشێوەیەکی ئاشکرا دژایەتی خۆی ڕابگەیەنێت(١٠٢٥).

لە ئابی ١٧٣٧ز سوپای ئێران بە**سەرکردایەتیی** لەتیف خان، دوای پێنج مانگ لە کردە سەبازییەکانی لە عومان بەفەرمانی فەرمانڕەوای فارس گەڕایەوە بەندەر عەباس، سەبارەت بەدەسەڵاتی سەیف کوڕی سوڵتان دوای وازهێنانی ئێرانییەکان لە پاڵپشتی و یارمەتیدانی تا ڕادەیەك ناوچەکە جێگیر بوو، بەڵام نەبووە هۆی کۆتایی هێنان بە ناڕەزاییەکان، بۆیە دووبارە سەیف کوڕی سوڵتان هەڵسا بەپیادەکردنی سیاسەتی توندوتیژی لە ناوچەکە دژ بەنەیارانی(١٠٢٦).

هەواڵی پاشەکشەی سوپای ئێران لە عومان، بووە هۆکاری توڕەبوونی نادرشا، لە یەکەم کاردانەوشیدا بەتوندی سەرزنشتی محەمەد تەقی خان فەرمانڕەوای هەرێمی فارسی کرد، سەبارەت بەو فەرمانەی کە دایبوو بۆ پاشەکشەپێکردنی سوپای ئێران لە عومان، هەروەها لەبارەی بەشداری نەکردنی خودی محەمەد تەقی خان لەو هەڵمەتەدا(١٠٢٧)، بۆیە سەرنەکەوتنی هەڵمەتەکەی خستە ئەستۆی فەرمانڕەوای هەرێمی فارس(١٠٢٨)، بەرئەنجام

---

(١٠٢٥) عبدالرفیع حقیقت، تاریخ **نهضتهای** ملی ایران ( از **نفوذ** اروپائیان تا استقرار **مشروطه** در ایـران)، تهران، ١٣٨١هـ.ش، ص١٣٨ " جواد موسوی دالینی، لیدا مودت، منبع پیشین، ص٥٢.

(١٠٢٦) **عبدالامیر محمد امین، المصدر السابق، ص١٦** " لورنس لکهارت، نیروی دریایی...، ص٦٥١.

(١٠٢٧) **عبدالرحمن بن علی السدیس، المصدر السابق، ص٣٤٤.**

(١٠٢٨) محمد حسین قدوسی، منبع پیشین، ص٣٥٩ "

Laurence Lockhart, Nadir Shah's campaigns in Oman,1737–1744,Bulletin of the school of Oriental studies University of London, Volume.VIII ,London-1935,P163.

سەبارەت بەفەرمانی محەمەد تەقی خان بۆ پاشەکشەکردنی هێزی ئێران لە عومان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئیرەییەی کە لە ناخی فەرمانڕەوای هەرێمی فارس هەبوو بەرامبەر بە لەتیف خان، بەشێوەیەك هەوڵی دەدا کەسایەتیی کەم بکاتەوە، بۆیە دوای گەڕانەوەی سوپای ئێران لە عومان خۆی دەسەڵاتی کاروباری دەریـایی ئێرانـی گرتـە ئەستۆ: جواد موسوی دالینی، لیدا مودت، منبع پیشین، ص ص٥٢-٥٣.

یەکەمین لەشکرکێشیی سوپای ئێران بۆ داگیرکردنی عومان ئەنجامی ویستراوی بەدەست نەهێنا، کە نادرشا پلانی بۆ دارِشتبوو[(١٠٢٩)].

چەند مانگێك لە دوای گەڕنەوەی سوپای ئێران لە عومان، جارێکی دیکە ئاواتەکانی نادرشا زیندوو بۆوە، چونکە دووبارە سەیف کوڕی سوڵتان داوای کۆمەکی لە سوپای ئێران کرد، بەمەبەستی سەرکوتکردنی ئەو **راپەڕین** و نارەزاییانەی کە لە دژی دەسەڵاتەکەی دروست ببوون[(١٠٣٠)]، بەتایبەت دوای ئەو هەوڵانەی خرابوونە گەڕ بەمەبەستی دوورخستنەوەی سەیف کوڕی سوڵتان لە دەسەڵات و دانانی سوڵتان کوڕی مورشید لە ساڵی ١٧٣٨ز وەك ئیمام و فەرمانڕەوای نوێی عومان[(١٠٣١)].

نادرشا داواکارییەکەی سەیف کوڕی سوڵتانی قبووڵکرد، بۆ ئەم مەبەستەش محەمەد تەقی خانی راسپارد بۆ ئەنجامدانی ئەو هەڵمەتە، فەرمانڕەوای هەرێمی فارس بەر لە ئەنجامدانی هەڵمەتەکەی بیری لەپاڵپشتی کەشتییە ئینگلیزی و هۆڵەندییەکان کردەوە بۆ ئەنجامدانی ئەو کردە سەربازییە[(١٠٣٢)]، بۆیە لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٧٣٨ز محەمەد تەقی خان بەشێك لە کەشتییەکانی ئینگلیزی و هۆڵەندی دەست بەسەرداگرت، دواتر بەهێزیکی ٦٠٠٠ جەنگاوەر لەگەڵ هەریەکە لە لەتیف خان سەرکردەی گشتیی هێزی دەریایی ئێران و فەرمانڕەوای لار بەرەو جلفار بەڕێکەوتن[(١٠٣٣)].

دوای گەیشتنی سوپای ئێران بەجلفار، کۆبوونەوەیەك لەگەڵ سەیف کوڕی سوڵتان ئەنجام درا، پاشان سوپای ئێران لە یەکەمین هەڵمەتدا توانی شکست بەهێزی بلعارەب کوڕی حەمیر بێنێت و هەردوو شاری بەهلا و نەزوا داگیربکات، [(١٠٣٤)]، هەروەها فەرمانڕەوای هەرێمی فارس بەیاوەری سەیف کوڕی سوڵتان توانیان دەستبگرن بەسەر

---

(١٠٢٩) **عدنان هرير جودة الزبيدي، المصدر السابق، ص١٠٠.**

(١٠٣٠) **عبدالامير محمد امين، القوى البحرية في ...، ص١٦.**

(١٠٣١) **ماكس فون اوبنهايم، المصدر السابق، ص٧٩.**

(١٠٣٢) **عائشة علي السيار**، المصدر السابق، ص١٩٦.

(١٠٣٣) **فالح حنظل، المصدر السابق، ص١٦٨** " جواد موسوی دالینی، لیدا مودت، منبع پیشین، ص٥٣. سەبارەت بەهەنگاوەکانی لەشکرکێشیی سوپای ئێران بۆ عومان لە ساڵی ١٧٣٨ز بگەڕێوە بۆ پاشکۆی ژمارە (١٣).

(١٠٣٤) **عبدالامير محمد امين، القوى البحرية في ...، ص١٦.**

شاری ئەزکا و خەڵکەکەیان ناچار کرد بەدانی سەرانە[١٠٣٥]، دواتر ڕوویانکردە سەمائیل کە بەشەکانی ناوەوە بەمەسقەت گرێ دەدات، توانیان داگیری بکەن[١٠٣٦].

لەو هەلومەرجەدا پێوەندیی نێوان لەتیف خان و سەیف کوڕی سوڵتان ئالۆزی و گرژی تێکەوت، بەتایبەت دوای ئەوەی لەتیف خان بڕیاری داگیرکردنی شارەکانی مەسقەت، سەحار و بەرکای دا[١٠٣٧]، کە پێوەست و هەواداری سەیف کوڕی سوڵتان بوون، هەروەها ڕایگەیاند بەتوندترین شێواز بەرەنگاری هەر بەرگرییکردنێك دەبێتەوە[١٠٣٨].

لە ئەنجامی ئەو بارودۆخە سەیف کوڕی سوڵتان لە دەرفەتێکدا پاشەکشەی کرد بۆ بەرکا[١٠٣٩]، پاشان ڕوویکردە دۆڵی بەنی غافر، لەوێشەوە ڕوویکردە زاهیرە لەگەڵ بلعارەب کوڕی حەمیری دوژمنە سەرسەختەکەی کەوتە دانوستاندن، پاش ئەوەی بلعارەب کوڕی حەمیر وازی لەبانگەشەکردن هێنا بۆ ئیمامەتی عومان و یەکیانگرت دژ بەسوپای ئێران[١٠٤٠].

سوپای ئێران دوای داگیرکردنی هەردوو شاری بەهلا و نەزوا، ڕوویانکردە مەسقەت و بەئاسانی داگیریانکرد، بەڵام نەیاتوانی قەڵاکانی (جەلالی و میرانی) داگیر بکەن[١٠٤١]، هەرچەندە فەرمانڕەوای فارس هەوڵی زۆریدا بەرگرییکاران لە قەڵای جەلالی و میرانی ڕازی بکات بۆ خۆبەدەستەوەدانیان، بەڵام هەوڵەکانی سەری نەگرت[١٠٤٢].

لەلایەکی دیکەوە سوپای ئێران دوای گەمارۆدانی هەردوو قەڵاکە بۆ ماوەی چل ڕۆژ سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا بۆ داگیرکردنی، بۆیە لە٢٥ی ئایاری ١٧٣٨ز ڕوویانکردە

---

(١٠٣٥) **سالَم بن حمود بن شامس السيابى، المصدر السابق، ص١٠٣.**

(١٠٣٦) **عدنان هرير جودة الزبيدي، المصدر السابق، ص١٠٤.**

(١٠٣٧) **سالَم بن حمود بن شامس السيابى، المصدر السابق، ص١٠٤.**

(١٠٣٨) **محمد حسن العيدروس، التدخل الفارسى ...، ص١٦٧.**

(1039) Lockhart, Op. Cit ,P.164 “

**سالَم بن حمود بن شامس السيابى، المصدر السابق، ص١٠٤.**

(١٠٤٠) محمد حسن العيدروس، **تاريخ الخليج...**، ص١٠٥ “ **عبداللطيف الرمحى، فؤاد شهاب، المصدر السابق، ص٣٣** “ **سعيد بن محمد الهاشمى، المصدر السابق، ص٢٩٧.**

(١٠٤١) **عبدالامير محمد امين، القوى البحرية في ...، ص١٦** “ **صالح محمد العابد، المصدر السابق، ص٤٦.**

(١٠٤٢) سەبارەت بەهەنگاوەکانی محەمەد تەقی خان بەمەبەستی داگیرکردنی هەردوو قەڵاکەی جەلالی و میرانی بڕوانە: **عائشة علي السيار، المصدر السابق، ص١٩٦.**

بەرکا بەمەبەستی داگیرکردنی، بەڵام بەرگرییکردنی بەهێزی هۆزی معاول لەو شارە بووە هۆی شکستهێنانی هەوڵەکانی سوپای ئێران[١٠٤٣]، پاش ئەم ڕووداوە هێزێکی عومانی بە**سەرکردایەتیی** بلعارەب کوڕی حەمیر هێرشی کردە سەر سوپای ئێران جێگیر لە سەمائل، توانی ژمارەیەکی زۆر لە سەربازانی ئێرانی بکوژێت[١٠٤٤].

سەرنەکەوتنی سوپای ئێران لە داگیرکردنی قەڵاکانی مەسقەت و شاری بەرکا کاریگەریی گەورەی دروستکرد لە پێوەندی نێوان فەرمانڕەوای هەرێمی فارس محەمەد تەقی خان و لەتیف خان سەرکردەی هێزی دەریایی ئێران، کە ئاکامی ململانێیەکە بەژەهراویکردنی لەتیف خان لەلایەن فەرمانڕەوای فارس تەواو بوو، بەم کارەی محەمەد تەقی خان، ئێران بەگشتی و نادرشا بەتایبەتی لە بەهێزترین سەرکردەی دەریایی بێبەش کرد[١٠٤٥].

سەبارەت بەو هێزە ئێرانییەی کە لە جلفار بەڕێکەوتبوو، بەمەبەستی یارمەتیدانی هێزەکانی مەسقەت و بەرکا، بەڵام ئەم هێزە بەر لە گەیشتنیان لە ناوچەی سەمائل ڕووبەڕووی هێزی یەکگرتووی عومانی بوونەوە بە**سەرکردایەتیی** حەمیر کوڕی مونیر شکستێکی سەختیان خوارد[١٠٤٦]، دواتر هێزی یەکگرتوو ڕوویکردە شاری بەهلا بەمەبەستی ئازادکردنی، دوای سێ ڕۆژ شەڕی بەردەوام لەنێوان هەردوولا، لەکۆتایدا هێزی ئێرانی گەمارۆدراو بڕیاری خۆبەدەستەوەدانیان دا، دوای ئەوەی لەلایەن سەیف کوڕی سوڵتان زامنی پارێزگاری لە گیانیان و گەڕاندنەوەیان بۆ جلفار درا[١٠٤٧].

ئەو هێزە ئێرانییە بەسەرپەرشتی کەتیبەیەکی عومانی کە لە غەفارییەکان بوون، بە**سەرکردایەتیی** موبارەك کوڕی مەسعودی غافری بەرەو جلفار بەڕێکران[١٠٤٨]، بەڵام لە

---

(١٠٤٣) جواد موسوی دالینی، لیدا مودت، همان منبع، ص٥٣.

(١٠٤٤) **عائشة علي السيار، المصدر السابق، ص١٩٧.**

(١٠٤٥) لورنس لكهارت، نیروی دریایی...، ص٦٥٢ " عبدالامیر محمد امین، **القوى البحرية في ....**، ص١٦ . هەندێك پێیان وایە لەتیف خان لەکاتی هێرشکردنی بۆ سەر قەڵاکانی مەسقەت بەر تەقینەوەی لوغم کەوتووە: **ب.ج. سلوت، عرب الخليج في ضوء مصادر شركة الهند الشرقية الهولندية (١٦٠٢ - ١٧٨٤ز)، ترجمة: عايدة خوری، الطبعة الأولى، الامارات العربية المتحدة، ١٩٩٣م، ص٢٩٥.**

(١٠٤٦) **سالَم بن حمود بن شامس السيابي، المصدر السابق، ص١٠٥.**

(١٠٤٧) **فالح حنظل، المصدر السابق، ص١٧٢.**

(١٠٤٨) **سالَم بن حمود بن شامس السيابي، المصدر السابق، ص١٠٦.**

نێزیك سەحار ئەو هێزە ئێرانییە ڕووبەڕووی کوشتارگەیەکی خوێناوی بوونەوە لەلایەن ئەحمەد کوڕی سەعید والی سەحار بەهاوکاری کەتیبە غەفارییەکەی سەرپەرشتیاری هێزەکە(١٠٤٩).

خراپی بارودۆخی سوپای ئێران لە عومان بووە هۆکارێك کە محەمەد تەقی خان بەناچاری بەرەو جلفار پاشەکشە بکات(١٠٥٠)، لەوێش ژمارەیەکی زۆری جەنگاوەر و دەریاوانەکانی عارەبی هۆلە لەبەر کەمی خۆراك و دواکەوتنی کرێکانیان کەشتیگەلی ئێرانیان جێهێشت و ڕوویانکردە کیش، لەلایەکی دیکەوە دەریاوانە عارەبەکان هێرشیانکردە سەر دوورگەی قشم، هەروەها سوپای ئێران لە بەحرێن لەژێر گەمارۆی هێزە ناوەخۆییە بەحرێنییەکان دابوو(١٠٥١).

لەو بارودۆخەدا عارەبەکانی هۆلە و عومانییەکان کۆنترۆڵی ئاوی کەنداویان کردەوە و دووبارە چەتەی دەریایی سەری هەڵدایەوە، بەمەش ئێرانییەکان پەنایان بردە بەر کەشتییە ئینگلیزییەکان بۆ گواستنەوەی کەلوپەل وخۆراك، بەڵام کەشتییە ئینگلیزییەکانیش کەوتنە بەر پەلاماری دەریاوانە عارەبەکان بەتایبەت لە ئابیساڵی ١٧٣٨ز کەشتی (ڕۆز)ی تایبەت بەکۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی کەوتە بەر هەڕەشەی دوو کەشتی دەریاوانە عارەبەکان لە جۆری غراب(١٠٥٢).

لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٧٣٨ز هەژموونی عارەبەکان لەسەر کەنداو بەرەو لاوازی ڕۆیشت، بەتایبەت دوای دروستبوونی ڕکابەری و ململانێ لەنێوان عارەبەکان، ئەم ڕکابەری و ململانێیە ڕێگەی بۆ سوپای ئێران خۆشکرد لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٧٣٩ گورزێکی کوشندە ئاراستەیان بکات، زۆرێك لە کەشتییەکانیان دەست بەسەردا بگرێت(١٠٥٣).

سەبارەت بە نادرشا، دوای شکستەکانی سوپای ئێران لە عومان، نامەیەکی ئاگەدارکردنەوەی توندی ئاراستەی محەمەد تەقی خان کرد، کە تێیدا بەرپرسێتی شکستخواردنەکەی خستە ئەستۆی فەرمانڕەوای فارس، لە هەمان کاتدا داوای لێکرد

---

(١٠٤٩) **فالح حنظل، المصدر السابق، ص١٧٢.**

(1050) Lockhart, Op. Cit ,P.164.

(١٠٥١) لورنس لكهارت، نیروی دریایی...، ص ص٦٥٢-٦٥٣" علی زرین قلم، منبع پیشین، ص ص٩٥-٩٦ .

(1052) Lockhart, Op. Cit ,P.165.

(١٠٥٣) **عدنان هرير جودة الزبيدي، المصدر السابق، ص١٠٨.**

بەزووترین کات هێزەکەی ڕێك بخاتەوە بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی عومان[١٠٥٤]، بەڵام هەڵگەڕانەوەی دەریاوانە عارەبەکان لەلایەك و سەرقاڵبوونی ئێرانییەکان بەدروستکردنی کەشتیگەلییەکی نوێ لەلایەکی دیکەوە بوونە هۆکار کە نادرشا کردە سەربازییەکەی بۆ سەر عومان بۆ ماوەی نێزیکەی سێ ساڵ دوابخات[١٠٥٥].

(١٠٥٤) **عبدالرفیع حقیقت، منبع** پیشین، ص١٤٢.

(١٠٥٥) **عدنان هرير جودة الزبيدي، المصدر السابق، ص ص١١٠، ١١٧.**

## تەوەری سێیەم:

## چالاکی و لەشکرکێشیی سێیەمی ئێران بۆ عومان١٧٤٠-١٧٤٣

### أ- بارودۆخی هێزی دەریایی ئێران لەنێوان ساڵانی ١٧٤٠ — ١٧٤١:

دوای هەڵگەڕانەوەی عارەبەکان لە کەشتیگەلی ئێران لە ساڵی ١٧٤٠ز، دەستگرتنیان بەسەر پێنچ کەشتی و ڕفاندنیان بۆ خورفکان و دوورگەی قشم، **بەسەرکردایەتیی** هەر یەکە لە شێخ ڕەحمەی کوڕی مەتەر و شێخ عەبدل[١٠٥٦] پاش کوژرانی چەند سەربازێکی ئێرانی لەو ڕووداوە لە سەرووی هەمووشیان میر عەلی سەرکردەی کەشتیگەلی ئێرانی[١٠٥٧].

جێگەی ئاماژە پێکردنە نادر شا دوای ئەم ڕووداوە بانگهێشتی محەمەد تەقی خان فەرمانڕەوای فارسی کرد بۆ نادر ئاباد، لەوێش لە پۆستەکەی دوورخرایەوە و زیندانی کرا[١٠٥٨]، پاشان هەوڵەکان چڕکرانەوە لەلایەن نادرشا بۆ گەڕاندنەوەی کەشتییە

---

(١٠٥٦) سەبارەت بەهۆکارەکانی هەڵگەڕانەوەی دەریاوانە عارەبەکان و ڕفاندنی کەشتییە ئێرا**نییە**کان بڕوانە: **ب.ج. سلوت، المصدر السابق، ص ص٢٢٩-٣٠١ " صالح محمد العابد، المصدر السابق، ص٥٨.**

(١٠٥٧) **ج.ج.لوريمر، المصدر السابق، ص١٥٩.**

(١٠٥٨) **عبدالرفيع حقيقت**، منبع پيشين، ص١٤٢ " **رضا شعبانى، ميرزا محمد تقى...، ص ص٢٢٤-٢٢٥.** سەرەڕای ئەوەش هۆکاری دیکە هەبووە بۆ دوورخستنەوە و زیندانی کردنی فەرمانڕەوای هەرێمی فارس

ڕفێندراوەکان، بۆ ئەم مەبەستە داوای یارمەتی لە کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی هۆڵەندی کرا لە بەندەر عەباس[(١٠٥٩)].

دوای ڕازیبوونی هۆڵەندییەکان بەپێشکێش کردنی یارمەتی بۆ هێزی دەریایی ئێران، ئاغا عەباس فەرمانڕەوای بەندەر عەباس لە٢٨ی ئابی ١٧٤٠ز **سەرکردایەتیی** کەشتیگەلی ئێرانی گرتە ئەستۆ و ڕوویکردە دوورگەی قشم، هەرچەندە کەشتییەکانی هۆڵەندی هەوڵێکی زۆریاندا بۆ ڕاوەدوونانی دەریاوانە عارەبەکان، بەڵام سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا لە گەڕاندنەوەی کەشتییە فرێندراوەکان پاش ٢٠ ڕۆژ لە هەڵمەتەکەیان، گەڕانەوە بەندەر عەباس[(١٠٦٠)].

ئێرانییەکان پاش ئەم ڕووداوە جارێکی دیکە هەوڵەکانیان خستەوەگەڕ، **محەمەد** تەقی خان پاش ئازادکردنی وەك سەرکردەی گشتیی دەریایی نویێ لەسەر ڕاسپاردەی نادرشا گەیشتە بەندەر عەباس، دواتر کەوتە گفتوگۆکردن لەگەڵ بریکاری کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی پاش ئەوەی نامەیەکی نادرشای پێدان، کە داوای چەند کەشتییەکی لێکردبوون بۆ ئەنجامدانی کردەیەکی سەربازی دژ بەدەریاوانە عارەبەکان[(١٠٦١)].

داواکارییەکەی ئێران لەلایەن کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ڕەتکرایەوە، بەبیانووی کەمی سوپا لە بەندەر عەباس، بەڵام لەلایەن **محەمەد** تەقی خان داوایان لێکرا کە ڕۆڵی ناوبژیکەر ببینن لەنێوان ئێران و دەریاوانە عارەبییەکان، هەر بۆیەش کۆمپانیای هیندی

---

لەلایەن نادرشا، بەتایبەت دوای ئەوەی نادرشا لە دەلهی بەرەو کابول بەڕێکەوت لە ڕێگەی نێردەیەك داوای لە تەقی خان کرد خۆی بگەیەنێتە سند بەمەبەستی یارمەتی دانی لە ڕووبەڕووبونەوەی لەگەڵ فەرمانڕەوای سند، بەڵام بەهۆی بەرەنگاربوونەوەی لەگەڵ هۆزەکانی بلوج لە بیابانی مەکران و شکستخواردنی نەیتوانی بگاتە ئامانجە دیاریکراوەکەی کە لە دوولاوە ( وشکانی و دەریایی) سوپاکەی بەڕێکردبوو، گەڕایەوە بەندەر عەباس، ئەم هەواڵە نادرشای نارەحەت کرد، داوای لێکرد خۆی بگەیەنێتە نادرئاباد، لەوێش پاش لۆمەکردنی زیندانی کراو بۆ ماوەیەکی کاتیش لە پۆستەکەی دوورخرایەوە. **رضا** زادە **شفق، المصدر السابق، ص٢١٠.**

(١٠٥٩) **عدنان هرير جودة الزبيدي، المصدر السابق، ص١١١.**

(١٠٦٠) **المصدر نفسه، ص ص ١١١-١١٢.**

(١٠٦١) لكهارت، نادرشا، ص٢٧٠.

ڕۆژهەڵاتی هەڵسان بەناردنی نامە بۆ دەریاوانە عارەبەکان بەمەبەستی نەهێشتنی چەتەی دەریایی لە بەندەرەکانی عومان[١٠٦٢].

محەمەد تەقی خان لەسەر وەڵامدانەوەی نامەکان نەوەستا، بۆیە کەوتە کارکردن بۆ ڕازیکردنی هۆڵەندییەکان لەسەر وەرگرتنی دوو کەشتی، بۆ ئەم مەبەستە لە ئەیلوولی ١٧٤١ز پاش ڕازیبونی هۆڵەندییەکان محەمەد تەقی خان **سەرکردایەتیی** هێزی دەریایی ئێرانی کرد کە پێك دەهات لە چەندین کەشتی گەورە و بچووك، لەگەڵ دوو کەشتی هۆڵەندی هێرشی کردە سەر دەریاوانە عارەبەکان[١٠٦٣].

سوپای ئێران لەو هێرشە تووشی شکستێکی توند بۆوە، بەتایبەت دوای ئەوەی کەشتییەکی هۆڵەندی لەلایەن دەریاوانە عارەبییەکان گەمارۆدراو زۆر بەسەختی ڕزگاری بوو، پاش ئەوەی زیانێکی زۆری پێگەیشت[١٠٦٤]، هەروەها دۆڕاندنی هێزی دەریایی ئێران نادرشای زۆر پەست کرد، بۆیە بڕیاری دوورخستنەوەی محەمەد تەقی خانی لە پۆستەکەیدا[١٠٦٥] و لەجێگەکەیدا ئیمام وەردی وەك سەرکردەی نوێی هێزی دەریایی ئێران دەستنیشانکرد[١٠٦٦].

دوا بەدوای شکانی هێزی دەریایی ئێران، دەریاوانە عارەبەکان هێز و دەسەڵاتیان لە ناوچەکە ڕووی لەگەشەکردن کرد، هەر ئەمەش وایکرد نادرشا هێزی دەریایی لە کەنداو بەهێز بکات، پاش ئەوەی ئاگەدارکرایەوە کە عارەبەکان لە هەوڵی ئەوەدان بەحرێن لەژێر چەنگی سوپای ئێران دەربهێنن و بیخەنەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان[١٠٦٧].

نادر شا لە هاوینی ١٧٤١ز توانی هێزێکی دەریایی تایبەت بەئێران دابمەزرێنێت، پاش هەموو ئەو یارمەتییانەی ئینگلتەرا و هۆڵەندە کە پێشکێش بەئێرانیان کرد، سەرەڕای تێچوونێکی زۆری مادی بۆ دروستکردنی کەشتی لە سورات، بەڵام کارەکە بەبێ ئاستەنگ نەبووە، هەرچەندە نادرشا بۆ سەرخستنی پرۆژەکەی پشتی بەست

(١٠٦٢) لورنس لكهارت، نيروى دريايى...، ص٦٥٣.

(١٠٦٣) لكهارت، نادرشا، ص٢٧٠ " **ازهار قاسم حسوني، المصدر السابق، ص١٢٦.**

(١٠٦٤) لكهارت، نادرشا، ص٢٧٠.

(1065) Lockhart, Op. Cit ,P.165.

(١٠٦٦) **ازهار قاسم حسوني، المصدر السابق، ص١٢٧.**

(١٠٦٧) لكهارت، نادرشا، **ص٢٧١ " عدنان هرير جودة الزبيدي، المصدر السابق، ص١١٥.**

بەدەریاوانێکی فەرەنسی بۆ سەرپەرشتیکردنی پرۆژەی بوشەهر، بەڵام نەبوونی دارایی تایبەت بۆ دروستکردنی کەشتی ئاستەنگی خستە بەردەم پرۆژەکەی نادر شا [(١٠٦٨)].

شیاوی باسکردنە نادرشا بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم ئاستەنگە بڕیاریدا بەگواستنەوەی دار لە دارستانەکانی مازندەران بۆ بوشەهر، کە نێزیکەی ٦٠٠میل دووربوو، هەروەها سەختی ڕێگەکان ئاستەنگێکی دیکە بوو، کە زۆرجار دارەکان بەپشتی مرۆڤ دەگوازرانەوە، کرداری گواستنەوەکەش نێزیکەی (٦٠) ڕۆژی دەخایاند[(١٠٦٩)]، لەو هەلومەرجەدا نادر شا ناچار بوو واز لە پڕۆژەی دروستکردنی کەشتی بهێنێت، چونکە گەیشتە ئەو بڕوایەی کە پرۆژەی دروستکردنی کەشتی کارێکی قورسە و تێچوونێکی زۆریشی لە ڕووی مادی پێویستە، بۆیە جارێکی دیکە هەوڵەکانی چڕکردەوە بۆ کڕینی کەشتی لە سورات بەشێوەیەك ئێران لە سەرەتاکانی ساڵی **١٧٤٢**ز بووە خاوەنی **١٥** کەشتی گەورە و چەند کەشتییەکی بچووك [(١٠٧٠)].

سەرەڕای ئەو ئاستەنگ و بارودۆخەی ڕووبەڕووی نادرشا بۆوە، کەچی هەر لە هەوڵی بەردەوام دابوو بۆ گەڕاندنەوەی کەشتییە ڕفێندراوەکان، بۆ ئەم مەبەستە لە سەرەتاکانی تشرینی یەکەمی ساڵی **١٧٤١**ز ئیمام وەردی سەرکردەی دەریایی ئێران گەیشتە بەندەر عەباس و پەیامێکی توندی نادر شای ئاراستەی بریکارەکانی هەردوو کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیزی و هۆڵەندی کرد، کە یارمەتی پێویست پێشکێش بەئێران بکەن بۆ گەڕاندنەوەی کەشتییە ڕفێندراوەکان لەلایەن دەریاوانە عارەبەکان[(١٠٧١)]، بەڵام ڕەتکردنەوەی داواکارییەکەی نادرشا لەلایەن بریکارەکانی هەردوو کۆمپانیاکە، ئیمام وەردی ناچار کرد بەزۆر دەستبگرێت بەسەر دوو کەشتی هۆڵەندی، دواتر **سەرکردایەتیی** هێزێکی گرتە ئەستۆ و ڕوویکردە دوورگەی کیش لەگەڵ عارەبەکان بەرەنگاری یەکدیی بوونەوە[(١٠٧٢)].

---

(١٠٦٨) عبدالامیر محمد امین، **القوی البحریة في ...**، ص١٧.

(١٠٦٩) لکهارت، نادرشا، ص ص٢٧١-٢٧٢.

(١٠٧٠) عبدالامیر محمد امین، **القوی البحریة في ...**، ص١٧.

(١٠٧١) **ب.ج. سلوت، المصدر السابق، ص٣٠٣.**

(١٠٧٢) لکهارت، نادرشا، ص٢٧٣.

جێگەی باسکردنە هێزی دەریایی ئێران لەو جەنگە تووشی شکست بۆوە، بەتایبەت دوای ئەوەی بەفەرمانی ئیمام وەردی باروتی تۆپە ئاگرینەکانی کەشتی ئێرانی زیادکرا بووە هۆی تەقینەوەی تۆپە ئاگرینەکە لەناو کەشتییەکە و برینداربوونی ئیمام وەردی، هەرچەندە دوای برینداربوونی سەرکردەی دەریایی ئێران شەڕ هەر بەردەوام بوو، بەڵام بەمردنی هاوکێشەکە پێچەوانە بۆوە بەشێوەیەك بووە هۆکار بۆ تێکچوونی بارودۆخی سوپای ئێران و پاشەکشەکردنیان بەئاراستەی بەندەر عەباس[١٠٧٣].

**ب- لەشکرکێشیی ئێران بۆ عومان ١٧٤٢ – ١٧٤٣:**

لە دوای دەرپەڕاندنی هێزی دەریایی ئێران لە زۆرینەی ناوچەکانی عومان، بارودۆخی عومان تاڕادەیەك جێگیر بوو بەتایبەت پاش ئاشتبوونەوەی سەیف کوڕی سوڵتان لەگەڵ بلعارەب کوڕی حەمیر[١٠٧٤]، بەڵام باردۆخی عومان لەسەر جێگیرییەکەی بەردەوام نەبوو، بەتایبەت لە ساڵی ١٧٤٢ز دوای ئەوەی سەیف کوڕی سوڵتان (ئیمامەتی پێنجەم ١٧٣٨-١٧٤٢ز) گەڕایەوە سەر ژیانی خۆشگوزەرانی و سەپاندنی دەسەڵاتی ڕەها بەسەر هەموو لایەك، ئەمەش بووە هۆکارێك بۆ دەربڕینی ناڕەزایی لەلایەن سەرکردە و سەرۆك هۆز و قازییەکانی عومان[١٠٧٥].

لەو بارودۆخەدا لە شوباتی ١٧٤٢زانایان و سەرکردەکانی عومان، لە شاری نەخل بڕیاری دوورخستنەوەی سەیف کوڕی سوڵتان لە ئیمامەت و فەرمانڕەوای عوماندا، لە بەرامبەریشدا بەیعەتیان دووپاتکردەوە بۆ سوڵتان کوڕی مورشید (شوبات ١٧٤٢- حوزەیرانی ١٧٤٣) وەك ئیمام و فەرمانڕەوای عومان[١٠٧٦]، دوابەدوای دەست

---

(١٠٧٣) **ب.ج. سلوت، المصدر السابق، ص ص٣٠٤-٣٠٥ .**

(١٠٧٤) محمد حسن العيدروس، **تاريخ الخليج**...، ص١٠٥ .

(١٠٧٥) **فالح حنظل، المصدر السابق، ص١٧٤.**

(١٠٧٦) **محمد حسن العيدروس، التدخل الفارسي ...، ص١٧٢ " ماكس فون اوبنهايم، المصدر السابق، ص٧٩.** لەو بارەیەوە بەبەشداری زانایان و ڕیش سپیانی بەهەلە، نەزوا، ئەزکا، سەرۆك هۆزەکانی بەنی غافر، خەڵکی وادی سەمائل و شێخەکانی معاول لە کۆبونەوەیەکدا لە ساڵی ١٧٤٢ز لەنەخل بڕیاری دوورخستنەوەی سەیف کوڕی سوڵتان لەئیمامەتی عوماندا درا، لە جێگەیدا سوڵتان کوڕی مورشید وەك

بەکاربوونی فەرمانڕەوای نوێ لە عومان، لە یەکەمین کاریدا هەڵسا بەملکەچکردنی دانیشتووانی رستاق کە لایەنگر و پاڵپشتی فەرمانڕەوای لەکار لادراو بوون، ئەنجامدانی ئەو کارەش لەو کاتە کەوتە بواری جێبەجێکردن، دوای ئەوەی ئەحمەد کوڕی سەعید والی سەحار پاڵپشتی خۆی بۆ سوڵتان کوڕی مورشید ڕاگەیاند[١٠٧٧].

والی سەحار لەگەڵ سوڵتان کوڕی مورشید بەهێزێکەوە بەرەو رستاق بەڕێکەوت، هەرچەندە سەیف کوڕی سوڵتان هەوڵیدا بەرەنگاری ببێتەوە، بەڵام زۆری سوپای ئیمامی نوێ هۆکارێك بوو، کە سەیف کوڕی سوڵتان شارەکە جێ بهێڵێت و ڕوو بکاتە مەسقەت[١٠٧٨]، لەوێش هەڵسا بەکۆکردنەوەی هێز لە شارەکانی مەترەح و سیب، دواتر ڕوویکردە شاری بەرکا و کردیە بارەگەی سەرەکیی سەربازی خۆی، لەو **هەلومەرجە** ئاڵۆزەشدا سوڵتان کوڕی مورشید ئیمام و فەرمانڕەوای نوێ هەڵسا بەدەستنیشانکردنی سەیف کوڕی موهەننا وەك سەرکردەی هێزێك بەمەبەستی هێرشکردنە سەر سەیف کوڕی سوڵتان لە بەرکا، دوای بەرەنگاربوونەوەی توانی زاڵ بێت بەسەر ئیمامی لەکارلادراو و ناچارکردنی بەپاشەکشەکردن بەرەو مەسقەت[١٠٧٩].

دوا بەدوای شکانی سەیف کوڕی سوڵتان لەبەرکا و پاشەکشەکردنی بۆ مەسقەت، سوڵتان کوڕی مورشید فەرمانڕەوای نوێی عومان لە هێرشێکی لەناکاودا توانی دەست بگرێت بەسەر مەسقەت، دوای ئەوەی هەردوو قەڵای جەلالی و میرانی داگیرکرد [١٠٨٠]، بەڵام لەم هێرشەدا

---

ئیمامی عومان دەستنیشانکرا. **سالَم بن حمود بن شامس السيابى، المصدر السابق، ص١٠٩.** هەرچەندە (William O. Lancaster and Fidelity C. Lancaster) پێیان وایە بەیعەتدانەکە بە ئیمامی نوێ لە شوباتی ١٧٤١ز بووە، نەك ١٧٤٢ز، بەڵام زۆرینەی سەرچاوە عومانییەکان جەخت لە ساڵی ١٧٤٢ز دەکەنەوە.

William O. Lancaster and Fidelity C. Lancaster, Honor in contentment: Life Befor Oil in Ras Al – Khaima (UAE) and some Neighbouring Regions, New York- Walter de Gruyter GmbH and Co.- 2011, P.361.

(١٠٧٧) **محمد حسن العيدروس، التدخل الفارسى ...، ص١٧٢.**

(١٠٧٨) **المصدر نفسه، ص١٧٢.**

(١٠٧٩) **سالَم بن حمود بن شامس السيابى، المصدر السابق، ص١١١.**

(١٠٨٠) **المصدر نفسه، ص١١٢.**

سەرکەوتوو نەبوون لە دەستگیرکردنی سەیف کوڕی سوڵتان، چونکە توانی ڕابکات و لە ڕێگەی کەشتییەك خۆی بگەیەنێتە خورفکان، لەوێشەوە ڕوویکردە جلفار[1081].

پاش گەیشتنی سەیف کوڕی سوڵتان بە جلفار، دووبارە داوای یارمەتی و کۆمەکی لە محەمەد تەقی خان شیرازی کرد، کە لەلایەن نادرشا وەك فەرمانڕەوای شیراز جارێکی دیکە دەستنیشان کرابۆوە، بۆ ئەوەی یارمەتی بدات لە گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی بۆ سەر عومان[1082]، بۆ ئەم مەبەستە سەیف کوڕی سوڵتان لە جلفار هەڵسا بەپێکهێنانی شاندێکی باڵا بەمەبەستی سەردانی کردنی ئەسفەهان، بۆ ئەوەی لە نێزیکەوە چاویان بکەوێت بەنادرشا[1083].

لە میانەی سەردانەکەیاندا نامەیەکی تایبەتی سەیف کوڕی سوڵتان گەیاندرایە نادرشا، کە تێیدا داوای یارمەتی و کۆمەکی دەکرد لە نادرشا بەمەبەستی گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی بەسەر عوماندا، لە بەرامبەریشدا ئامادەیی تەواوی خۆی نیشان دابوو لەسەر هەبوونی شکۆ و دەسەڵاتی ئێران بەسەر هەموو هەرێمەکانی عومان[1084]، لەگەڵ پێشکێش کردنی بڕی گوژمەی ساڵانە بۆیان لە بەرامبەر یارمەتی دانی سوپای ئێران، بێگومان ئەو دوو خەڵاتە هاندرێکی گرینگ بوو بۆ نادرشا، چونکە یاخیبوونی دەریاوانە عارەبەکان لە ساڵی ١٧٤٠ز کاریگەریی قووڵیان چێ کردبوو لەسەر بارودۆخی سیاسی و ئابووری و سەربازی ئێران لە کەنداو[1085].

داواکارییەکەی سەیف کوڕی سوڵتان لەلایەن نادر شا قبووڵ کرا، بۆ ئەم مەبەستە داوای لە محەمەد تەقی خان کرد بەزووترین کات هێزێك ئامادە بکات بۆ ئەنجامدانی لەشکرکێشی، بۆ ئەم مەبەستەش هێزێك ئامادەکرا، کە پێك دەهات لە شەش هەزار

---

(١٠٨١) ابو سليمان بن محمد بن عامر ابن راشد المعولي، المصدر السابق، ص١٥٠.

(١٠٨٢) طارق نافع الحمداني، المصدر السابق، ص٤٥.

(١٠٨٣) سعيد بن محمد الهاشمي، المصدر السابق، ص ص٢٩٨-٢٩٩.

(١٠٨٤) محمد حسن العيدروس، التدخل الفارسي ...، ص١٧٣ "

William O. Lancaster and Fidelity C. Lancaster, Op. Cit ,P.361.

(1085) Patricia Risso, Op. Cit ,P.41.

جەنگاوەر و لە حوزەیرانی ١٧٤٢ز لەبەندەری بوشەهر ڕوویانکردە جلفار وەك ئامادەکارییەك بۆ جەنگی داهاتوو[١٠٨٦].

## ١- ئامادەکاریەکانی سوپای ئێران بۆ ئەنجامدانی لەشکرکێشی:

سەبارەت بەو هەڵمەتە دوو کەشتی لە بەندەری سورات کە لەلایەن ئێرانەوە کڕدرابوون گەیشتنە بەندەری بوشەهر، هەروەها دوو کەشتی دیکە کە ئێرانییەکان توانیان لە بازرگانێکی فەرەنسی و بازرگانێکی ئینگلیزی بکڕن و بەشداری ئەو هەڵمەتەیان پێ بکەن[١٠٨٧]، لەهەمان کاتدا نادرشا بڕیاری جیاکردنەوەی **سەرکردایەتیی** هێزی وشکانی و دەریایی دا، ئەم کارەی زیاتر بۆ بنبڕکردنی ناکۆکی و ململانێ بوو لەنێوانی سەرکردەکانی هێزی ئێرانی، گەلبعەلی خان وەك سەرکردەی هێزی وشکانی دەستنیشانکرد، لەبەرامبەریشدا **محەمەد** تەقی خان وەك سەرکردەی گشتی و سەرکردەی هێزی دەریایی دانرا[١٠٨٨].

گەلبعەلی خان لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٧٤٢ز لە بەندەر عەباس ڕوویکردە عومان، لە٢٠ی هەمان مانگ **محەمەد** تەقی خان بە**سەرکردایەتیی** هێزێکی دەریایی کە پێك دەهات لە چوار کەشتی گەورە و دوو (غراب) و ژمارەیەك کەشتی بچووك بەئاراستەی عومان کەوتە جووڵە[١٠٨٩]، سەبارەت بەحامییەی ئێرانیش لە جلفار، لە ساڵی ١٧٤٢ز لەلایەن سەرکردەی گشتیی هێزی ئێران فەرمانیان پێکرا، هێرش بکەنە سەر عارەبەکانی هۆلە کە دەسەڵاتیان بەسەر خەسب و ڕەئس موسەندەم داگرتبوو، لەهەمان کاتدا پاڵپشتی و لایەنگری خۆیان بۆ سوڵتان کوڕی مورشید ئیمام و فەرمانڕەوای نوێ دووپات کردبۆوە[١٠٩٠].

---

(١٠٨٦) عبدالامیر محمد امین، **القوی البحریة في ...**، ص١٨.

(١٠٨٧) **ب.ج. سلوت، المصدر السابق، ص٣٠٥.**

(١٠٨٨) **عدنان هریر جودة الزبیدي، المصدر السابق، ص١٢٤.**

(١٠٨٩) **عدنان هریر جودة الزبیدي، المصدر السابق، ص١٢٥.** سەبارەت بەهەنگاوەکانی سوپای ئێران بگەڕێوە بۆ پاشکۆی ژمارە (١٤).

(1090) S. B. Miles, The Contries and Tribes of the Persian Gulf, Volume.1,London, 1919,P.256.

لە نیسانی ١٧٤٢ هێزی ئێران لە جلفار هێرشیان کردە سەر خەسب و لە بەرەنگاربوونەوەیان لەگەڵ جەنگاوەرانی هۆلە، توانیان شکست بەهێزی هۆلە بدەن و خەسب داگیر بکەن[١٠٩١]، لەمیانەی ئەو جەنگە شێخ ڕەحمە کوڕی مەتەر کوژرا، لەگەڵ بەدیل گرتنی نێزیکەی ٥٠٠ جەنگاوەر لە عارەبەکانی هۆلە[١٠٩٢].

دوای گەیشتنی سوپای ئێران بە جلفار، محەمەد تەقی خان سەرکردەی گشتیی هێزی ئێران لەلایەن (سەیف کوڕی سوڵتان) ئیمامی لەکار لادراو پێشوازی لێکرا، هەروەها سوپاسگوزاری خۆی ئاراستەی نادرشا کرد، لەبەرامبەر بەدەمەوە هاتنی داواکارییەکەی، دواتر کۆبوونەوەیەك لەنێوان هەردوولا گرێدرا، تێیدا جەخت لەسەر گەڕانەوەی دەسەڵات بۆ سەیف کوڕی سوڵتان کرایەوە، لەبەرامبەر دانپێدانانی سەیف کوڕی سوڵتان بەدەسەڵات و شکۆی ئێران بەسەر عومان[١٠٩٣].

سوپای ئێران کردە سەربازییەکانیان لە ساڵی ١٧٤٣ز لەناو خاکی عومان دەست پێکرد، کە هێزی ئێران دابەش ببوونە سەر دوو هێز، یەکێکیان بە**سەرکردایەتیی** محەمەد تەقی خان بەهاوکاری سەیف کوڕی سوڵتانی دووەم لە دەریاوە هێرشەکەیان دەست پێکرد، کە ئامانجیان داگیرکردنی شاری مەسقەت بوو، هەروەها هێزەکەی دیکە بەسەرکردایەتیی گلبعەلی خان کە چەند کەتیبەیەکی تۆپی قورسی لەگەڵدا بوو ئەرکی ئەنجامدانی هێرشێکی وشکانی بوو بەمەبەستی داگیرکردنی سەحار[١٠٩٤].

سەبارەت بەهەڵمەتەکەی محەمەد تەقی خان بەئاراستەی مەسقەت، دووبارە هەردوو قەڵای جەلالی و میرانی بوونە بەربەست لەبەردەم هەوڵەکانی محەمەد تەقی خان، بۆیە لەو بارەیەوە داوای لە سەیف کوڕی سوڵتان کرد بۆ ڕازیکردنی جەنگاوەرانی قەڵاکان بۆ بەدەستەوەدانی هەردوو قەڵاکە، چونکە بەرگرییکارانی قەڵاکان لایەنگری سەیف کوڕی سوڵتان بوون، دیارە ئەم داواکارییە لەلایەن ناوبراو ڕەتکرایەوە[١٠٩٥].

---

(١٠٩١) ب.ج. سلوت، المصدر السابق، ص٣٠٥.

(١٠٩٢) عدنان هرير جودة الزبيدي، المصدر السابق، ص ص١٢٣-١٢٤.

(١٠٩٣) جمال زكريا قاسم، دولة بوسعيد في عمان وشرق افريقيا(١٧٤١-١٨٦١)، القاهرة، ١٩٦٨م، ص٤١
" غلام حسين مقتدر، منبع پيشين، ص١٢٩.

(1094) S. B. MILES, Op. Cit ,PP.257-259.
(1095) Ibid,P.259.

محەمەد تەقی خان هەڵسا بەپێڕەوکردنی سیاسەتی فێڵ و تەڵەکە، بۆ ئەم مەبەستە بانگهێشتی سەیف کوڕی سوڵتان کرا بۆ خوانێك، پاش سەرخۆشکردنی توانی مۆرەکەی لێ بدزێت، دواتر لە ڕێگەی نووسراوێك بە مۆری سەیف کوڕی سوڵتان داوا لە بەرگرییکارانی قەڵاکان کرا، ملکەچی خۆیان ڕابگەیەنن و دەرگەکانی قەڵاکان بۆ هێزی ئێران واڵا بکەن، بەم شێوەیە مەسقەت بەقەڵاکانییەوە کەوتە ژێر دەسەڵاتی محەمەد تەقی خان[١٠٩٦].

سەبارەت بەهێزەکەی گلبعەلی خان دوای تۆپ بارانکردێکی سەخت، نەیتوانی سەحار داگیر بکات، بەهۆی ئەو بەرگرییە بەهێزەی خەڵکی شارەکە و لێهاتووی ئەحمەد کوڕی سەعید والی سەحار[١٠٩٧] کە **سەرکردایەتیی** کردنی شارەکەی بەدەستەوە بوو، بوونە بەربەست لەبەردەم هەوڵەکانی گلبعەلی خان[١٠٩٨]، هەروەها دوای بێ ئومێدبوونی گەلبعەلی خان لەگرتنی سەحار، هەڵسا بەگەمارۆدانی شارەکە، هەر لەمیانەی گەمارۆدانی شاری سەحار، بەشێك لە سوپای ئێران بەمەبەستی بەدەستهێنانی دەسکەوت ڕوویانکردە قەسیر و سەحم، پاش ئەنجامدانی کارەکەیان، لەلایەن خەڵکی

---

(١٠٩٦) **وندل فيليبس، المصدر السابق، ص٦٨ " تشارلز بلجريف، المصدر السابق، ص٥١.**

(١٠٩٧) ئەحمەد کوڕی سەعید لەساڵی ١٧٠٤ز لەگوندی ئادەم لە دەوروبەری ناوەڕاستی ڕۆژئاوای عومان لەدایکبووە، ئەم بنەماڵەیە ناسراون بە (ئەلبوسەعید) زیاتر ئەم ناوە دەگەڕێتەوە بۆ باوە گەورەیان، ئەحمەد کوڕی سەعید لە ساڵی ١٧٢٤ز چۆتە خزمەتی شێخەکانی یەعاربە، دواتر لە ساڵی ١٧٣٦ز دەبێتە ڕاوێژکاری سەیف کوڕی سوڵتان ١٧٢٨ -١٧٤٣، لەبەر لێهاتوویی زیرەکی دەبێتە بەڕێوەبەری بەندەری سەحار، پاشان لەسەر ڕاسپاردەی سەیف کوڕی سوڵتان دەکرێتە والی شاری سەحار، هەروەها بەدامەزرێنەری بنەماڵەی ئەلبوسەعید دادەنرێت، لەنێوان مێژوونووسە عوما**نییە**کان سەبارەت بەدەستپێکردنی دەسەڵاتی وەك فەرمانڕەوای نوێی ئەلبوسەعید راڤەی جیاوازی بۆ کراوە لەوانە سالمی پێی وایە سەرەتای دەسەڵاتی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٧٤٥ز، بەڵام ئیبن زریق ساڵی ١٧٤١ز دیارکردووە بۆ دەسەڵاتەکەی، چونکە لەو کاتەوە سەرەتای دەستپێکی ململانێیەتی لەگەڵ ئێران: **طارق نافع الحمداني، المصدر السابق، ص ص١٢٢-١٢٣ " جمال زكريا قاسم**، تاريخ الخليج...، ص١٣١ "

Selection from the Records…, PP.6-7.

(1098) S. B. MILES, Op. Cit ,PP.257 .

سەبارەت بەبۆردومانکردنی شاری سەحار لەلایەن سوپای ئێران تاڕادەیەکی زۆر قورس بووە، بەشێوەیەك ڕۆژانە نێزیکەی ٣٠٠٠ تۆپ ئاراستەی ئەم شارە کراوە: **وندل فيليبس، المصدر السابق، ص٦٩.**

ناوچەکە ڕووبەڕووی شەڕێکی سەخت بوونەوە، کە تێیدا ژمارەیەکی زۆری سەربازی ئێرانی کوژران، ئەوانەی مانەوە پاشەکشەیان کرد بەئاراستەی هێزی سەرەکییان لە سەحار[(١٠٩٩)].

لەو بارودۆخەدا سولّتان کوڕی مورشید **سەرکردایەتیی** هێزێکی گرتە ئەستۆ کە پێك دەهاتن لە عارەبەکانی زاهیرە و بەنی غافر و دانیشتووانی رستاق ڕوویکردە سەحار بەمەبەستی شکاندنی ئەو ئابلۆقەیەی کە لەلایەن سوپای ئێران خرابووە سەر شاری سەحار[(١١٠٠)]، بۆ ئەم مەبەستە سولّتان کوڕی مورشید پاش شەڕێکی توند توانی هێڵی سوپای ئێران ببڕێت و بچێتە ناو سەحار، بەڵام بەهۆی بریندار‌بوونی لە١٠ی حوزەیرانی ساڵی **١٧٤٣**ز واتە سێ ڕۆژ دوای ڕووداوەکە لە سەحار کۆچی دوایی دەکات، بەهۆی سەختی برینەکانییەوە[(١١٠١)]، هەواڵی کوژرانی سولّتان کوڕی مورشید کاریگەریی زۆری لەسەر سەیف کوڕی سولّتان دەبێت، دوای ئەوەی لە کارەکانی پەشیمان دەبێتەوە لە ناوچەی حەزم لە رستاق نیشتەجێ دەبێت، دواتر لە ناوەڕاستی ساڵی **١٧٤٣**ز دەمرێت[(١١٠٢)].

نادرشا نێزیکەی **٣٥٠٠** جەنگاوەری ناردە عومان بەمەبەستی پاڵپشتی کردنی هێزی ئێران لەناو خاکی عومان، هۆکارەکەشی زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ شەکەت و ماندوبوونی هێزی ئێران لەبەرامبەر ئەو هێرشانەی کەلەلایەن عومانییەکان دەکرایە

---

(١٠٩٩)) نورالدين عبدالله بن حميد السالمی، المصدر السابق، ص١٤٧.

(١١٠٠) المصدر نفسه، ص١٤٨.

**(١١٠١) سالَم بن حمود بن شامس السيابی، المصدر السابق، ص١٠٧.**

**(١١٠٢) رودلف سعيد رويت، سعيد بن سلطان ١٧٩١ – ١٨٥٦ سيرته و دوره في تاريخ عمان وزنجبار، ترجمة: عبدالحميد حسيب القيسی، الدار العربية للموسوعات، بيروت، ١٩٨٨م، ص٤١** . لە گێڕدراوە عوما**نییە**کان هۆکاری پاشەکشەکردنی سەیف کوڕی سولّتان لە هاوپە**یمانییە**تەکەی لەگەڵ ئێراندا کراوە، پێیان وایە لـەکاتی داگیرکردنی مەسقەت ئێرا**نییە**کان ڕازی نەبوون قەڵاکانی مەسقەت، مەترەح، نەزوا و رستاقی بۆ بگەڕێنـەوە، **بگرە** خستیانە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، لەلایەکی دیکەوە هەستکردنی بـەوەی کـە لەلایـەن ئێرانییـەکان فێڵـی لێکراوە بۆیە ئەم بڕیارەی داوە.

جمال زكريا قاسم، تاريخ الخليج...، ص١٢٩ "

Selection from the Records…, P.5 " Patricia Risso, Op. Cit ,P.41.

سەریان، هەروەها نادرشا دەسەڵاتی تەواوی بەخشیبووە ئەو هێزە بۆ ئەنجامدانی هەر کارێکی توندوتیژی کە پێویست بکات بۆ جێگیربوونی دەسەڵاتیان لە ناوچەکە(١١٠٣)، پاش گەیشتنی سوپای یەدەك بۆ ناو خاکی عومان، دەستکرا بەکرداری کوشتن و بڕین لە سەرتاسەریی عومان، کە بەرئەنجامەکەی بەکوژرانی ژمارەیەکی زۆری خەڵکی عومان تەواو بوو سەرەڕای گواستنەوەی خەڵکێکی زۆر لە ژن و منداڵ بۆ بازاڕەکانی کۆیلە لە شیراز، هەروەها دیاردەی وەرگرتنی باج و سەرانەی زۆر قورس یەکێك لە دیارترین دیاردەکانی ئەو هێزە بوو کە پیادەیان دەکرد(١١٠٤).

لەلایەکی دیکەوە بارودۆخی سەحار لەوپەڕی خراپی دابوو، بەشێوەیەك ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئابلۆقەدانەکە توندتر دەکرا، بەڵام پێگەی جوگرافی سەحار هۆکارێکی سەرەکیی بوو بۆ مانەوەی لەژێر ئەو فشارە بەهێزەی سوپای ئێران، چونکە سەحار دەکەوێتە بەشێك کە ناسراوە بە"سەهل ئەلباتنییە" لەسەر کەناراوەکانی عومان، هەروەها بەدەریاوە نووساوە سەرەڕای بوونی کەندەڵانێك لەبەرەی وشکانی لەگەڵ دیوارە بەرز و بەهێزەکانی کە ڕێگربوون لەبەردەم شاڵاوەکانی هێزی ئێران(١١٠٥).

سەرەڕای لێهاتووی ئەحمەد کوڕی سەعید، کە ناسراوە بەوەی توانای زاڵبوونی هەیە بەسەر باردۆخە ناهەموارەکان(١١٠٦)، بەڵام درێژبوونەوەی گەمارۆیەکە بۆ ماوەی هەشت مانگ هۆکارێکی سەرەکیی بۆ کەمبوونەوەی خۆراك لەناو سەحار، هەر ئەم هۆکارە پاڵی نا بە ئەحمەد کوڕی سەعید داوای دانوستاندن بکات(١١٠٧)، دوای ئەو بارودۆخەش ئەحمەد کوڕی سەعید توانی باوەڕ بەمحەمەد تەقی خان سەرکردەی گشتیی هێزی ئێران بکات، کە دانوستاندن ئەنجام بدەن بۆ کۆتایی هێنان بەئابلۆقەدانەکە، لەکۆتایدا محەمەد تەقی خان ڕەزامەندیی خۆی نیشاندا، چونکە گەیشتە ئەو بڕوایە کە سوپای ئێران

---

**(١١٠٣) عدنان هرير جودة الزبيدي، المصدر السابق، ص١٣٣.**

(١١٠٤) نورالدين عبدالله بن حميد السالمي، المصدر السابق، ص١٤٧.

(1105) S. B. MILES, Op. Cit ,P.260.

**(١١٠٦) طارق نافع الحمداني، المصدر السابق، ص٥١.**

(١١٠٧) جمال زكريا قاسم، تاريخ الخليج...، ص١٢٩.

نەیتوانی مەبەستەکانی هەڵمەتەکە بەدەست بهێنێت، پاش لەدەستدانی زیاتر لە دوو هەزار کەس وەك قوربانی هەڵمەتەکە[١١٠٨].

٢- پەیماننامەی ئاشتی ١٧٤٣ز و بەرئەنجامەکانی

محەمەد تەقی خان دوای ئەوەی ڕەزامەندیی خۆی نیشاندا لەسەر دانوستاندن، ئەحمەد کوڕی سەعید دەستی هەڵگرت لە بەرگرییەکانی، هەروەها ئامادەی خۆی نیشاندا بۆ بەدەستەوەدانی شاری سەحار، بەڵام بەمەرجی ئابڕومەندانە کە تێیدا ژیانی پارێزراو بێت و فەرمانڕەوایەتی سەحار و هەندێ ناوچەی دیکە بکات[١١٠٩]، بۆ ئەم مەبەستە دوای گفتوگۆکانی هەردوولا، لە تەمووزی ساڵی ١٧٤٣ز پەیماننامەی ئاشتی گرێدرا[١١١٠]، کە تێیدا جەخت کرایەوە لەسەر هەڵگرتنی ئابلۆقەی سەر شاری سەحار لەلایەن هێزی ئێران، هەروەها مانەوەی ئەحمەد کوڕی سەعید وەك فەرمانڕەوای سەحار و بەرکا، لە بەرامبەردا پێویستە لەسەر فەرمانڕەوای سەحار باجی ساڵانە بەئێران بدات، لەگەڵ قبوولکردنی دەسەڵاتداریەتی ئێران بەسەر شاری مەسقەت[١١١١].

دوای ڕازی بوونی محەمەد تەقی خان لەسەر مەرجەکان و گرێدانی پەیماننامەی ئاشتی سەحاری بەجێ هێشت، ئەحمەد کوڕی سەعید وەك فەرمانڕەوای سەحار و چەند ناوچەیەکی دیکەی عومان دەستنیشان کرا، پاش ئەوەی سوپای ئێران بۆ ماوەی هەشت مانگ گەمارۆی شارەکەیدا، نێزیکەی سێ هەزار کەسیش بوونە قوربانی، کۆتاییەکەی بەقازانجی ئەحمەد کوڕی سەعید تەواو بوو[١١١٢].

---

(1108) Lockhart, Op. Cit ,P.169.

(١١٠٩) عباس اقبال اشتیانی، منبع پیشین، ص١٠٦.

(١١١٠) هەندێك لە سەرچاوە فارسییەکان ڕوودانی هەر ڕێکەوتننامەیەك یاخود ئاگربەستێك لەنێوان محەمەد تەقی خان و ئەحمەد کوڕی سەعید ڕەتدەکەنەوە، **بگرە** پێیانوایە ئەحمەد کوڕی سەعید هەڵساوە بە پێشکێش کردنی هاوکاری بۆ ئێر**انییە**کان، ئەم کارەی بۆتە جێگەی ڕەزامەندیی محەمەد تەقی خان، کە وەك فەرمانڕەوای سەحار دەست نیشانی بکات: **جمال زکریا قاسم**، تاریخ الخلیج...، ص١٢٩-١٣٠.

(1111) S. B. MILES, Op. Cit ,PP.261 "

**وندل فیلیبس، المصدر السابق، ص٦٩.**

(١١١٢) حاج میرزا حسن حسینی فسائی منبع پیشین، ص ص٥٦٦-٥٦٧.

لە ساڵی ١٧٤٣ز گۆڕانکارییەکی سیاسی سەربازی باڵی کێشا بەسەر ناوچەکە، ئەویش هەڵگیرساندنەوەی جەنگ بوو لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران[١١١٣]، بۆ ئەم مەبەستە نادرشا چەند کەشتییەکی خۆی لە کەناراوەکانی عومان کێشایەوە بەمەبەستی هێرشکردنە سەر شاری بەسرە[١١١٤]، هەروەها لەو بارودۆخەدا ملمملانێ و ڕکابەری توند لەنێوان محەمەد تەقی خان سەرکردەی گشتیی هێزی ئێران و گەلبعەلی خان دەستی پێکرد، بەشێوەیەك هەرلایەکیان لە هەوڵی ئەوەدا بوو دەرخستنی کێماسییەکانی ئەویدیی لە ڕێگەی سکاڵاکانیانەوە دژ بەیەکدیی ئاراستەی نادرشا بکەن بەمەبەستی دوورخستنەوەی لایەکیان لە پۆستەکەیان[١١١٥].

نادر شا لەبەرئەوەی خۆشەویستییەکی تایبەتی بۆ محەمەد تەقی خان هەبوو، لە سەرەتادا بانگهێشتی گەلبعەلی خانی کرد لەسەر سکاڵانامەکانی سەرکردەی گشتیی هێزی ئێران بۆ لێپێچینەوە، دواتر بڕیاریدا بەدوورخستنەوەی لە پۆستەکەی و گەڕاندنەوەی بۆ شیراز، دانانی محەمەد حوسێن خان قرقلو ئەفشاری لە جێگەی ئەو وەك سەرکردەی هێزی وشکانی ئێران لە عومان[١١١٦].

جێگەی ئاماژە پێکردنە محەمەد تەقی خان دوای گرتنی شاری مەسقەت جۆرێك لەخۆبایی بوون لەناخیدا چەکەرەی کردبوو، بۆیە دوای ئەوەی لەلایەن نادرشا بانگهێشتکرایەوە بۆ ئێران، گەڕایەوە بەندەر عەباس، لەوێش بیرۆکە و نەخشەی هەڵگەڕانەوەی دژ بەنادرشا کێشا، بۆ ئەم مەبەستە داوای لە گەلبعەلی خان کرد، بۆ یارمەتیدانی و پیشکێش کردنی هاوکاری بۆ جێبەجێکردنی بیرۆکەکەی دژ بەنادرشا[١١١٧]، مەبەستەکانی محەمەد تەقی خان لەبەرپاکردنی شۆڕش دژ بەنادرشا لە هەرێمی فارس زیاتر ئاواتەخواز بوو لەو ڕێگەیەوە دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێت بەسەر فارس و بەندەر و دوورگەکانی کەناراوەکانی ئێران، دواتریش بانگهێشتی دەسەڵاتی ڕەها

---

(١١١٣) **ب.ج. سلوت، المصدر السابق، ص٣١٥.**

(١١١٤) لکهارت، نادرشا، ص٢٧٧ "

.Lockhart, Op. Cit ,P.169

(١١١٥) جواد موسوی دالینی، لیدا مودت، منبع پیشین، ص٥٥ " **ب.ج. سلوت، المصدر السابق، ص٣٠٧.**

(١١١٦) لکهارت، نادرشا، ص٢٧٧.

(١١١٧) علی زرین قلم، منبع پیشین، ص١٠٣.

و سەربەخۆ بکات دوور لە دەسەڵاتی نادرشا[1118]، بەڵام داواکارییەکەی **محەمەد** تەقی خان بەمەبەستی پێشکێش کردنی هاوکاری لەلایەن گەلبعەلی خان ڕەتکرایەوە، بۆیە ململانێی نێوان هەردوولا زیاتر بەرەو ئاڵۆزی ڕۆیشت، کە ئاکامەکەی بەکوژرانی گەلبعەلی خان بەدەستی **محەمەد** تەقی خان تەواو بوو[1119].

نادرشا لە کۆتاییەکانی ساڵی **١٧٤٣**ز هەڵمەتێکی سەربازی دژ بەهەڵگەڕانەوەی **محەمەد** تەقی خان ڕێکخست، دوای شەڕێکی سەخت توانی بەسەریدا زاڵ بێت، لەناوبردنی شۆڕشەکە ئەرك و ماندوبونێکی زۆری خستە سەرشانی نادرشا، هەرچەندە دوای ئەم ڕووداوە هەوڵی دا جارێکی دیکە ڕووبکاتەوە کاروباری عومان، بەڵام جەنگەکانی عوسمانی ڕێگر بوون لەبەردەمیدا[1120].

خراپی بارودۆخی ئێران دوای هەڵگەڕانەوەکەی **محەمەد** تەقی خان، هەلێکی زێڕین بوو بۆ ئەحمەد کوڕی سەعید، چونکە دوای ئەو ڕووداوانە ئەحمەد کوڕی سەعید زۆر زیرەکانە خۆی دوورخستەوە لەو مەرجانەی کە لە پەیماننامەی تەمووزی ساڵی **١٧٤٣**ز لەلایەن ئێرانەوە بەسەریدا سەپێندرابوون[1121]، لە هەیەکەمین کاردانەویدا ڕەتیکردەوە باجی ساڵانە بدات بەدەسەڵاتدارانی ئێران لە مەسقەت، بەبیانووی نەبوونی هۆکارێکی گونجاو بۆ گواستنەوەی باجەکە بۆ مەسقەت[1122]، هەروەها لە هەنگاوێکی بوێر و ژیرانەدا توانی ڕێگە بگرێت لە گەیشتنی کەلوپەلی بازرگانی بۆ حامییەی ئێران لە مەسقەت، لە ڕێگەی کەمکردنەوەی باجی سەپێندراو لەسەر کەلوپەلە بازرگانییەکان، ئەم کارەی ئەحمەد کوڕی سەعید بووە هۆکارێك کە بازرگانەکان بۆ ساخکردنەوەی کەلوپەلەکانیان ڕووبکەنە بەرکا نەك مەسقەت[1123].

---

(1118) Selection from the Records…, PP.5-6.

(١١١٩) عبدالرفيع حقيقت، منبع پيشين، ص١٤٩.

(١١٢٠) **عبدالامير محمد امين، القوى البحرية في ...، ص٢١.** سەبارەت بەهەڵگەڕانەوەکەی میرزا محەمەد تەقی خان و چارەنووسی بگەڕێوە بۆ: **رضا** شعبانی، میرزا محمد تقی...، منبع پيشين، ص ص٢٣٣-٢٣٧.

(١١٢١) **وندل فيليبس، المصدر السابق، ص٦٩.**

(١١٢٢) **جمال زكريا قاسم**، تاريخ الخليج...، ص١٣٠.

(١١٢٣) **سالَم بن حمود بن شامس السيابى، المصدر السابق، ص١٢٩.**

ئەو هەنگاوەی ئەحمەد کوڕی سەعید زەبرێکی کوشندە بوو بۆ هێزی ئێران لە مەسقەت، چونکە دوای ئەو هەنگاوە فەرماندەکانی سوپای ئێران نەیانتوانی مووچە و پێداویستییەکانی سوپا ئامادە بکەن، کە بەرئەنجامەکەی هەڵگەڕانەوە و ڕاکردنی سەربازانی ئێرانی لە سەربازگەکانی مەسقەتی لێکەوتەوە[١١٢٤]، لەو بارودۆخەدا فەرمانڕەوای سەحار توانی سوود لەو هەلە زێڕینە وەربگرێت و بانگهێشتی بەشێك لە فەرماندەکانی سوپای ئێران لە مەسقەت بکات بۆ بەرکا بەمەبەستی دانوستاندن لەسەر چۆنییەتی پێدانی باجی ساڵانە، پاش داوەتکردنیان لەلایەن خەڵکی بەرکا بەفەرمانی ئەحمەد کوڕی سەعید بەتوندترین شێواز لەنێوبردران[١١٢٥].

فەرماندەکانی سەربازگەی ئێرانی لە مەسقەت دوای ئەم ڕووداوە لە ڕێگەی ماجید کوڕی سوڵتان برای سەیف کوڕی سوڵتان نامەیەکیان ئاراستەی نادرشا کرد، کە تێیدا باس لە خراپی بارودۆخی سوپای ئێران دەکرا لەعومان، بۆیە نادرشا پاش ئاگەداربوونەوەی لە بارودۆخی سوپاکەی لە عومان، لە ڕێگەی نامەیەك کە دابووی بەماجید کوڕی سوڵتان داوای لە سوپاکەی کرد عومان بەجێبهێڵن و بگەڕێنەوە ناو خاکی ئێران[١١٢٦].

دوای گەڕانەوەی (ماجید کوڕی سوڵتان) بەهۆی خراپی کەشوهەوا ئاراستەی ڕێڕەوی کەشتییەکە گۆڕا بەرەو کەناراوەکانی سەحار، لەوێش لەلایەن ئەحمەد کوڕی سەعید دەستگیر دەکرێت و نامەکەی نادر شا دەکەوێتە دەست ئەحمەد کوڕی سەعید[١١٢٧].

ناوەرۆکی نامەکە هەواڵێکی خۆش بوو بۆ عومانییەکان، بۆیە ئەحمەد کوڕی سەعید ڕوویکردە مەسقەت و داوای لە فەرماندەکانی سەربازگەی ئێرانی لە مەسقەت کرد خۆیان بدەن بەدەستەوە و ژیانیان پارێزراو دەبێت و دەیانگەڕێننەوە بۆ بەندەر عەباس، بۆ ئەم مەبەستە هێزە ئێرانییەکەی مەسقەت لەسەر بەڵێنەکانی ئەحمەد کوڕی سەعید

---

(١١٢٤) **وندل فيليبس، المصدر السابق، ص٦٩.**

(١١٢٥) سەبارەت بەڕێوڕەسمی بانگهێشتکردنی فەرماندەکانی سوپای ئێران بۆ مەسقەت و چارەنووسی ئەم فەرماندانە لەلایەن خەڵکی بەرکا بڕوانە: **وندل فيليبس، المصدر السابق، ص ص٦٩-٧٠.**

(١١٢٦) **حميد بن محمد بن رزيق العبيداني النخلي**، المصدر السابق، ص٣٣.

(١١٢٧) **سالم بن حمود بن شامس السيابي، المصدر السابق، ص١٣٠ " جمال زكريا قاسم**، تاريخ الخليج...، ص١٣٠-١٣١.

خۆیان رادەستی عومانییەکان کرد، بەڵام لە رێگەی نقوومکردنی کەشتییەکان لەلایەن دەریاوانە عارەبەکان هیچ سەربازێکی ئێرانی رزگاری نەبوو[(١١٢٨)]، بەم شێوەیە ئەحمەد کوڕی سەعید توانی سەحار و مەسقەت و هەموو ناوچەکانی عومان بخاتەوە ژێر دەسەڵاتی، جگە لە بەندەری جلفار نەبێت لەژێر دەسەڵاتی سوپای ئێران مایەوە[(١١٢٩)].

سەرنەکەوتنی سوپای ئێران لە بەدیهێنانی مەبەستەکانی لە عومان، دەگەڕێتەوە بۆ چەندین هۆکار، لەوانە ستەم و ڕەفتاری ناشایستەی محەمەد تەقی خان بەتایبەت بەرامبەر بەسەرکردەکانی لەوانە لەتیف خان و گەلبعەلی خان[(١١٣٠)]، هەروەها محەمەد تەقی خان نەیتوانی وەك پێویست سەودایی بکات لەگەڵ جەنگاوەر و دەریاوانەکانی کە ئاکامەکەی چەندین هەڵگەڕانەوە و یاخیبوونی لێ بەدی کرا [(١١٣١)]، جگە لەوە ئەو دەریاوانانەی نوێنەرایەتی هێزی دەریایی ئێرانیان دەکرد، زۆرینەیان هیندی و عارەب و بلوچ بوون، کە دڵسۆزیان بۆ ئێران نەبوو، بگرە زیاتر هەوڵیان دەدا بۆ وەدەستهێنانی دەسکەوت نەوەك بەجێگەیاندنی ئامانج و مەرامەکانی نادرشا[(١١٣٢)].

دەکرێت بڵێین هەرچەندە سوپای ئێران لە لەشکرکێشییەکانی بۆ سەر عومان ئەنجامی شایستەی بۆ ئێران بەدەست نەهێنا، بەڵام ناکرێت رۆڵی نادرشا لەم بوارەدا بەکەم دابنرێت، چونکە خودی نادرشا وەك کەسێك کە لە ژینگەیەکی شاخاوی و دووربوونی لە دەریا پەروەردە ببوو، بەڵام لە هزریدا لێکدانەوەیەکی زیرەکانەی کردبوو بۆ شکۆ و دەسەڵاتی ئێران، بەشێوەیەك گەیشتبووە ئەو باوەڕەی کە ئێران شکۆ و دەسەڵاتی تەواوی نابێت بەبێ بوونی هێزێکی دەریایی بەهێزی تایبەت بەخۆی، هەر ئەمەش وایکردووە لە مێژووی ئێران بەرێز و شایستەوە سەیری هەوڵەکانی بکرێت، هەرچەندە نەیتوانی پڕۆژەکەشی تەواو بکات، بەڵام بناخەی هێزی دەریایی ئێرانی بنیادنا.

---

(١١٢٨) محمد حسن العیدروس، **تاریخ الخلیج...**، ص١٠٦.

(١١٢٩) محمد حسین قدوسی، منبع پیشین، ص٣٦١ " علی زرین قلم، منبع پیشین، ص١٠٤.

(١١٣٠) جواد موسوی دالینی، لیدا مودت، منبع پیشین، ص٥٦.

(١١٣١) همان منبع، ص٥٦.

**(١١٣٢) رضا زادة شفق، المصدر السابق، ص٢٥٧.**

## ئەنجامەکانی تۆژینەوە

**١-** یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی نادرشا پەروەردەبوونی لە ژینگەیەکی ناهەموار و بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ ناخۆشییەکانی ژیان، لەگەڵ ئەوەشدا کەسێکی پلان داڕێژەر و سەرکەوتوو بووە، بۆ ئەم مەبەستەش هەر کارێکی ئەنجام دابێت زۆر زیرەکانە سەودایی لەگەڵدا کردووە، بەشێوەیەك هیچ کارێکی سیاسی یاخود سەربازی ئەنجام نەداوە بەبێ بوونی هۆکارێکی مەنتیقی، بۆ نموونە زاڵبوونی بەسەر ڕکابەرەکانی لە خۆراسان، دواتر هەنگاونان بۆ دوورخستنەوەی تەهماسب میرزا لە دەسەڵات، لەگەڵ هەنگاوە لەشکرکێشییەکانی بۆ قەندەهار، هیندستان، ئاسیای ناوەڕاست، عومان و گەڕاندنەوەی زەوییە داگیرکراوەکانی لەلایەن رووسیای قەیسەری هەر هەمووی دوای لێکۆڵینەوەیەکی وردی نادرشا و خوێندنەوەی بۆ ئەنجامەکانی کراوە.

**٢-** گەیشتنی نادرشا بەدەسەڵاتی ڕەها لە ئێران لەخۆڕا نەبووە، بگرە دوای هەوڵ و ماندووبونێکی زۆر توانی بگاتە ئەو پلەیە، هەرچەندە ئەو کاتەی کە لە دەشتی موغان دەستنیشانکرا وەك (شا)ی ئێران تەمەنی ٤٨ساڵ بوو، بەڵام چەندین ساڵ لەو تەمەنەی خەریکی بەرنگاربوونەوە و جەنگ بوو لە خۆراسان و دەرکردنی ئەفغانەکان و جەنگی ئازادی، بەواتایەکی دیکە نادرشا لە رێگەی پشت بەستن بە ئیرادەی خۆی و بەگەڕخستنی تواناکانی توانی بگاتە ئەو پۆستە.

**٣-** نادرشا توانی دیاردەیەکی نوێ لە ئێران بهێنێتە کایەوە، بەتایبەت پاش ئەوەی لە دەشتی موغان هەموو کاربەدەستانی سیاسی و سەربازی کۆکردەوەی‌و داوای لێکردن بۆ هەڵبژاردنی (شا)یەکی نوێ بۆ وڵات، کە تێیدا توانی ئەو دیاردەیە بسڕێتەوە کە بەدرێژایی تەمەنی دەوڵەتی سەفەوی باو بوو بۆ دەست نیشانکردنی شا بەشێوەی پشتاوپشت، کەچی نادرشا لەو گردبوونەوەیەدا بەڕاسپاردەی خەڵکی ئامادەبوو هاتە سەر تەختی دەسەڵات، هەرچەندە خۆشی ئارەزووەکانی نەدەشاردەوە بۆ بوون بە(شا)ی ئێران.

**٤-** داگیرکردنی قەندەهار گرینگی و بایەخی تایبەتی خۆی هەبوو بۆ خودی نادرشا لەلایەك و مێژووی ئێران لەلایەکی دیکەوە، چونکە بەم داگیرکردنە تاڕادەیەك نادرشا توانی ئەو پەڵە ڕەشە لە مێژووی ئێران بسڕێتەوە، کە بەر لە١٦ساڵ ئەفغانەکان **بەسەرکردایەتیی** میر مەحمود بەسەر ئێرانیان داهێنابوو، هەروەها رێگە خۆشکەریش

بوو بۆ خودی نادرشا مەبەستە فرەوانخوازییەکانی جێبەجێ بکات، پاش ئەوەی توانی بەسەر گەورەترین ئاستەنگ زاڵ بێت و دەرگەکانی بۆ واڵا بێت بەڕووی هیندستان و ناوچەکانی ئاسیای ناوەڕاست.

**٥-** گەڕاندنەوەی تاجی (شا)یەتی بۆ ئیمپراتۆری هیندستان لەلایەن نادرشا، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نادرشا نیازی تەواوی نەبووە دەسەڵاتی تەواوی خۆی لە وڵاتێکی پان و بەرینی وەکو هیندستان جێگیر بکات، بگرە زیاتر پرسەکە پێوەست بووە بەهۆکاری ئابووری، چونکە لەرێگەی ئەو دەسکەوتانەی کە لە هیندستان بەدەستی هێنا توانی تا ڕادەیەك ئاڵۆزی و ئاشوب لە ناوەخۆی وڵات کەم بکاتەوە، لەهەمان کاتدا مەرامە راستەقینەکەی جێبەجێ بکات، ئەویش پێکهێنانی ئیمپراتۆریەتێك بوو، کە خۆی لەسەری هاوکێشەکەدا بێت، ئەویش لە کاتێکدا دەچێتە بواری جێبەجێکردن کە خودی نادرشا خاوەن ئابوورییەکی بەهێز و سوپایەکی گەورە و ئامادەکراو بێت، لەو رێگەیەوە سوڵتان و کاربەدەستانی عوسمانی ملکەچ بکات بۆ ئیرادە و مەبەستەکانی خۆی.

**٦-** نادرشا لە رێگەی داگیرکردنی هیندستان و ئاسیای ناوەڕاست دەیویست لاسایی سەرکردە گەورەکانی وەك ئەسکەندەری مەکدۆنی و مەحمودی غەزنەوی و تەیمورلەنگ بکاتەوە لەو رێگەیەوە ناوی لە بیرەوەرییەکانی خەڵك و مێژوو تۆمار بکرێت بەوەی کە نادر شا لەئاستی ئەو سەرکردە مێژووییانە دایە، هەر بۆ ئەم مەبەستە مێژوونووسە رۆژئاواییەکان نادرشا بە ناپلیۆنی رۆژهەڵات ناوزەد دەکەن، چونکە نادرشا توانی ئێرانی لێکترازاو رێك بخاتەوە، بەمەش نەوەستێت بگرە زلهێزانی ناوچەکەش بخاتە مەترسییەوە، لە ماوەیەکی کەم توانی شکست بدات بەپێنچ پادشا و شکۆ و سنووری ئێران بەرفرەوان بکات، سەرەڕای ئەوەش لەگەڵ بیستنی ناویشی لەو کاتەدا دوژمنانی تووشی دڵەڕاوکێ و ترس کردبوو.

**٧-** هەرچەندە نادرشا لە سەرەتادا وەك فریادڕەس و زگارکەرێك لەناو ئێران ناسرا، بەڵام دواتر بەهۆی گۆڕانکاریی لە ڕەفتار و کەسایەتیی بەتایبەت دوای کوێرکردنی رەزا قوولی کوڕی، گۆڕانکاریی لە هەڵوێست و کارەکانی بەدی کرا، ئەمەش وایکرد نارەزاییەکان لە ئێران پەرەبسێنێت و یاخیبوون لە دەسەڵاتی سەر هەڵبدات، بۆ نموونە دوای داگیرکردنی دەلهی بۆ ماوەی ٣ ساڵ خەڵکی ئێرانی بەخشی لە دانی باج و سەرانە، کەچی دواتر بەتوندترین شێوە لێیانی وەرگرتەوە، سەرەڕای سەپاندی باجی زیاتر، بەواتایەکی دیکە لە کۆتاییەکانی فەرمانڕەوایدا زیاتر کەوتە بەر گرینگی دان

بەکۆکردنەوەی داهات و عەمبارکردنی لە قەڵای کەلات، خۆ دوورگرتن لە دابینکردنی ژیانی ئارام و خۆشگوزەران بۆ تاکی ئێرانی.

**٨-** نادرشا لەماوەی فەرمانڕەوایەتییەکەی لە ئێران، تەنیا خەریکی لەشکرکێشیی و جەنگ بووە لە دەرەوەی سنووری ئێران، بەهیچ شێوەیەك نەپەرژاوەتە سەر لایەنەکانی دیکەی پێشکەوتن و شارستانی، بۆیە ئەگەر بەراورد بکرێت بەماوەی فەرمانڕەوای دەوڵەتی سەفەوی پاشەکشەیەکی زۆری لێ بەدی دەکرێت لە ڕووی شارستانی و ئاوەدانی.

**٩-** شکستخواردنی نادرشا لە گرتنی شاری موسڵ هیواکانی تێکشکاند، چونکە نادرشا لە هەوڵی ئەوەدا بوو دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتەکەی درێژ بکاتەوە بۆ وڵاتی شام و کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست، دواتریش هەژموونی خۆی لە عێراق و وڵاتی شام و ئەنادۆل بسەپێنێت، بەڵام بەهۆی شکستخواردنی لە گرتنی شاری موسڵ هیواکانی جێبەجێ نەبوون.

**١٠-** بانگەشە ئاینییەکە (ئاینزای جەعفەری) لەناخ و بیری نادرشا هەڵقوڵابوون، بەواتایەکی دیکە ئەم داواکارییانە ڕاوبۆچوونی تەواوی خەڵکی ئێران نەبوو، هەرچەندە داواکارییە ئاینییەکان لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی ڕەتکرایەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا لەلایەن زانایانی شیعە جێگەی قبوولکردن نەبوو، بگرە بەهۆی زەبر و دەسەڵاتی نادرشا توانی بۆچوونی خۆی بسەپێنێت، بەڵگەش بۆ ئەمە هەر لەدوای کوژرانی نادرشا ١٧٤٧دووبارە شەڕی ئاینزای دەست پێدەکاتەوە.

**١١-** سەرەڕای گرینگی کۆنگرەی نەجەف، بەڵام سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، لەوانەیە بارودۆخی سیاسیی رۆڵی سەرەکیی بینیبێت لەو نێزیکبوونەوەیە، ئەویش باڵادەست بوونی نادرشا و هەژموونی سوپاکەی لەناو خاکی عوسمانی کە زۆرێك لە ناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەلایەن سوپای ئێرانەوە داگیرکرابوو، لەلایەکی دیکەوە ئەو نێزیك بوونەوە نەبووە جێگەی رەزامەندی شیعە ئاینزاکان لە ئێران و سونە ئاینزاکان لە دەوڵەتی عوسمانی، چونکە ئەو نێزیکبوونە ئاینزایە نەیتوانی ڕەگوڕیشەی خۆی داکوتێت لە ناواخنی دڵەکان، بگرە خوێندنەوەیان بۆ یەکدیی لە ناخەوە خراپ خۆی حەشاردابوو، بۆیە لەگەڵ ئەوەش کە ڕێککەوتننامەی ئاینزایشیان مۆرکرد، بەڵام کارێکی ڕووکەش و هەڕەمەکی بوو.

**١٢-** خراپی بارودۆخی ناوەخۆیی ئێران بەهۆی زۆری نارەزاییەکانی خەڵك و **راپەڕین** هەڵگەڕانەوەکان لە زۆرینەی ناوچەکانی ئێران بەهۆی سەپاندنی باجی زۆر و سەودایی توندی کاربەدەستانی حکوومەت بەر لە کوژرانی نادرشا، بووە هۆکارێك بۆ ئەوەی نادرشا بەرێککەوتننامەی ئاشتی (کرند) رازی بێت سەرەڕای سەرکەوتنەکانی لە بەرەی جەنگ، چونکە نادرشا گەیشتە ئەو بڕوایەی بۆ ئەوەی زاڵ بێت بەسەر ئەو بارودۆخەدا پێویست بوو لە دەوڵەتی عوسمانی دڵنیا بێت، ئینجا دەتوانێت بپەرژێتە سەر بارودۆخی ناوەخۆیی، باشترین چارەسەر بۆ ئەم کارە رێکەوتن بوو لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، هەروەها لەوانەیە ئەم رێککەوتننامەیە لە هزری نادرشا وەك ئاگربەستێك بووبێت، چونکە سرووشتی نادرشا وابوو ئەگەر بۆی بکرایە هەوڵی دەدا ئارەزوو و **بەرژەوەندییە**کانی جێبەجێ بکات، بەڵام کوژرانی نادرشا لەو ماوەیەدا دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگێکی دیکەی سەرتاسەری رزگار کرد، چونکە پاش کوژرانی نادرشا پشێوی وڵاتی گرتەوە، بەمەش دەوڵەتی عوسمانی نێزیکەی چارەکە سەدەیەك ١٧٤٧ تاکو ١٧٧٥ز لە هەڕەشە و مەترسییەکانی ئێران دوورکەوتەوە.

**١٣-** هەرچەندە سوپای ئێران لە لەشکرکێشییەکانی بۆ سەر عومان ئەنجامی شایستەی بۆ ئێران بەدەست نەهێنا، بەڵام ناکرێت رۆڵی نادرشا لەم بوارەدا بەکەم دابنرێت، چونکە خودی نادرشا وەك کەسێکی پەروەدەی شاخ و دووربوونی لە دەریا، بەڵام لە هزریدا لێکدانەوەیەکی زیرەکانەی کردبوو بۆ شکۆ و دەسەڵاتی ئێران، بەشێوەیەك گەیشتبووە ئەو باوەڕەی کە ئێران شکۆ و دەسەڵاتی تەواوی نابێت بەبێ بوونی هێزێکی دەریایی بەهێز تایبەت بەخۆی، هەر ئەمەش وایکردووە لە مێژووی ئێران بەرێز و شایستەوە سەیری هەوڵەکانی بکرێت، هەرچەندە نەیتوانی پرۆژەکەشی تەواو بکات، بەڵام بناخەی هێزی دەریایی ئێرانی بنیادنا.

## لیستی پاشكۆكان

**پاشكۆی ژماره (١):** زنجیرەی خانەوادەی نادرشا (شجرنامە خانوادە نادرشاه).

**پاشكۆی ژماره (٢):** فەرمانێكی فەرمی شا تەهماسب میرزا بۆ دانانی ئەڵلا قلیخان قاجار وەك فەرمانڕەوای ئەستراباد و جەختكردنەوەی لەسەر ناپاكییەكانی **فەتح** عەلیخان قاجار.

**پاشكۆی ژماره (٣):** دەقی فەرمانەكەی تەهماسب قوولی بۆ عاشوور خان پاپاڵوی ئەفشار فەرمانڕەوای ئورومییە بەمەبەستی ئامادەكاریكردن بۆ گەڕاندنەوەی سێ هەزار خانەوادەی ئەفشاری لە ئازەربایجانەوە بۆ ئەبیوەرد.

**پاشكۆی ژماره (٤):** دەقی ناوەرۆكی نامەكەی مەلاباشی عەلی ئەكبەر گەورە مەرجەعی ئاینی شیعەی ئێران كە ئاراستەی یەحیا ئەفەندی ئەلفەخری موفتی شاری موسڵ كرا بۆ خۆ بەدەستەوەدان.

**پاشكۆی ژماره (٥):** دەقی نامەكەی یەحیا ئەفەندی ئەلفەخری موفتی شاری موسڵ وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ نادرشا و رەتكردنەوەی خۆبەدەستەوەدان.

**پاشكۆی ژماره (٦):** دەقی نامەكەی قوچەخان شەیخانلو سەركردەی سوپای ئێران بۆ رۆستەم ئاغا بەرپرسی شاری بەسرە بەمەبەستی رادەستكردنی شارەكە بە سوپای ئێران.

**پاشكۆی ژماره (٧):** دەقی وەڵامدانەوەی خەڵكی بەسرە بۆ قوچەخان شەیخانلو سەركردەی سوپای ئێران.

**پاشكۆی ژماره (٨):** دەقی فەرمانی نادرشا بۆ دیاریكردنی تەهمورس خان وەك فەرمانڕەوای گورجستان.

**پاشكۆی ژماره (٩):** هەنگاوەكانی لەشكركێشیی نادرشا بۆ قەندەهار، هیندستان، سند، ئاسیای ناوەڕاست ١٧٣٦-١٧٤٠ز.

**پاشكۆی ژماره (١٠):** هەنگاوەكانی لەشكركێشیی نادرشا بۆ داغستان و عێراق ١٧٤٠ – ١٧٤٣ز.

**پاشكۆی ژماره (١١):** هەنگاوەكانی لەشكركێشیی نادرشا بۆ ناوچەی قارس ١٧٤٤ – ١٧٤٥ز.

**پاشكۆی ژماره (١٢):** هەنگاوەكانی لەشكركێشیی یەكەمی سوپای ئێران بۆ عومان ١٧٣٧ ز

**پاشكۆی ژماره (١٣):** هەنگاوەكانی لەشكركێشی دووەمی سوپای ئێران بۆ عومان ١٧٣٨

**پاشكۆی ژماره (١٤):** هەنگاوەكانی لەشكركێشی سێیەمی سوپای ئێران بۆ عومان ١٧٤٢ – ١٧٤٣.

شجره‌نامه خانواده نادرشاه افشار و فرزندان او تا انقراض سلطنت سلسله نادری

طایفه قرقلو (قرخلو) از ایماقی ایل افشار

نادرقلی بیک [1]

بکتاش بیک

امامقلی

محمد ابراهیم خان - ظهیرالدوله

نذر - نادرقلی
ملقب
طهماسبقلیخان - وکیل الدوله - نایب السلطنه - نادرشاه

زوجات

۱- دختر بزرگ باباعلی بیک کوسه احمدلو
۲- گوهرشاد دختر کوچک باباعلی بیک
۳- راضیه بیگم دختر شاه سلطان حسین صفوی
۴- دختر ابوالفیض خان پادشاه بخارا

کاظم
حسین بیک
محمدعلی بیک یا ابراهیم خان
علیقلی خان ملقب علیشاه - عادلشاه

محمدالله خان
چنگیز خان

امامقلی
نصرالله میرزا

رضاقلی میرزا

اسدالله
اکزلوخان
مرتضی قلی خان
سهراب سلطان
تیمورخان
مصطفی خان
یلدوزخان

محمودخان
بیستون
همایون
احمدقلی
فتحعلی
شاهرخ

امامقلی میرزا
نصرالله میرزا
عباس میرزا
نادر میرزا

۱- نقل از کتاب [illegible] که در نسب خاندان نادرشاه نگاشته شده است.

۲- از خاندان نادرشاه بسیاری در مشهد و دیگر در اصفهان و سایر نواحی ایران پراکنده‌اند.

**پاشكۆی ژماره ( ١ )**

**زنجیرەی خانەوادەی نادرشا ( شجرنامە خانوادە نادرشاه )**

**وەرگیراو لە : رضا زادە شفق، المصدر السابق،ص٣٢٢.**

سند شماره ۱

بسم الله الرحمن الرحیم

پاشکۆی ژماره ( ٣ )

دەقی فەرمانەکەی تەهماسب قولی بۆ عاشوور خان پاپاڵوی ئەفشار فەرمانڕەوای ئورومییە بەمەبەستی ئامادەکاریکردن بۆ گەڕاندنەوەی سێ هەزار خانەوادەی ئەفشاری لە ئازەربایجانەوە بۆ ئەبیوەرد.

وەرگیراو لە : **علی** کریمیان،منبع پیشین، ص١٩.

باسم الله العلى الاعلى .الموصل الى مدارج العلى . هذا كتاب منا الى العالم النبيل والتحرير الجليل المفتي يحيى أحياه الله كما يشتهيه ويتمناه وصانه من كل طارق وبلوى والى قاطبة قاطني الموصل حفظهم الله من المصيب والويل كي يوقظهم من رقدة الغفلة وسنة العثرة ويزيل عنهم الدهشة والوحشة فيستمعوا له وينصتوا استماع قبول واذعان وايقان واتقان . عسى ان تنجوا وتفرحوا ولا تلقوا وراء ظهوركم لقاء تعنت وطغيان تحزنوا وتندموا . واعلموا يا اخواني المؤمنين أنا جند خلقنا من رحمة الله وغضبه . فالبشرى ثم البشرى لمن اتبع وهدانا . والنذرى ثم النذرى على من خالفنا وعصانا . أو ليس لكم من آثار الماضين تبصرة ومعتبر الا فتذكروا خيار الهند والسند والترك في انموذج وصل اليكم من وقائعهم وملاحمهم . ووقائع جيرانكم من أهل كركوك وما والاها كيف تعنتوا فتندموا . ثم أطاعوا فنجوا . ذا خط في جلباب امن وأمان وشفقة ودعة وامتنان فلا تلقوا بأنفسكم الى التهلكة واتقوا فتنة لا تصيبن الذين ظلموا منكم خاصة ولا تقدرون الدفاع فلا تعرضوا اعماركم للانقطاع. قال الله عز وجل من قائل : تعاونوا على البر والتقوى ولا تعاونوا على الاثم والعدوان . وورد في الحديث : ان من فرج عن أخيه المؤمن كربة فرج الله عنه سبعين كربة يوم القيامة . ومن رأى أخاه في حفيرة فأنجاه أنجاه الله من النار. وأرسلت لكم كتابي وصحيفتي مع السيدين النجيبين الفخيمين قاضي كركوك حسن افندي ومصطفى أغا يوصلانه اليكم ويرشدانكم الى الصواب ويحذرانكم من العقاب فعليكم ان تنظروا اليه بعين الانصاف مجتنبين التعنت والاعتساف . واستقبلوا السلطان العادل الكامل الرؤوف الخاقان الاعظم العطوف أدام الله عزه وجلاله على مفارق العالمين تفرحوا وتسروا فان همته العالية معروفة بالشفقة والاستعطاف فلا تعرضوا انفسكم لنزول نيران غضبه وشدة بطشه وسخطه . انما علينا البلاغ وعليكم الحساب . علينا اتمام الحجة الغراء وعليكم سلوك المحجة البيضاء وليبلغ الشاهد منكم المستمع لكتابنا الغائب والسلام على كل من اتبع الهدى.

**پاشکۆی ژماره ( ٤ )**

**دەقی ناوەرۆکی نامەکەی مەلاباشی عەلی ئەکبەر گەورە مەرجەعی ئاینزایی شیعەی ئێران کە ئاراستەی یەحیا ئەفەندی ئەلفەخری موفتی شاری موسڵ کرا بۆ خۆ بەدەستەوەدان**

**وەرگیراو لە : سلیمان صائغ، المصدر السابق،ص ص٢٨٠-٢٨١**

باسم الله وما اعتصامنا الا بالله ومن لاذ بكهف كفايته كفاه وحماه ـ هذا كتاب فصلت آياته وتحدثت معجزاته ـ وظهرت شواهد دعوته وبيناته ظهور نار القرى ليلا على علم بل هو اشهر كجلمود صخر حطه السيل من عل ـ الى ملا باشا علي أكبر أجرى الله بذباب صمصام قهره من اذن رعونته قطرات الشرور المتصاعدة صماخ دماغه من ابخرة التخومة والغرور واخمدت شرارات تلك النيبة الفاسدة بصرصر الدمدمة الالهية كما اهلكت عادا بالدبور ـ وصل كتابكم المرسول الى العامة المشتمل بزعمكم على الطاعة فلا تغرنكم الحياة الدنيا ولا يغرنكم بالله الغرور ومفتخرين به بأنكم جند الله مخلوقون من الغضب أعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم ـ وقالوا قلوبنا في اكنة مما تدعون اليه وفي آذاننا وقر ومن بيننا وبينك حجاب فاعمل اننا عاملون ـ فالعياذ بالله أمن بعد ايماننا وطاعتنا لسلطاننا والمقاتلة دون اموالنا والمكافحة عن اولادنا وعيالنا يهو لنا منكم شقايق اللسان ـ ويروعنا سحر البيان ووسوسة الشيطان وكثرة الهذيان قام الحمام على البازي يهدده واستصرخت بأسود الغاب اضبعه يا من يسد فم الافعى باصبعه يكفيه ما قد يلاقي منه اصبعه فما وعيدكم عندنا الا كصرير باب ـ وكما طن لوح الهجير ذباب ـ افرأيتم ان القصاب تهوله كثرة الغنم او الأسد يدركه تراكم النعم ـ تذكروننا بما فعلتم بالسند والهند ـ وما فعلتم مع أولئك العلوج ـ وتدهشوننا بما فتحتم من قلعتي كركوك وأربيل وترعبوننا بأمثال تلك الأباطيل ـ كلا ستعلمون ثم ستعلمون ـ أنرتاع بالقراع ونحن الأسود الضارية ، والسباع الكواسر العادية ـ أسيافنا صقيلة ـ وسطوتنا ثقيلة ـ وحلومنا رزينة وقلوبنا كالحديد متينة ـ وبلدتنا بحمد الله حصينة لنا جبل يحتله من يجيره منيع يرد الطرف وهو كليل ستر العرش مسبول علينا ـ وعين الله ناظرة الينا ـــ وسيعلم الظالمون أي منقلب ينقلبون ـــ ورثنا عن آباء صدق ونورثها اذا متنا للبنين فلا سمع لكم ولا طاعة ـ وأهلا بالسعادة والشهادة هذه الساعة ردي حياض الردى يا نفس واتركي حياض غير الردى للشاء والنعم فما بيننا الا ما صنع الحداد ورماح مداد ويقبل الله في شأنه ما أراد حرر عن لسان الحاج حسين باشا الوزير الجليل والي مدينة الموصل المحروسة وحسين باشا والي حلب وكافة وجوه البلد وأعوامها والسلام

**پاشكۆی ژماره ( ٥ )**

**دەقی نامەكەی یەحیا ئەفەندی ئەلفەخری موفتی شاری موسڵ وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ نادرشا و رەتكردنەوەی خۆبەدەستەوەدان**

**وەرگیراو لە : سلیمان صائغ، المصدر السابق،ص ص٢٨١-٢٨٢**

عالى القدر الاكرم،جامع محامد الادب و الشيم،رستم آغا.عائه الله تعالى، و بعده فالان جرى الامر الا قدس الا على،ان نتوجه الى بلدة البصرة و ندعو اهلها الى ما اجمع عليه اهل الحل و العقد فى اكثر بلاد الاسلام من الدخول فى طاعة امناء الدولة العلية المؤيدة الالهية.و قد صدر الامر الا قدس المطاع و واجب الاتباع باجماع العساكر المنصورة فى هذه الناحية لتنفيذ الغرمان و التنكيل على من يجلب لنفسه الهوان و يسلك منهج الخذلان و قد صدر الامر الارفع الا على ان نبدؤكم بالدعوة البالغة،و الرتغيب الى الدخول فى الطاعة،لهذا بثنا السادة الكرام،و نتيجة النجباء الفخام، عالى القدر السيد جواد الله لذلک الطرف،لتبليغ الاوامر المقررة،و هو الامين من طرفنا على العهد و الذمة،و لا يخفى ان شاء الله تعالى عهده، و لا يخالف ايعاده و وعده و انت من جملة المنسوبين لعالى جاء الوزير المكرم و الدستور المكرم المعظم احمد باشا،و مخير بين حالين:ان طالبتک نفسک من استظلت به كافة البرية،فلک عندنا ذلک و تشملک المراحم السلطانية و الشفاعة الخاقانية. و أن اردت الوصول الى مخدومک العالى جاه الوزير المشار اليه،مالک مانع،و بعهد الله عهد رسوله و عهد حضرة الشاهنشاه ظل الاله،ان ما ينالک ضرر من جميع المواد و لا يصيبک ما يسؤک لا قليل و لا كثير و بعد حصول الاطلاع بمضمون كتابنا هذا ترد لنا الجواب بما تختار لنفسک من احدى الحالين ان شاء الله تعالى نامر لک بها،و ان تختلف عن ما امرناک،و ارتكبت طريق الجهل و المعصية، و زين لک الشيطان حمية الجاهلية،فبحول الله تعالى و قوته حين ورودنا لتلک الولاية ننتقم منک حد الانتقام.و من الواجب فى الشريعة المطهرة الخيرية اكمال الحجة،و ايضاح المحجة ليهلک عن بينة،و يحيى من حى عن بينة.و لازم من رد الجواب على وجه السرعة،فان الاوامر السلطانية لاتؤخر،و ما امرها الا كلمح البصر.

**پاشكۆی ژماره ( ٦ )**

**دەقی نامەكەی قوچەخان شەیخانلو سەركردەی سوپای ئێران بۆ رۆستەم ئاغا بەرپرسی شاری بەسرە بەمەبەستی رادەستكردنی شارەكە بە سوپای ئێران**

**وەرگیراو لە :عماد عبدالسلام ، صمود البصرة ...،ص ص٢٩٣-٢٩٤**

